# فەرهەنگی مێژووی کورد

مایکڵ گەنتەر

وەرگێرانی: مامکاك

مایکڵ گەنتەر

# فەرهەنگی مێژووی کورد

وەرگێڕانی:

مامکاک

ناوی کتێب: فەرهەنگی مێژووی کورد
نووسینی: مایکڵ گەنتەر
وەرگێڕانی: مامکاک
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٨٠
نووسیاری: فەرهاد ئەکبەری
هەڵەگری: کاررزان کانەبی
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (١٤٠٠)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# بەرکوڵ

ئەم فەرهەنگە مێژووییەی کورد، بەزۆری سەربەند entry ـە مێژوویی و سیاسییەکانی لە خۆ گرتووە و پتر بایەخ بە بابەتەکانی ئێستا دەدا. لەگەڵ ئەمەشدا، هەوڵم داوە ناو و ڕووداوە هەرە گرینگەکانی پێشتریشی تێدا باس بکەم. جگە لەمەش هەندێ بابەتی کولتووری و ئابووری و کۆمەڵایەتیشم تێدا باس کردووە. بۆ ئەوەی یارمەتیی خوێنەریش بدەم، سەربەندەکانم ڕەشتر نووسیوەتەوە. بێگومان ناوهێنانی هەر بابەتێک ئامانجێکی بەدواوە بووە کە نەمتوانیوە خۆی لێ لادەم. هەندێ جاریش هەر بە شێوەیەکی سادە هەندێ لەو سەربەندانەم پشتگوێ خستووە کە شایان بوون باس بکرێن. هەر خوێنەرێکیش هەر سەربەندێکی هەیە و دەیەوێ باس بکرێ، ئامادەم لە چاپەکانی ئایندەی ئەم کتێبەدا دای بنێم.

لەمیانی نووسینی فەرهەنگێک دەربارەی کورد، بە زمانی ئینگلیزی؛ هەوڵم داوە ناوەکان هەر پیتگۆڕ transliteration بکەم. ئەگەر پشتم بەو هەموو شێوازە نووسینە جیاوازانە ببەستایە کە زاناکانی ئینگلیز و زمانەوانانی کورد لەو ناو نووسینانەدا پەیڕەویان کردووە، هەرگیز بۆم نەدەگونجا ئەم پیتگۆڕینە ئەنجام بدەم. جا لەبری ئەوە، منی نووسەر و خوێنەری ئینگلیز، ناوەکانم بەو شێوازە نووسینەوە کە بە دڵی خۆم بوون. لەگەڵ ئەمەشدا ئەوپەڕی ئاواتم ئەوە بووە کە خوێنەر بە ئاسانی تێ بگا و بزانێ باسی چ دەخوێنێتەوە.

هەندێ جار کوردەکان خۆیان و ئەوانەی کە دەربارەشیانەوە دەنووسن، بە گشتی زاراوەی کوردی بەکار دێنن، بەڵام جاری واش هەیە پەنا بۆ ئینگلیزیش دەبەن. کاتی واش هەیە کە پیتبەند acronym کوردییەکان بەتەواوی لەگەڵ ئینگلیزییەکان ڕێک دەکەون. بۆ نموونە؛ پارتی کرێکارانی کوردستان بە گشتی لە پیتبەندی کوردی وەک پیتبەندە ئینگلیزییەکەی بە «پ. ک. ک» دەنووسرێ و نموونەیەکی باشیش نیشانی خوێنەر دەدا. هەروا پارتی دیموکراتی کوردستان بە «پ. د. ک» و یەکێتیی

نیشتمانیی کوردستانیش به «ی. ن. ک» دەناسرێ و له ئینگلیزیشدا هەروا دەناسرێن و دەنووسرێنەوە. جا لەمیانی گەڕانم بە دوای ئەو پێتبەندانەی کە زۆر بە باوم زانیون، فره بایەخم بە لایەنی زمان نەداوە. هەر بۆیه ئەو زاراوانەم بەکار هێناوە کە خوێنەر ئاسانتر دەیانناسێتەوە. لەمیانی یەکەم جار بەکارهێنانی زۆربەی سەربەندەکانیشدا، هەردوو ناوە کوردی و ئینگلیزییەکەم بەکار هێناون.

گرفتەکەی ترم خۆی لە ڕۆژی بوون و مردنی زۆربەی کەسایەتییەکاندا دەنوێنێ. چونکه بارودۆخی کوردستان سەقامگیر نەبووە، بۆیە تەنانەت تا ئەمڕۆش زۆربەی کوردەکان ڕۆژی بوونیان نازانن کەینێیە. هەر لەبەرئەوەش بووە کە نەمتوانیوە کاتبەند dateی کەسایەتییەکان بنووسمەوە. کە باسی کەسایەتییە مێژووییەکانیش دەکەم، ئەم کێشەیەم لێ گەورەتر دەبێت. هێشتا لەگەڵ ئەمەشدا توانیومە کاتبەندی ژمارەیەک لەو کەسانە بدۆزمەوە و بە پێی توانای خۆم نووسیمنەوە. ئەنجامەکەشی نارێکییەکی لە خاڵە سەرەکییەکانی خۆمی لێ کەوتەوە و بەڵام هێشتا ئەوپەڕی زانیاریی پێویست دیار دەخەن. لێرەش خۆشحاڵیی خۆم نیشان دەدەم ئەگەر خوێنەران بیر و بۆچوونی خۆیانم بۆ بنێرن، بێگومان هەندێکیان سوودی زۆریان دەبێ و کەلێنی گەورەش پڕ دەکەنەوە.

لەمیانی نووسینەوەی ئەم فەرهەنگە مێژووییەدا، هەمیشە هەوڵم داوە، تا ئەوپەڕی توانام، بابەتیانە بم جا با لەمیانی سیاسیشدا ڕاست نەبووبم. ئەمەش وای کرد ئەو وڵاتانەی کە کوردیان تێدا دەژی گەلێ ڕەخنەی ئاشکرا و شاردراوەم لێ بگرن و پەلارم تێ بگرن، سەرباری ئەمەش کوردەکان بە خۆیانیش گەلێک ڕەخنەیان هەبووە. ئەگەر وام نەکردایە کارەکەم پاکژتر دەردەکەوت، بەڵام گەلێک بنەمای ئەو بابەتەی تێدا نەدەما کە من خەریکی نووسینەوەی بووم. جگە لەمانە هەموو، من دەربارەی بابەتێک دەنووسمەوە کە هەموو ئەو نووسینانەی پێشتر لەبارەیەوە نووسراونەتەوە، هەمیشە زۆر بە سۆز و خۆویستییەوە ئەنجام دراون. منیش وەک ڕۆژئاواییەک و ئەمەریکییەک، ئەم جۆرە بابەتی بوونەم ڕەنگە سوودی لە ڕاستکردنەوەی ئەو لەیەکتری نەگەیشتنەیەدا ببێ و لە لایەکی تریشەوە ڕەنگە زۆر بەدڵی ئەو کوردانە نەبێ کە فرە ئازاریان چێشتگە.

زۆر سـوودم لە برادەرایەتـی و شـارەزاییی ئەو زانـایانە وەرگـرتووە کـە دەربارەی کوردانیان نووسیوە و سوودم لە سەرکردەکانی کوردیش پێ گەیشتووە. زۆر قازانجم لە نووسینە بەهادارەکانی مارتن ڤان برونێسن و میهرداد ئیزەدی و دەیڤد مەکدۆویڵ و کـەسـانێکی تـریش کـردووە. زۆریش لـەو مـرۆیە چالاکـانەی وەک بەرهەم سـاڵح و نەجمەدین کەریم فێر بوویمە. پێویستە سوپاسێکی تایبەتی میهرداد ئیزەدییش بکەم، بۆ ئەو نەخشە درێژدادڕانەی پێشکێشی ئەم فەرهەنگە مێژووییەی کرد و بۆ ئەو هەموو تێبینییانەی کە دەربارەی زۆر خاڵ پێشکەشی کردم. لوقمان محۆش یارمەتیی دام و چەند کاتینەیەکی بۆ دیار خستم و هەندێ سەربەندیشی بۆ پێشنیاز کردم. هەر جۆرە ناتێگەیشتنێک، یان خراپ لێکدانەوەیەک یان هەر شێوە هەڵەیەک ئەگەر کەوتبێتە نێو ئەم کتێبەمەوە، تەنیا خۆم لێی بەرپرسیارم. دووبارە دەیڵێمەوە؛ بە هەر جۆرە پێشنیازێکی هەر خوێنەرێکیش شادمان دەبم ئەگەر بتوانم بە هۆیەوە لە چاپەکانی ئایندەدا، ڕاستکردنەوە لەم کتێبەدا بکەم.

***

منی وەرگێڕیش دەمەوێ دان بەو ڕاستییەدا بنێم کە ئەم کتێبەم دەقاودەق وەرنەگێڕاوە؛ چونکە:-

١- کتێبەکە تا کاتبەندی پێش ڕووخانی سەدام حوسێنی تێدایە و ئاگای لە ڕووداوی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ و دواتر نییە و من بە پێی ئەو سەرچاوە فەرمییانەی کە لە بەر دەستمدا هەبوون، پاشترەکەم بۆی تێهەڵکێش کردووە.

٢- لە هەندێ لە بابەتەکانی دیارە لە بن زمانییەوە فرە لایەنگری هەندێ سەرکردەی دژی کورد بووە و باسی بەهاداری بنەما دیموکراسییەکانی ئەو کەسایەتییانە دەکا. لە ڕاستیشدا، بۆچوونەکانی بە پێچەوانەی گەورەیی و ترسناکیی ئەو ڕووداوانەن کە بە فەرمانی ئەوانەی ستایشیان دەکا تووشی کورد هاتووە و منیش، بەڕاستی، نەمتوانی ستایشی هیچ کوردکوژێک بکەم و بە باوەڕی من مرۆڤکوژ هەر مرۆڤکوژە و ئەگەر کوردیشی کوشتبێ، ئەوە هێشتا خراپتر و هەرگیز نابێ ستایشی بکرێ و خۆم لە وەرگێڕانی ئەوان بەند و باڵۆران دزیوەتەوە.

# سەرەناو و کورتکراوەکان

AKIN تۆڕی زانیاریی کوردی – ئەمەریکی

AI لێبوردنی نێونەتەوەیی

AKP "عەدالەت ڤە کالکنمە پارتیسی" (پارتی داد و گەشەپێدان تورکیا)

ARGK ئەرتەشی ڕزگاریی گەلی کوردستان

CIA ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی

DDKD "دەڤریمچی دیموکراتیک کولتوور دەرنەکلەری" (کۆمەڵەی کولتووریی دیموکراتی شۆڕشگێڕ)

DDKD "دەڤریمچی دۆغو کولتوور ئوجاغلەری" (ماڵی کولتووریی شۆڕشگێڕی خۆرهەلات)

DEP "دیموکراسی پارتیسی" (پارتی دیموکراتی)

DEHAP "دیموکراتیک هەلکن پارتیسی" (پارتی گەلی دێمۆکرات)

DISK "دەڤریمچی ئیسجی سەندیکەلاری کۆنفیدراسیۆنو" (کۆنفیدراسیۆنی یەکێتییەکانی کرێکارە شۆڕشگێڕەکان تورکیا)

DKP "دیموکراتیک کیتلە پارتیسی" (پارتی کوتلەی دیموکرات)

ECHR دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپی

ERNK ئەنییا ڕزگارییا نەتەوییا کوردستان (بەرەی ڕزگاریی نەتەوەیی کوردستان)

EU یەکێتیی ئەورووپا

GAP "گونەیدۆغو ئەنادۆلو پرۆژەسی" (پرۆژەی باشووری خۆرهەلاتی ئەنادۆڵ)

HADEP "هەلکن دیموکراسی پارتیسی" (پارتی دیموکراتی گەل)

HEP "هەلکن ئەمەک پارتیسی" (پارتی پاڵەی گەل)

HRK هێزێن ڕزگارییا کوردستانێ (هێزی ڕزگاریی کوردستان)

ICP حزبی شیوعیی عێراقی

IKF بەرەی کوردستانی عێراقی

IMK بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان

INC کونگرەی نیشتمانیی عێراقی

JITEM دەزگای موخابەراتی جەندرمە و دژە تیرۆر (تورکیا)

KADEK کۆنگرەی ئازادی و دیموکراسی کوردستان

KDP پارتی دیموکراتی کوردستان (عێراق)

KDPI حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران

KDPT پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا

KHRP پرۆژەی مافەکانی مرۆڤی کورد (بەریتانیای مەزن)

KNC کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان – ئەمەریکای باکور

KNK کۆنگرا نەتەوییا کوردستانێ

KPDP پارتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان

KRG حکوومەتی هەرێمی کوردستان

KUK کوردستان ئولوسال کولتووروسجولاری (رزگاریخوازانی نەتەوەییی کوردستان)

MGK میللی گوڤەنلیک کورولو (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا)

MIT میللی ئیستیخبارات تەسهیلاتی (دەزگای ئیستیخباراتی نەتەوەییی تورکیا)

NATO رێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی

OHAL یاسای ئیمێرژنسی (تورکیا)

ONW ئۆپەراسیۆنی چاودێری باکور

OPC ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن (پرۆڤاید کۆمفورت)

OSCE دەزگای ئاسایش و هاریکاری لە ئەورووپا

PASOK پارتی سۆشیالیستی کوردستان (عێراق)

PKDW پەرلەمانێ کوردستانێ ل دەرڤەی وەلات

PKK پارتییا کارکەرێن کوردستان

PPKK پارتییا کارکەرێن پێشەنگا کوردستان

PSK پارتی سۆشیالیستی کوردستان (تورکیا)

PUK یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

TIKKO تورکیا ئیسجی کۆیلو کورتولوس ئۆردوسو (سوپای ئازادیی کرێکاران و جووتیارانی کوردستان)

TOBB ژووری بازرگانی و ئاڵوگۆڕی پێداویستییەکان (تورکیا)

UN نەتەوە یەکگرتووەکان

WKI ئینستیوی کوردی واشنتن

# مێژووبەند Chronology

٤٠١ پ. ز. کاردۆخییەکان تەنگژەیان خستە ناو ئەو گریکانەی کە پاشەکشەیان دەکرد، زێنەفۆن لە ئاناباسیس تۆماری کردووە (بۆ زانیاریی تەواو، کتێبی دەهەزارەکە بخوێنەوە) . ناوەڕاستی سەدەی حەفتەمین د.ز.کورد دەکرێنە ئیسلام. سەلاحەدین (ناودارترین کوردە) شەڕ دژی خاچوەران دەکا و دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر و سووریا دادەمەزرێنێ.

١٥١٤ لە ئەنجامی شەڕی چاڵدیران، کوردستان دەبێتە سنووری نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی.

١٥٤٣- ١٦٠٣ شەرەفخانی بەتلیسی دانەری شەرەفنامەی مێژووی کوردە.

١٦٣٩ پەیماننامەی زەهاو لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی مۆر دەکرێ و سنووریان بە فەرمی دەناسێن.

درەنگی سەدەی ١٧مین ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٦) داستانی نەتەوەیی کورد، مەم و زین دەنووسێتەوە.

١٨١١ مەولانا خالید تەریقەتی نەقشبەندی لەوەی کە ئێستا پێی یێژن کوردستانی عێراق، دادەهێنێ.

١٨٤٠ـەکان بارزانییەکان لە بارزان خۆیان دادەمەزرێن.

١٨٤٧ بەدرخان بەگی فەرمانڕەوای ئیمارەتە کوردییە نیمچە سەربەخۆییەکە خۆی، بەدەست عوسمانییەکانەوە دەدا .

١٨٨٠ دەست پێکردنی شۆڕشە سەرنەکەوتووەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری.

١٨٩١ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی سوڵتانی عوسمانی، سوارانی حەمیدییە لە کورد پێک دێنێ.

١٩١٤- ١٩١٨ لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانی، کورد یارمەتیی عوسمانییەکان دەدەن.

١٩١٦ ڕێککەوتنەکەی سایکس- پیکۆ خۆرهەڵاتی ناڤین بە کوردستانیشەوە دابەش دەکات.

١٩١٨ سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان ودرۆ وڵسن چواردە خاڵەکەی جاڕ دەدا. بەریتانیا عێراق دادەڕێژێ؛ شێخ مەحموود لە عێراق دە ساڵ شۆڕش دەکا و سەرناکەوێ.

١٩١٩- ٢٢ سمایل ئاغای سمکۆ، شۆڕشێکی گەورە لە ئێران بەرپا دەکا.

کورد پشتیوانی لە شۆڕشی سەربەخۆبوونی تورک دەکەن.

١٩٢٠ـەکان کوردستانی سوور "لاچین" لە یەکێتیی سۆڤیەت دادەمەزرێ.

١٩٢٠ پەیمانی بەمردوویی بووی سیڤەر ئەگەری سەربەخۆیی کورد دەڕەخسێنێ.

١٩٢٣ پەیمانی خنکێنەری لۆزان باسی کوردی تێدا نەکرا.

١٩٢٥ تورکیا شۆڕشی شێخ سەعید سەرکوت دەکا. "تورکەکانی شاخ" (کورد) سەرکوت دەکرێن.

١٩٢٧ ئۆکتۆبەر: خۆیبوون وەک پارتێکی سەرتاسەریی کوردی دادەمەزرێ.

١٩٣٠ تورکیا شۆڕشی کورد لە ئارارات تەفروتونا دەکا.

مەلا مستەفا بارزانی (١٩٠٣- ١٩٧٩) وەک سەرکردەیەکی لێهاتووی سەدەی بیستەمی کورد، لە عێراق پەیدا دەبێ. تەمموز: سەرکردەی کوردی ئێرانی، سمایل ئاغای سمکۆ بە دەستی ئێرانییەکان دەکوژرێ.

١٩٣٦- ٣٨ تورکیا شۆڕشی کورد لە دەرسیم (تونجەلی) لەناو دەبا.

١٩٣٦پەیمانی سەعد ئاباد هەوڵی دەست بەسەرکردنی کورد دەدا.

١٩٤٦ کۆماری کوردستان لە ئێران دادەمەزرێ. ١٦ی تەباخ: پارتی دیموکراتی کوردستان (عێراق) پێک دەهێندرێ.

١٩٤٧- ٣١ی ئادار: قازی محەمەد لە لایەن ئێرانەوە لە سێدارە دەدرێ.

١٩٤٧- ٥٨ مەلامستەفا بارزانی لە بانشگە لە یەکێتیی سۆڤیەتدا دەمێنێتەوە.

١٩٥٥پەیمانی بەغدا پێک دێ، بەشێکی هۆی پێکهاتنەکەی بۆ ئەوە بوو تا کورد بندەست بکا.

١٩٥٨ ئۆكتۆبەر: مەلامستەفا بارزانی بۆ عێراق دەگەڕێتەوە.

سێپتەمبەر: شەڕ لە نێوان ئەو کوردانەی کە لە عێراق بارزانی سەرکردایەتییان دەکا، لەگەڵ حکوومەتی عێراق دەستی پێ کرد.

ناوەندی ١٩٦٠ـەکان شەڕ لە نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان دەقەومێ.

١٩٧٠ بەیانی ئادار بە شێوەیەکی تیۆری پەیمانی ئۆتۆنۆمیی بە کورد دەدا.

١٩٧٤ شەڕ لە نێوان کورد و حکوومەتی عێراقی دەست پێ دەکاتەوە.

١٩٧٥ ئادار: ڕێککەوتنەکەی جەزایر لە نێوان عێراق و ئێران کۆتایی بەو پشتیوانییە دێنێ کە ئێران پێشکێشی کوردی دەکرد. بۆ دوا جار مەلا مستەفا بارزانی لە مەیدان دەردەکرێ و کوڕەکەی، مەسعوود بارزانی (١٩٤٦–      ) لە کۆتاییدا جێی دەگرێتەوە.

١٩٧٥ – ١ی حوزەیران: جەلال تالەبانی (١٩٣٣–      ) یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ی.ن.ک (عێراق) پێکدێنێ.

١٩٧٨ – ٢٧ی نۆڤێمبەر: عەبدوڵڵا ئۆجەلان (ئاپۆ)، پارتی کرێکارانی کوردستان پ. ک. ک. لە تورکیا دادەمەزرێنێ.

١٩٧٩ یەنایر: شا لە ئێران دەردەکەوێ؛ ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی، دەسەڵات وەردەگرێ. ١٦ی گەلاوێژ: سەدام حوسێن دەبێتە سەرۆکی عێراق.

١٩٨٠ ١٢ی سێپتەمبەر: کودەتایەکی سەربازی لە تورکیادا دەکرێ، پاشتر پەلاماری کورد دەدرێ.

١٩٨٠– ٨٨ شەڕی ئێران–عێراق لە هەردوو لادا کوردی تێوەدەگلێ.

١٩٨٢ نۆڤەمبەر: دەستووری ئێستای تورکیا گەلێک بەندی تێدا دەسەپێ، بۆ ئەوەی کورد سەرکوت بکا.

١٩٨٤ – ١٥ی تەباخ: یاخیبوونی چەکدارانەی «پ. ک. ک» دەست پێ دەکا.

١٩٨٥ ئادار: «پ. ک. ک» بەرەی ئازادیی نیشتمانیی کوردستان پێک دێنێ. نیسان: پاسەوانانی گوند لە تورکیا دادەمەزرێ.

١٩٨٦ ئۆکتۆبەر: «پ. ک. ک» سوپای ئازادیی گەلی کوردستان دادەمەزرێنێ.

١٩٨٧ هاوین: باری نائاسایی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕادەگەیەندرێ.

١٩٨٧– ٨٨ شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ قڕکردن و جێنۆسایدی کورد دەست پێ دەکا.

١٩٨٨ – ١٦ی ئادار: عێراق بە چەکی کیمیایی پەلاماری هەڵەبجە دەدا. ئایار: بەرەی کوردستانی عێراق دادەمەزرێ.

١٩٨٩ – ١٣ پووشپەڕی: سەرکردەی کوردی ئێرانی، عەبدولڕەحمان قاسملوو، دەکوژرێ.

١٩٩٠ حوزەیران: پارتی کاری گەل (هەپ) لە تورکیا بە شێوەی یاسایی دادەمەزرێ.

١٩٩١ شەڕی کەنداو، ڕاپەڕینی کوردی عێراق، کۆڕەوی پەنابەرانی کورد. وڵاتە یەکگرتووەکانی دەست بەئۆپەراسیۆنی ئاسوودە بەخش دەکا، ناوچەی ئارام، ناوچەی دژە فڕین، ئەمانە هەموو دەبنە هۆ تا دەوڵەتێکی دیفاکتۆی کوردی لە باکوری عێراق دروست ببێ. بڕیاری ٦٨٨ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرکۆنەی سەرکوتکردنی کوردی عێراقێ دەکا. یاسای دژە تیرۆریزم (تورکیا)، هەموو جۆرە لێدوانێکی ئاشتییانە لە باسی مافەکانی کورد بە تاوان دەناسێ. نۆڤەمبەر: سولەیمان دیمیرێل دەبێتە سەرۆک وەزیرانی تورکیاو دان بە "ڕاستیی کورد" دادەنێ.

١٩٩٢ – ١٩ی ئایار: هەڵبژاردن لە کوردستانی عێراقدا کرا. حوزەیران–گەلاوێژ: حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە کوردستانی عێراق پێک هات. ٢٧ی ئۆکتۆبەر: کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی، بەرهەڵستکار پێک دێ.

١٩٩٣ یادار– ئایار: پ. ک. ک. ئاگربەستی یەکلایەنە لە تورکیا ڕادەگەیەنێ. ١٧ی نیسان: تورگۆت ئۆزاڵی سەرکۆماری تورکیا کتوپڕ لە ئۆفیسەکەی خۆیدا دەمرێ. ئایار: سولەیمان دیمیرێل دەبێتە سەرکۆماری تورکیا. حوزەیران: پارتی کاری گەل (هەپ) لە تورکیا قەدەغە دەکرێ. پارتی دیموکراسی (دەپ) لە شوێنی ئەودا دروست دەبێ. دیسەمبەر: شەڕ لە نێوان ی. ن. ک. و ئیسلامییەکان لە کوردستان دەقەومێ.

١٩٩٤ ئادار: دەپ قەدەغە دەکرێ و لەیلا زانا زیندانی دەبێ. پارتی دیموکراتی گەل (هادەپ) لە تورکیا شوێنی دەگرێتەوە.

١٩٩٤– ٩٨ شەڕی ناوەخۆی نێوان «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بەردەوام دەبێ.

١٩٩٥ ئادار: کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی لە کۆششکردنی ئەنجامدانی کودەتایەک لە عێراق، لە دوای ئەوەی سی.ئای. ئەی. پشتیوانیی خۆی لێ ڕاگرت، هەرەس دێنێ. ١٢ی نیسان: پەرلەمانی کوردستان لە بانشگە دادەمەزرێ. ١٤ی نیسان: ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە پێی بڕیاری ٩٨٦ بەرنامەی خۆراک بە نەوت دەست پێ دەکا و بە پێی ئەم بڕیارە عێراق دەتوانێ بڕێک نەفت بفرۆشێ. کوردە عێراقییەکان ١٣٪ داهاتەکە وەردەگرن. ئایار: مەد تیڤی پەخشی خۆی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەست پێ دەکا. ئاب: ڕاپۆرتی ژووری بازرگانی و ئاڵوگۆڕی پێداویستییەکان دەرباری «پ. ک. ک» و کورد لە تورکیا بڵاو دەبێتەوە. لە کوردستانی عێراق، «پ. ک. ک» پەلاماری ک.د.پ. دەدا.

١٩٩٦ ٣١ی ئاب: لەشکرەکانی سەدام، بۆ پشتیوانیکردنی «پ. د. ک» لە شەڕی دژی «ی. ن. ک» بۆ ناو خاکی کوردستان دێن.

١٩٩٧ ١ی یەنایر: بۆ سەپاندنی ناوچەی دژە فڕین لە ئاسمانی کوردستان عێراقێ، ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکور لە دوای ئۆپەراسیۆنی ئاسوودەبەخش دەست پێ دەکا.

١٩٩٨ ٢٠ شوبات: بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە ١١٥٣ بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر ڕێگەی فرۆشتنی نەفتی عێراق دەدا. ١٧ی سێپتەمبەر: پەیمانی واشنتن شەڕی ناوەخۆی نێوان ک.د.پ. و «ی. ن. ک» ڕادەوەستێنێ. ئۆکتۆبەر: سووریا ئۆجەلان دەردەکا.

١٩٩٨–٩٩ لە ئەوروپا، ئۆجەلان بەدوای پەناگەدا دەگەڕێ.

١٩٩٩ ١٦ی شوبات: تورکیا ئۆجەلان لە کینیادا دەگرێ و بۆ تورکیای دێنێتەوە. ئۆجەلان داوای دیموکراسی لە تورکیا و کۆتاییهێنانی خەباتی چەکدارانە دەکا. ئایار: کۆنگرەی نەتەوەیی کورد جێی پەرلەمانی کوردستان لە بانشگەدا

دەگـرێتـەوە. ٢٩ی حـوزەیران: تورکـیـا بـە تاوانی خـیـانەتکاری، ئەمـری لە سێدارەدانی ئۆجەلان دەردەکا. تەمموز: مـیدیا تیڤی، لە شـوێنی مـەد تیڤی دەکەوێتە کار. سێپتـمبـەر: ئۆجەلان بانگەوازی کۆتایی پێ هێنانی خـەباتی چەکـدارانـەی «پ. ک. ک» تازە دەکـاتـەوە و داواش لە «پ. ک. ک» دەکـا تـا چەکدارەکانی لە تورکیا بکشێنێتەوە. دیسمبەر: یەکێتیی ئەوروپا تورکیا بۆ بوونە ئەندامی یەکـێـتـیـیـەکـە هەڵدەبژێرێ؛ جـێـبـەجـێکردنی فـەرمـانی لە سێدارەدانی ئۆجەلان هەڵدەپەسێردرێ.

٢٠٠٠ ئایار: ریفـۆرمـخـواز ئەحـمـەد نەجدەت سیزەر بـە سـەرۆک کـۆماریی تـورکـیـا هەڵدەبژێردرێ. سێپـتـمبـەر و دیسێمـبـەر: لە کوردسـتـانی عێراق، «ی. ن. ک» لەگەڵ «پ. ک. ک» بە شەڕ دێ.

٢٠٠١ ١٨ شـوبات: ئیـسـلامـیـیـە توندڕۆیەکان لە کوردسـتـانی عێراق، فـەڕەنسۆ هەریری، سـەرکردەی کریستـیـانی «پ. د. ک»، تیرۆر دەکەن. سـێپـتـێمبـەر: شەڕی قورس لە نێوان «ی. ن. ک» و جوندولئیسلام بەرپا دەبێ.

٢٠٠٢ شـــوبـات: «پ. ک. ک» ناوی خـــۆی دەگـــۆڕێ و دەیکاتە کـــۆنگرەی ئازادی و دیموکراسیی کـوردسـتـان (کـادیک). ئاب: پەرلەمـانی تورکیا یاسـایەک دەرباز دەکا کـە سزای لـە سـێـدارەدان ناهێلێ و ڕێگەی پەروەدە و پەخـشی کـوردی دەدا بۆ ئەوەی لەگەڵ بنەمـا سـەرەکـییەکانی چوونە نێو یەکێتیی ئەوروپا خۆی بگونجـێنـێ. بەڵام جـێـبـەجـێکردنی ئەم چاکسـازییـانە هێـشـتـا نەسـەلماوە. ئۆکتۆبەر: فەرمانی لە سێدارەدانی ئۆجەلان کەم دەکرێتەوە و دەبێتە زیندانی ژیان life sentence. پەرلەمانی یەکگرتووی هەرێمی کوردستـان کۆ دەبێتەوە و دووبارە جەخت لەسـەر سیستەمی فیدرالی بۆ کوردستانی عێراق لە عێراقی دوای سەدام، دەکاتەوە. ٣ی نۆڤێمبەر: پارتی ئیسلامیی نەرمڕۆ (پارتی دادو گەشەپێدان) سەرکەوتنێکی گەورە لە هـەڵبژاردنەکانی تورکیادا وەدەست دێنێ و حکوومـەتێکی زۆرینە پێک دێنێ. دیسـێمـبـەر: تورکـیـا یاسـای نائاسـایی لەسەر دووەمین دوا ویلایەت هەڵدەگرێ کە تا ئێستـا هـەر لەسەریان بوو. ١٤- ١٧ی دیسـێـمـبـەر: لە نـێـو مـشـتـومـڕ و هـەڕەشـەی وڵاتە یەکگرتووەکـان بۆ

داگیرکردنی عێراق و جاڕدانی ئەوەی کە عێراقی دوای سەدام دەبێتە عێراقێکی دیموکراتی، پەرلەمانی، فیدرالی، کۆنفرانسێکی گەورەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لە لەندەن ڕێک خرا.

٢٠٠٣ شوبات: کوردەکانی عێراق ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێ کە تورکیا، لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان ڕێک دەکەوێ و لەمیانی شەڕی دژی عێراق، کوردستانی عێراق داگیر دەکا. ئادار: دادگای دەستووریی تورکیا (هادەپ)ی لایەنگری کورد، قەدەغە دەکا. ١٩ی ئادار: وڵاتە یەکگرتووەکان پەلاماری عێراق دەدا.

# پێناسین

هەرچەندە لەو ناوچە شاخاوییانەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین کە تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا وێک دەگەن، کورد زۆرینەنە، بەڵام بە شێوەیەک کەرت کراون کە لە ناو قەوارەی هەر یەک لەم دەوڵەتانەی ئێستا هەن، بووینە کەمینە. لەوەتێ ئەم ڕۆژهەڵاتە ناڤینە هاوچەرخەی ئێستا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا پێک هاتووە؛ کێشەی کورد دروست بووە و زۆرینەی کوردیش هەمیشە ئارەزووی بووە دەوڵەتێک بۆ خۆی پێک بێنێ یان لانی کەم، مافە کولتوورییەکانی خۆی لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەدا مسۆگەر بکا کە تێیاندا دەژی. ئەو ئارەزووەشی زنجیرە شۆڕشێکی مەیلەو نەپساوەی ئەو گەلەی هێناوەتە کایەوە.

ئەو ٢٥-٢٨ ملیۆن کوردە، مەزنترین نەتەوەیە لەم جیهانەدا کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی نییە. لە دوای کۆتاییهاتنی شەڕی کەنداوی ١٩٩١ و دروستبوونی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردستان لە باکوری عێراق، کێشەی کورد بە شێوەیەکی دیار نەک هەر بووەتە گرفتی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بەڵکو لە ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتیش سەنگی خۆی پەیدا کردووە. کۆششی تورکیا بۆ چوونە نێو یەکێتیی ئەورووپا بواری پتری بۆ کێشەی کورد ڕەخساند و باشتر وەبەر چاوانی خست. هەر کاتێک کێشەی عەرب- ئیسرائیل خاو ببێتەوە، بێگومان کێشەی کورد خۆی لە جێی ئەو دادەنێ و لەو ناوچە جیۆستراتیژەی ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، دەبێتە گەورەترین فاکتەری نائارامی. هێشتا لەمەش پتر لە ڕێیە؛ چونکە کورد لەسەر گەنجینەیەکی هەرە گەورەی نەفتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین دانیشتوونە و گەورەترین سەرچاوەکانی ئاویان لە بەردەست دایە، بۆیە لەم سەدە تازەیەدا، کێشەی کورد هێشتا گرینگتر دەبێ.

# خاک و گەل

## جیۆگرافیا

کوردستان، واتە خاکی کوردان، ئەو ڕووبەرە جیۆگرافیایەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین پێک دێنێ کە تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا بە یەکتری دەگەن و زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردی ڕەگەز ڕەسەنن. لە هەندێ قانی تری وەک خۆرەسانی ڕۆژهەڵاتی قەزوین لە ئێران و لە ناوەڕاستی ئەنادۆڵی تورکیاشدا کورد هەنە. ژمارەیەکی زۆری کورد لە هەر سێ شارە گەورەکانی ئەستەمبۆڵ و ئانکاراو ئیزمیری تورکیاشدا دەژین. جگە لەمانە، کورد لە ئەرمینیا و ئازەربایجان و بەدرێژاییی سنووری خۆراسانی ئێران و تورکمانستان، لە تورکمانستانیشدا دەژین.

بە هۆی گۆڕانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی لەمیانی چەند سەدەی ڕابردوودا، ڕووبەری کوردستان بە شێوەیەکی بەرچاو هەمیشە هەر لە گۆڕاندا بووە. هەرچەندە چەند میرنشینێکی کوردیی نیمچە سەربەخۆی وەک میرنشینی ئەردەلان تا ناوەڕاستی سەدەی ١٩ـەم هەبووە، بەڵام دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆ لە شێوەی ئەم دەوڵەتە هاوچەرخانەی ئێستا هەرگیز نەبووە. بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان، کوردستان لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسیدا بووبووە دوو بەش و ڕووبەرە زۆرەکەی لە بەردەستی عوسمانییەکان بوو. لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی، کوردستان بەسەر پێنج دەوڵەتی جیاوازدا دابەش کرا. هەرچەندە هەر بە شێوەیەکی نزیکێنەیە، بەڵام دەگوترێ تورکیا گەورەترین بەشی کوردستان ( ٤٣ لە سەد) و دوای ئەو ئێران (٣١ لە سەد) و عێراق ( ٨ لە سەد) و سووریا ( ٦ لە سەد) و یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو (ئەرمینیا و ئازەربایجانی ئێستا ٢ لەسەد)یان بەرکەوتووە.

چیاکان دیارترین تایبەتمەندیی جێۆگرافیی خاکی کوردستانن؛ هەر بۆیە کورد پەندێکیان هەیە دەڵێ: "لە شاخ بترازێ، کەس دۆستی کورد نەبووە." ئەم پەندە ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچەندە ئەو چیایانە بوونەتە هۆی لەیەکتری دوورخستنەوەی کورد، بەلاّم لە هەمان کاتیشدا ناسنامەی مێژوویی و کولتووریی کوردیان دروست کردووە و تا ئێستاش پاراستوویانە و نەیان هێشتووە تورک لە باکورەوەڕاو فارسەکان لە ڕۆژهەلاّتەوەڕاو عەرەبیش لە باشوور و خۆرئاوایانەوەڕا بەتەواوەتی داگیریان بکەن یان هەر بیانتاوێننەوە. زنجیرەی زاگرۆس گرینگترینی ئەو شاخانەن؛ کە لە شێوەی بڕبڕەی پشتە و لە باکوری ڕۆژئاواوەڕا بەرەو باشووری ڕۆژهەلاّت بەناو زۆربەی ئەو خاکەدا، دادەکشێ. بەشێکی زنجیرە چیاکانی تۆرۆس و پۆنتۆس و ئامانۆسیش لە ناو خاکی کوردستانەوەڕا هەڵدەستێ.

## کەشناسی

کەشی ئەم کێوانە وا ناسراوە کە ساڵ دوازدە مانگ سازگارە. چونکە ڕێژەی شاخەکانی باکوری کوردستان لە ناوەڕاست و باشووری بەرزترە، بۆیە بەم پێیە باکوری سارد و تا بەرەو باشوور بچین کەشەکەی گەرمتر دەبێ و هەندێ جاران شێدار دەبێ. پلەی گەرمای کورستان بەپێی بەرزی و نزمیی خاکەکەی، جیاوازییەکی زۆری تێدا بەدی دەکرێ. هەرچەندە شاخە بەرزەکانی لە هاوین کەشێکی سازگاریان هەیە، بەلاّم دامێنەکانیان گەرم و شێدارە. زۆربەی ناوچەکانی بەزستانان ساردە و بەفری لێ دەکەوێ.

جاران هەموو بە دارستان داپۆشرابوو، بەلاّم ئێستا لەبەر زۆری بەکارهێنانی بۆ لەوەڕو سووتەمەنی و ئاوەدانکردنەوە، پتریش لە ئەنجامی شەڕدا، زۆر لەو دارستانانە فەوتاون و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی جیاوازیی نێوان کەشوهەوای ناوچەکان پتر ببێ. بە پێچەوانەی زۆربەی ناوچەکانی تری ڕۆژهەلاّتی ناڤین، کوردستان هەمیشە ڕێژەیەکی چاکی باران لێ دەبارێ.

## دانیشتوان

کورد زۆربەیان موسڵمانی سوننەن و ڕێبازی سوننە پەیڕەو دەکەن و بە زمانێکی هیندۆ-ئەورووپی دەئاخێڤن. بەمجۆرە زۆر لە تورک و لە عەرەبان جیاوازن، بەڵام پێوەندییان بە ئێرانییانەوە هەیە و لە ئاهەنگی نەورۆزی دەستپێکی بەهاردا، وێکڕا ئاهەنگ دەکەن. ژمارەیەکی پوختی سەرژمێری کورد نییە؛ چونکە زۆربەی کوردەکان ژمارەی خۆیان زۆرتر دەکەن، کەچی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان تێدا دەژی، لەبەر هۆکاری سیاسی، هەمیشە ژمارەیان کەم دەکەنەوە. جگە لەمە، ژمارەیەکی بەرچاوی کورد دەناو کۆمەڵەگەورەترەکانی عەرەب و تورک و فارس کە دەوریان دەدەن، تواونەتەوە. لەمەش بترازێ، مشتومڕی زۆر لەسەر ئەوە هەیە، ئایا لوڕ و بەختیاری و هەندێکی دیکەی وەک ئەوان کوردن یان نا. لێرەش دەردەکەوێ کە تەنانەت ڕێککەوتنێکی تەواو نییە لەسەر ئەوەی ئایا کێ کوردە و کێ کورد نییە.

هێشتا خەملاندنێکی گونجاو هەیە دەڵێ کە لە نێوان ١٢ تا ١٥ ملیۆن کورد لە تورکیادا هەیە (کە دەکاتە ١٨ تا ٢٣ لە سەدی دانیشتوانەکەی) لە ئێرانیش ٦و٥ ملیۆن کورد دەژی (دەکاتە ١١ لە سەد)و لە ٣و٥ تا ٤ ملیۆنیش لە عێراقیدا دەژین (ئەمەش دەکاتە ١٧ تا ٢٠ لە سەد)و ١ ملیۆنیش لە سووریادا هەیە (ئەمەش ٩ لەسەد دەکا). (مێهرداد ئیزدی بە سوپاسەوە نەخشەیەکی پێشکێش کردم بۆ ئەوەی لەم کتێبەدا بەکاری بێنم، ئەو لەم نەخشەیەدا ژمارەکە تۆزێک بەرزتر دەکاتەوە.) بەلای کەمیش ٢٠٠,٠٠٠ کورد لە هەندێ بەشی سۆڤیەتی پێشوودا دەژین (هەندێک دەڵێن نزیکەی ١ ملیۆن لەوێدا دەژین، بەڵام بەزۆری لە ناو ئەو کۆمەڵانەدا تاواینەوە)و لەم دەمانەشدا کوردەکانی تاراوگە لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا، ژمارەیان لە ١ ملیۆن تێ پەڕیوە. لە نیوەی زیاتری ئەم ئاوارانە لە جەرمەنستان جێگیرن. نزیکەی ٢٠,٠٠٠ کورد لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەژین. (دەبێ لەبیر نەکەین کە ئەم ژمارانە هەموو هەر بە خەملاندنن و هیچیان سەرژمێرییەکی دیمۆگرافییان بۆ نەکراوە.) لە کۆتاییدا دەبێ لە بیریش نەکەین کە ژمارەیەکی لە ڕادەبەدەری کەمینەش لە کوردستاندا دەژین. ئەرمەنی و ئاشووری و تورکمان و تورک و عەرەب و ئێرانیشیان لەناودا هەنە.

کوردەکان بەخۆشیان لەمیانی جیۆگرافی و سیاسی و زمانەوانی و خێڵەکی و ئایدیۆلۆژییەوە زۆر بەسەختی دابەش بووینە. وەک پێشتر بینیمان ئەو شاخە سەرکەشانەیان فرە لە یەکتری دوور خستوونەتەوە. ڕەچەڵەکی ڕاستەقینەیان هەرچییەک بێ، بە ڕاشکاوی دیارە کە کوردەکانی ئەمڕۆ بە ڕەگەز لە چەند گرووپێکی ئاوێتە پەیدا بووینە و ئەمەش لە ئەنجامی داگیرکاری و کۆچکردنی مێژووییەوە وایان لێ هاتووە.

زمانی کوردییش (کە پێوەندیی بە زمانی ئێرانییەوە هەیە) دوو شێوەزاری جیاوازی هەیە: کرمانجی (یان بادینی) کە بە چڕی لە باکوری خۆرئاوای کوردستان بەکار دێ (تورکیا و ناوچەی بادینان یان بارزانی کوردستانی عێراق) و سۆرانی ، بە گشتی لە باشووری کوردستان قسەی پێ دەکرێ. جگە لەمانە دیملی (زازا) لە هەندێ بەشی کوردستانی تورکیادا بەکار دێت، کەچی گۆران لە هەندێ بەشی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێرانیشدا هەن. لە کۆتاییشدا باشە بڵێین کە هەر یەک لە چوار شێوەزارە سەرەکییانە، چەندەها مەیلەو شێوەزاریSub- dialects تریان هەنە. ئەم دایەلێکتانە وایان کردووە کە کورد بە چاکی لە یەکتری نەگەن و ئەمەش کوردەواری پتر بەشبەش دەکا.

خێڵەکایەتیش tribalism نەیهێشتووە کورد یەک بگرێ. لە ڕاستیدا، ڕەنگە کورد بۆ خێڵەکانیان دڵسۆزترین لەوەی کە بۆ نەتەوەی کورد دڵسۆزن. لەمیانی هەموو ئەو شۆڕشانەی لە سەدەی بیستەمیندا کران، ژمارەیەکی دیاری کوردان پشتیوانیی حکوومەتیان کردووە، چونکە ڕقیان لە شۆڕشەکان بووەتەوە. لە عێراق، ئەو کوردانەی لایەنگریی حکوومەتیان دەکرد پێیان دەگوترا جاش (واتە بێچووی کەر)، لە تورکیاش حکوومەت لەو سالانەی دواییدا میلیشیایەکی لایەنگری دەوڵەتی دروست کردووە و ناوی ناون پاسەوانانی گوند. لێرەش، هەر بە هەمان شێوە ئاغە (خاوەن زەوی و سەرۆک تیرەکان)و شێخەکان (سەرکردە ئاینییەکان) بەردەوام تەگەرە دەخەنە پێش هەر پێشکەوتنێکی هاوچەرخ و ناهێڵن هەستی نەتەوەپەرستی پەرەبستێنێ.

## ئابووری

هەرچەندە لەپێشدا کوردەکان هەموو ڕەوەندبوون، بەڵام ئێستا زۆر کەمیان بەو شێوەیە دەژین. زۆربەی کوردان ئێستا بەکشتوکاڵەوە خەریکن و ئاژەڵ بەخودان دەکەن. گەنمە شامی، جۆ، برنج، لۆکە و چەوەندەری شەکر لەو بەرهەمە گرانبەهایانەن کە دەیانچێنن. جگە لەمە، باشترین جۆری تووتن کە لە تورکیا و لە عێراقدا هەبێ، لە کوردستان دەڕوێ. ئاژەڵی ماڵی (بزن و مەڕ و چێڵ و گامیش) لە پێشدا و ئێستاش ئاژەڵی سەرەکین کە کورد بەخێویان دەکەن. بەهۆی ئەم شەڕانەی ئەم دواییانەش، زۆرینەی کورد ئێستا هاتوونەو لە شارەکاندا دەژین.

بەهۆی ئەو سەرچاوە ئاوە زۆرەی (لە بەشەکانی ناو تورکیاو عێراق)و ئەو هەموو نەفتەی (لە بەشی عێراقدا) هەیتی، کوردستان ئابوورییەکی زەنگین و گرینگایەتییەکی جیۆستراتیژیی تایبەتی هەیە. هەرچەندە بەبەراورد لەگەڵ شوێنەکانی تری تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا کە کورد تێیاندا ناژی، کوردستان گەشەی نەکردووە، بەڵام هێشتا لە سەدەی بیستەمدا، کوردستان گەشەکردنێکی یەکجار گەورەی لە بوارەکانی ئابووری و سیاسی و بە هاوچەرخکردنی کۆمەڵگەی لێ هاتووەتە کایەوە. لە دەیەی نەوەدا، بە هۆی بەرنامەی نەوت بە خۆراک کوردستان لەمیانی پرۆگرامەکە و لە ڕێگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پارەی بۆ هات ئەمەش وای کرد کە ئابووریی کوردستانی عێراقیش لە هەموو ئابووریی عێراق پتر گەشە بکات. هەرچەندە پرۆژەی بەنداوی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (گاپ) بۆ پەنگدانەوەی ڕووباری فورات و دیجلە (دەجلە) بەڕێوەیە، بەڵام هێشتا ئەو ئومێدەی لە کوردستانی عێراق وەدی هاتووە ماویەتی لێرە ببێتە ڕاستی. بەشەکانی کوردستانی تورکیا و ئێران و سووریا، لە بواری ئابووریدا، هێشتا هەر لە دواوەدان.

# باکگراوندی مێژوویی

هەرچەندە هەندێ لە زانایان لەو باوەڕەدانە کە کورد لە نەوەکانی چەندین خێلی هیندۆ ئەوروپینە کە ڕەنگە ٤٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا لەم ناوچانەدا ژیابن، بەلام بە ڕاستی بنچینەی کورد ساغ نەبووەتەوە. کوردەکان، خۆیان بە نەوەی ئەو میدییانە دەزانن کە لە ٦١٢ پ.ز. ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییان ڕووخاندووە و هەندێ ئەفسانەی سەرسووڕهێنەریش هەیە کە دەڵێ ئەمانە لە نەوەی جنۆکە و جادووگەرەکانی مەلیک سلێمانن. زۆریش لەو باوەڕەدان کە ئەو کاردۆخییانەی لە کاتی پاشەکشەکردنی ١٠٠٠٠ سوارەکەی زێنەفۆن ڕێگەیان لێیان گرتووە و گەلێک دەردەسەرییان داونەتێ و زێنەفۆن لە ئاناباسیس Anabasis باسی کردوون، ئەوان باپیرانی ئەم کوردانەی ئێستا بوونە. لە سەدەی حەفتەمی زایینیدا، عەرەبە داگیرکەرەکان زاراوەی (کورد)یان بۆ ناونانی ئەو گەلە شاخاوییە بەکار هێنا کە لەو هەرێمەدا ئیسلامیان کردن و مێژوو ئەوەش تۆمار دەکا کە ئەو سەلاحەدینە بە ناف و دەنگەی سوارچاکانە و سەرکەوتووانە دژی فەلە خاچپەرەوەرو ڕیجەرد لیۆنهارت (شێردڵ) شەڕی کرد، کورد بووە. لە سەرەتای سەدەی ١٦دا، کوردەکان بە ئاسانی کەوتنە بەردەستی عوسمانییەکان و بەشێکیشیان کەوتنە ژێر چەپەڵۆکی فارسەکانەوە. لە ١٥٩٦ شەرەفخانی بەتلیسی شەرەفنامەی تەواو نووسییەوە. شەرەفنامە مێژوویەکی زۆر تێروتەسەلی بنەماڵەی میرە کوردەکانە. لە سەدەی پاشتر، ئەحمەدی خانییش مەم و زینی نووسییەوە. مەم و زین چیرۆکێکی دلداریی نەتەوەیی کوردییە و هەندێ کەس بە سەرەتای پەیدابوونی هەستی نەتەوەیی کوردی دادەنێن. لە ١٨٤٧ دا، میر بەدرخان بەگ، میری میرنشینی کوردیی بۆتان، تەسلیمی دەستی عوسمانییەکان بوو. هەندێ زانایان لەو باوەڕەدان کە شۆڕشە سەرنەکەوتووەکەی شێخ عوبەیدوڵلا، یەکەم هێمای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی کوردی بووە، کەچی هەندێک هەن هزری ئەوە دەکەن کە ئەو شۆڕشە تۆزێک لە سنووری یاخیبوونێکی خێڵەکی- ئاینی دەرچووە.

## تورکیا

سوڵتانی عوسمانی، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، لە ١٨٩١ ، سوارەی (حەمید)ی دامەزراند، کە بریتی بوو لەو سوارانەی کەلایەنگری حکوومەتبوون؛ ئەمەش لە پەیدابوونی هەستی نەتەوەپەرستیی هاوچەرخی کوردی بە هەنگاوێکی گرینگ دەزاندرێ. لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، کورد پشتیوانیی عوسمانییەکانیان کردو پاشتریش لەمیانی شەڕی سەربەخۆیی تورکیادا پشتیوانیی موستەفا کەمال (ئەتاتورک)یان کرد.

لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، یەک لە چوارده خاڵەکەی سەرۆکی وڵاتە یەککگرتووەکان ودرۆ وڵسن کە خاڵی دوازدەمینە، جاڕی ئەوەی دا پێویستە کە هەموو کەمینە نا–تورکەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مافی (گەشەپێدانی سەربەخۆیی -au tonomous development) یان بۆ مسۆگەر بکرێ. پەیمانە بە مردوویی بووەکەی سێڤەر کە لە ئابی ١٩٢٠ دا مۆر کرا ڕێگەی "حکومڕانیی سەربەخۆیی بەو ناوچە ناوخۆیانە دا کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن" (بەندی ٦٢) و لە بەندی ٦٤ یشدا، تەماشای دوورتری کردو ئەگەری مسۆگەرکردنی "سەربەخۆیی لە تورکیا"ی خستە بەرچاوی "گەلی کورد". تورکیا لە سایەی ئەتاتورک زوو هەستی وەبەرەخۆیدا هاتەوە – سەیر ئەوەبوو کە کورد لەو ڕابوونە یارمەتییان دا، تورکەکان بە چاکی یارییان بە کارتی ئیسلامەتی لەگەڵ کورد دا کرد و بەمجۆرە بارودۆخەکە ژێروژوور بوو. پاشتر پەیمانی لۆزان لە تەمموزی ١٩٢٣دا مۆر کرا و دانی بە کۆماری تورکیادا نا، بەڵام هیچ مەرجێکی بۆ کوردەکانی تورکیا لەبەرچاو نەگرت.

کە کەمال ئەتاتورک کۆماری سیکۆلاری تاکە گەلی تورکی ڕاگەیاند، یەکەم جار سێ شۆڕشی گەورەی کوردی لێ کەوتەوە. لە ١٩٢٥ شێخ سەعیدی شۆڕشی کرد؛ شێخ سەعید هەڵگری تەریقەتە بەهێزەکەی سۆفی نەقشبەندیی ئیسماعیلی بوو. شۆڕشەکە ڕاپەڕینێکی نەتەوەیی ئاینی بوو، ویستیشی سیستەمی خەلیفایەتی بگەڕێنێتەوە. دوای چەند سەرکەوتنێکی کاتی، شێخ سەعید شکا و لە سێدارە درا. لە ١٩٢٧یش خوێبوون، کە پارتێکی ئینتقالی بوو، هەر ئەوساڵ لە لبنان دامەزرابوو، یارمەتیی ژەنراڵ ئیحسان نووری پاشای دا بۆ ئەوەی شۆڕشێکی گەورەی دیکە لە

کێوەکانی ئاراراتدا هەڵگیرسێنێ، ئەویش بە تەواوی هەرەسی پێ هات، ئەمجارەیان ئێرانییەکان یارمەتی لەناوبردنی شۆڕشەکەیان دا. دواجاریش شۆڕشی دەرسیم (ئێستا پێی یێژن تونجەلی) بەرپا بوو و لە ١٩٣٦ تا ١٩٣٨ی خایاند. سەید ڕەزا تا مردنی لە ١٩٣٧ سەرکردایەتیی شۆڕشەکەی کرد؛ ئەمەشیان بە تەواوەتی بە هەرەسهێنانی کورد کۆتایی هات.

هەرچەندە زۆر لە هۆزە کوردەکان یان لای حکوومەتی تورکیایان گرت و یانیش هەر بێلایەن بوون، بەڵام کاربەدەستە تورکەکان بڕیاریان دا هەرچی پێوەندی بە نەتەوەی کوردەوە هەیە هەمووی یاساغ بکەن و نەیهێڵن. ژمارەیەکی زۆری ئامێری دەستوورییان خستە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو ئامانجەیان بپێکن. لە هەندێ بابەتدا هەرچی بیرۆکەیەک هەبوو کە بەخەیاڵیاندا هات بۆ ئەوەی ئەو کردەوانەیان ڕەوابەند justify بکەن، هەموویان پیادە کرد. بەمجۆرە بەناو بیردۆزەی خۆر Sun theory یان فێرکرد کە دەڵێ هەموو زمانەکان لە بنەڕەتدا لە یەک زمانی ڕەسەنی سەرەتایی پەیدا بووینە کە زمانێکی تورکیی ناوەڕاستی ئاسیایە. کورد لە ناو ئەو شاخە هەزاربەهەزارەی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵدا پەرژین دران و زمانی دایکییان لە بیر بردراوە. هەرچەندە بەکارهێنانی ناتۆرە appellation قورسە خراپەکەی (تورکی چیا) ڕەخنەی زۆری لێ گیرا، بەڵام بووە کلیلی زاراوەی ئەم کردەوانەی کە دژی کوردەکانی تورکیادا ئەنجام دران. هەرشتێک ناسنامەی تایبەتی کوردی وەبیری خەڵکی دەهێناوە، بە زمان و جلک و ناوەکانیشەوە، هەموو سڕێندراوە.

ئەو دەستوورەی ئێستا (١٩٨٢) ژمارەیەک بەندی تایبەتی تێدایە، تەنانەت ئاخاوتن و نووسینیش بە کوردی یاساغ دەکا. بۆ نموونە، بە ڕاشکاوی لە دیباچەکەیدا دەڵێ: "نابێ هیچ جۆرە هزر و بۆچوونێک بپارێزرێ ئەگەر بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی تورک و بنەمای بوون و یەکپارچەیی خاکی تورکیا بێ." دوو بەندیش لە دەستوورەکەدا هەنە کە ئاخاڤتن و نووسین بە زمانی کوردی قەدەغە دەکەن بێ ئەوەی ناوی بێنن.

هەرچەندە فشارەکانی سەر بەکارهێنانی زمانی کوردی لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١ دا، لە جاران سووکتر کراون، بەڵام بەندی ٨ی یاسای تازەی دژە تیرۆر کە لە

نیسانی ۱۹۹۱ کەوتە کار، ڕێگەی خۆش کردووە بۆ ئەوەی هەر ئەکادیمییەک، یان ڕووناکبیرێک، یان ڕۆژنامەنووسێک بە تێوەگلاو لە کاری تیرۆریستی لە قەڵەم بدا، ئەگەر بە شێوەیەکی ئاشتییانەش دەنگی هەڵبڕێ و داوای مافەکانی گەلی کورد بکا. بە هەر هەمان شێوە و بە پێی یاسای ۳۱۲ بنەماکانی دادگای سزادانی تورکی، تەنیا ئەگەر زارەکی یان بە نووسین یەکێک پشتیوانیی مافەکانی کورد بکا، دەبێتە هۆی تاوانبارکردنی بە "هاندانی ڕکەبەری یان دوژمنداری لە نێوان چینە نەژاد و ئایین و ناوچە و کۆمەڵە جوداکانی وڵاتدا." ناودارترین ڕۆماننووسی تورکی بە ڕەگەز کورد، یەشار کەمال لە ۱۹۹۵ بە پێشێلکردنی ئەم بەندانە تاوانبار کرا کە هەندێک بە زاراوەی "تاوانی هزر thought crime" ناوزەدی دەکەن.

لە ۱۹۷۰وەڕا، بەشێکی زۆری کوردی تورکیا، چالاکانە داوای مافە کولتووری و سیاسییەکانی خۆی دەکا. حکوومەتیش لە ترسی پارچە بوون و لێکترازانی شیرازەی وڵات، زۆر بە توندی هەموو ئەو خواستانە سەرکوت دەکا. ئەم لاملییە فەرمییە لە بەرانبەر هەر داخوازییەکی نەرمی کوردەکان، هانی توندڕۆیی دا و پارتیا کارکەرێن کوردستان، بە سەرۆکایەتیی عەبدوڵڵا ئۆجەلان (ئاپۆ) لە ئەنجامی ئەوەدا و لە ۲۷ی نۆڤێمبەری ۱۹۷۸ پەیدا بوو. لە ئابی ۱۹۸٤، «پ. ک. ک» بە فەرمی خەباتی چەکدارانەی خۆی جاڕ دا و تا سەرەتای ۲۰۰۰ پتر لە ۳۷۰۰۰ کوژراو و خاپووربوونی بەشێکی یا تەواوی ۳۰۰۰ گوندو پەراگەندەبوونی ۳ ملیۆن هاووڵاتیی لێ کەوتەوە.

لە سەرەتای ۱۹۹۰کان بوو، کە بۆ ماوەیەکی کورت خەریک بوو ئۆجەلان جۆرە سەرکەوتنێکی سەربازی بەدەست بێنێ. لە کۆتاییدا ئۆجەلان پێی لە بەڕەی خۆی پتر ڕاکێشا و سوپای تورکیش هەموو توانای خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی پەلبەستی بکا. هێدی هێدی، بەڵام بە توندی، تورکەکان توانییان هەڕەشەی سەربازیی «پ. ک. ک» پەراوێز بکەن. بڕیارە چەوتەکەی ئۆجەلان لە ۱۹۹٥ دای تا پەلاماری پارتی دیموکراتی کوردستانی مەسعوود بارزانی لە باشووری کوردستان بدا، چونکە ئەمەیان بڕیاری پشتیوانیکردنی تورکیای دابوو، هێشتا ئۆجەلانی بێهێزتر کرد. دوا پشت شکانی لەوەوە هات کە تورکیا لە ئۆکتۆبەری ۱۹۹۸ بڕیاری دا پەلاماری

سووریا بدا ئەگەر دیمەشق لەو حەشارگەیەی لەمێژبوو لێی بوو لەو وڵاتە دەرنەکا.

ئۆجەلان پەنای برد بۆ ئیتالیا، بەڵام ئەو گوشارەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەبری تورکیای هاوپەیمانی ناتۆ NATO کردی، ئیتالیا و وڵاتانی دیکەشی ناچار کرد، وەک تیرۆریستێک، پەنابەری سیاسی بە ئۆجەلان نەبەخشن و دانوستانیشی لەگەڵدا نەکەن. لە ڕاستیدا چەند ساڵ بوو ئەمەریکا مەشقی سیخوڕی بە تورکیا دەکرد و چەکیشی پێ دەدا بۆ ئەوەی دژی ئەوانە شەڕ بکا کە بە کوردە "خراپەکانی" تورکیایان دەناسێ، کەچی بە پێچەوانەوە پشتیوانیی کوردە "باشەکانی" عێراق دژی سەدام حوسێن دەکا. لە دوا قۆناغدا، ئۆجەلان لە کینیادا گیراو فڕێندراوە بۆ تورکیا و لەوێ دادگاییەکی هەستەوەر کراو بە تاوانی خیانەتکاری فەرمانی لە سەردانی بۆ دەرچوو. لەکاتی دادگاییکردنیدا، ئۆجەلان لە بری ئەوەی کۆششی تێهەڵچوونەوەیەکی گرانبەهاو داوای تازەکردنەوەی خەبات بکا، هەستا ڕاگەیاندنێکی سەرسووڕهێنەری بڵاو کردەوە؛ لەو بەڵاقۆکەدا ئۆجەلان داوای کرد تورکیا دیموکراتیزە بکرێ و کێشەی کوردیش لە چوارچێوەی تورکیایەکی یەکگرتوودا بێتە چارەسەرکرن. بۆ ئەوەی دڵسۆزیی خۆشی بسەلمێنی، هەستا داوای لە گەریلاکانی کرد تا خاکی تورکیا چۆل بکەن. بەمجۆرە، گرتنی ئۆجەلان کێشەی کوردی لە تورکیادا چارەسەر نەکرد، بەڵکو بە زیندانیکردنی ئۆجەلان پرۆسەیەکی بگرە و بێنەوبەردەی شاردراوە لە نێوان دەوڵەت و زۆر لە هاووڵاتییە کورد نەژادەکانی دەستی پێ کرد. «پ. ک. ک» و هادەپ نوێنەری ئەو گەلەیان کرد. هادەپ لە ١٩٩٤ بە شێوەی پارتێکی یاسایی کوردی، دامەزرا و لەو هەڵبژاردنە لۆکالانەی لە دوای دەستگیرکردنی ئۆجەلان لە ناوچە کوردییەکاندا کران، توانی چەندین سەرۆک شارەوانی هەڵبژێرێ.

لە هەمان کاتیشدا، یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ و کریکاران، هارۆڵد هۆنگجو کۆ، سەردانی تورکیای کرد و چاوی بە ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتییان کەوت. هەرچەندە ناوبراو ئەوەی بەمافی تورکیا زانی کە لە بەرانبەر مەترسیی «پ. ک. ک» بەرگری لە خۆی بکا. بەڵام مشتومڕێکی زۆری لەسەر ئەوە کرد کە لەو دەمی مرۆڤ دەتوانێ دژی

تیرۆر بێ، هەر لەو دەمیشدا دەتوانێ لایەنگری مافەکانی مرۆڤیش بێ. لەوەش پتر ڕۆیشت و گوتی لە دوای بەزینی «پ. ک. ک» ناکرێ خاکی تورکیا لێکتر بترازێ، بەڵام دەبێ سیاسەتێکی تازەی وەسا پەیڕەو بکرێ کە دان بە مافەکانی مرۆڤدا بنێ و چونکە پێگەی تورکیا بەوە توند دەبێ کە شوێنێکی ڕاستەقینە لە ئایندەی تورکیا بۆ کوردەواریی ئەو وڵاتە تەرخان بکرێ.

لێرە کاندیدکردنی تورکیا بۆ بوونە ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا هاتە ناو یارییەکە و لە دیسێمبەری ١٩٩٩، یەکێتیی ئەوروپا بڕیاری کاندیدکردنی تورکیای پەسند کرد. ئەگەر تورکیا لە یەکێتیی ئەوروپا وەربگیرێ، تەواوی ئەو ئاواتانە وەدی دێن کە ئەتاتورک بۆ کۆمارێکی بەهێزی یەکگرتووی دیموکراتی بەستراوە بە ڕۆژئاوا، دەستنیشانیکردن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، تا تورکیا بەتەواوەتی هەموو مەرجەکانی کۆپینهاگن Copenhagen Criteria جێبەجێ نەکات و لە سێدارەدانی ئۆجەلانیش هەڵنەواسێ، تورکیا ناتوانێ ئەو خەونەی خۆی بکاتە ڕاستی.

هەرچەندە لە ئایاری ٢٠٠٠دا، دادوەری ڕیفۆرمخواز، ئەحمەد نەجدەت سیزەر، بە سەرکۆمار هەڵبژاردرا، بەڵام هێشتا لەو وڵاتە چەندین دەسەڵاتی هێزدار هەنە کە نایانەوێ تورکیا هیچ هەنگاوێکی تر بۆ دیموکراتیزەکردنی وڵات بهاوێژێ، چونکە لەوە دەترسن ئەو پۆستە باڵادەستانەیان لە دەست بچی کە ئێستا هەیانە و ترسی لەبەریەکچوونی تورکیاشیان لەبەردایە. بۆیە، ئەو ڕێچکۆڵەیەی چاکسازی لە تورکیا گرتی و یاسایەکەی ئابی ٢٠٠٢ کە هەر بە قسە مافەکانی کولتووری کوردی سەپاند و گۆڕینی سزای لە سێدارەدانی ئۆجەلانی لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢ دا سووکتر کرد و کردییە ژینبەند هێشتا کێشبەندی کوردیان لە تورکیا چارەسەر نەکرد. دەشبێ هێشتا چاوەڕێی ئەوە بکەین بزانین ئەو سەرکەوتنەی پارتە ئیسلامییەکەی عەدالەت و گەشەپێدان لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٢ وەدەستی هێنا، چ بەرهەمێکی لێ دەکەوێتەوە.

ئەوەی تا ئاداری ٢٠٠٣ دیار بوو، تەنیا پێشکەوتنێکی کەم بوو، کرا. هێمای ئەوەش دیار بوو کە «پ. ک. ک» (ناوی خۆی گۆڕیبوو و کردبوویە کۆنگرا دیموکراسی و ئازادیا کوردستان، کادیک) ڕەنگ بوو دەست بە خەباتی خۆی بکاتەوە.

## عێراق

لەوەتی بەریتانیا بە شێوەیەکی دەستکرد، بە پێی پەیمانی سایکس - پیکۆ، لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، عێراقی ئێستای لە کۆنە ویلایەتەکانی عوسمانی مووسڵ و بەغداد و بەسرە، دروست کرد، تا ئێستا، کوردەکانی عێراق، نزیکەی بەردەوام لە باری شۆڕشدا بووینە. ئەم دۆخە یاخیبوونە سێ هۆی هەیە:

یەکەم؛ ڕێژەی دانیشتوانی کورد لە عێراق بە بەراورد لەگەڵ سەرکۆی دانیشتوانی وڵاتەکە، لە ڕێژەی کوردی دانیشتووی هەموو وڵاتانی دیکە پترە. هەرچەندە ئەگەر ژمارەیان لە عێراق لەگەڵ ژمارەی کوردەکانی تورکیا و ئێران بەراورد بکەین، ئەوانەی عێراق زۆر لەوان ژمارەیان لە خوارەوە ترە، بەڵام ئاپۆڕەیەکی گرینگی دانیشتوانی عێراق پێک دێنن، ئەم ڕێژە زۆرەشیان توانای ئەوەی داونەتێ کە ڕۆڵێکی کاریگەرتر لەم وڵاتە بگێڕن، لەوەی کە لە تورکیا و ئێران دەتوانن بیکەن. دووەم؛ چونکە عێراق دەوڵەتێکی دەستکردە، بۆیە وەک قەوارەیەکی سیاسی لە تورکیا و ئێران ڕەوایی کەمتری هەیە. تورکیا و ئێران، با هەر کەمینەی زۆری کوردیشیان هەبێ، چەندین سەدەیە، بە شێوەیەک، هەردووکیان هەنە. ئەمەش وای کرد کە کورد ئاسانتر لە عێراق بێزار بن و ئاسانتریش لێی ڕاپەڕن. سێیەم؛ بەهۆی ڕێبازگەری سوننە و شیعە، عێراق لە ناو خۆیدا دابەشە؛ ئەم دیاردەیە نە لە تورکیا و نە لە ئێرانیشدا نییە. ئەم کێشمەکێشە Perdicament ئایندەی عێراقی هێشتا پتر خستە گومانەوە.

حکوومەتی عێراقیش هەمیشە ترسی ئەوەی هەبووە کە کوردەکان لە عێراق جودا ببنەوە. ترازانی کورد لە عێراق تەنیا هەر ئەوە نییە کە ژمارەی دانیشتوانی وڵات کەم دەکاتەوە، بەڵکو مەترسیی ئەوەشی لێ دەکرێ کە لەدوای ئەوان شیعەکانیش کە ٥٥ لە سەدی دانیشتوان پێک دێنن، جودا ببنەوە و بەمەش دوارۆژی دەوڵەتی عێراق تووشی مەترسییەکی گەورە دێت. ترسی حکوومەتی عێراقی هەر ئەمەندە نییە، بەڵکو ترسی ئەوەشی هەیە ئەگەر کوردستان لە عێراق ببێتەوە، ئەوە ئابووریی عێراق گورزێکی کوشندەی وێ دەکەوێ، چونکە چەندەها ساڵە دوو لە سێی نەوتی

وەبەرهەمهێندراوی عێراق لە کوردستان دەردەهێندرێ و بە پیتترین خاکی عێراقیش هەر لە کوردستانە. جا وا مەزەندە کراوە کە تۆی دووبەرەکی و ململانێی نێوان حکوومەتی عێراق و کورد لەوەوە شین بووە.

بەریتانییەکان کە لە سەردەمی کۆمەڵەی نەتەوەکان League of Nations ەوە عێراقییان پێ سپێردرا بوو، بۆ ئەوەی ئامانجەکانی خۆیان باشتر بپێکن، هەستان سەرکردەیەکی کوردی لۆکاڵیان لە سلێمانی بە حوکمداری ویلایەتی میسل دامەزراند؛ ئەویش شێخ مەحموود بەرزنجی بوو. هەرچەندە شێخ توانای ئەوەی نەبوو کە دووبەرەکیی نێوان کورد چارەسەر بکا، هەستا یەکسەر خۆی کردە "مەلیکی کوردستان King of Kurdistan" و دژی حوکمی بەریتانیا وەستاو بە نهێنی پێوەندیی بە تورکانەوە کرد. بەریتانیاش لە بیستەکاندا لە ترسی ئەوەی نەکا حکوومەتی بەغداد تووشی هەرەسهێنان بێت، هێزی ئاسمانیی شاهانەی بەریتانیی بەکار هێنا سو سەرکەوتووانە پێگەکانی شێخ مەحموودیان بۆردومان کرد و چەند ڕاپەڕینێکیان لێ دامرکاندەوە.

هەرچەندە وەک لەپێشدا باسمان کرد، پەیمانی سیڤەر لە (١٩٢٠) پێشنیازی ئەگەری سەربەخۆیی کوردی کرد، بەڵام پەیمانی لۆزان لە (١٩٢٣) بۆ دواجار، هیچ باسێکی کوردی نەکرد. لەوەش فرەتر ئەوەبوو کە بەریتانیا بڕیاری دابوو کە ویلایەتی مووسڵی زۆرینە کورد بە عێراقەوە بلکێنێ، چونکە ئێرە سەرچاوەیەکی زەنگینی نەوتی تێدا هەبوو. بەریتانیا لەو باوەڕەدا بوو کە ئەمە تەنیا ڕێگە بوو بۆ ئەوەی عێراق بتوانێ بەسەر پێ بکەوێ.

دوای ئەوەی لە ١٩٣١ دا، شێخ مەحموود بە یەکجارەکی بەزی، مەلا مستەفا بارزانی وەک سەرکردەیەک بەدیار کەوت و دەرکەوتنەکەشی لەگەڵ بزووتنەوەی کورد لە عێراق هاوکات بوو. هەرچەندە دەسەڵاتی بارزانییەکان لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمایەکی ئاینی ڕێبازی تەریقەتی شێخەکانی نەقشبەندی هەڵدەقولا، بەڵام توانایەکی زۆریشیان لە بەرەنگاربوونەوەدا هەبوو و تا ئێستاش ئەو جەمەدانە سوورە دیارەی خۆیان لە سەردەنێن. مەلا مستەفا بارزانی بۆ پتر لە پەنجا ساڵ، بە هەر جۆرێک بووبێ، دژی حکوومەتی عێراق خەباتی کرد. هەرچەندە بارزانی لەسەر

ڕێبازی کولتووریکی پارێزگار و هزرێکی عەشیرەتگەری پەروەردە بووبوو، بەڵام بووە ڕێبەرێکی ڕوحیی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ دامەزرا، پتر لە دەساڵ (١٩٤٧– ٥٨) لە بانشگە لە یەکێتیی سۆڤیەت ماوە و لە ئەوپەڕی هێزدا بوو کە دانوستانی بەیانی ئاداری ١٩٧٠ کرد. بەیاننامەکە هەر بە نووسین ئۆتۆنۆمی، بە سەرکردایەتیی بارزانی، بۆ کورد مسۆگەر کرد. شەڕی خۆبەخۆی کوردەکان دژی سەرکردەکانی تری وەک ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی زاوای لە لایەک و بەرهەڵستیکردنی حکوومەت لەلایەکی ترەوە، پاشتر بووە هۆی ئەوەی کە بارزانی لە ١٩٧٥ بدۆڕێنێ. هۆیەکی دیکەی هەرەسهێنانەکەی بارزانی ئەوەبوو کە عێراق وازبەندێکی زۆری کرد و لەبەرانبەردا وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران هەموو جۆرە پشتیوانییەکیان لە بارزانی ڕاگرت. ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەوسای وڵاتە یەکگرتووەکان، هینری کێسنگەر، بە گاڵتەجاڕییەوە کردەوەکەی ڕاڤە کرد و گوتی کە نابێ ئەو کردەوەیەی بە نهێنی ئەنجام دەدرێ، لەگەڵ ئەو کارەدا تێکەڵ یەکتری بکرێ کە وەک ئەرک جێبەجێ دەکرێ.

دوای ئەو نسکۆیەی لە ١٩٧٥ دووچاری بارزانی هات، مەسعوود بارزانیی کوڕی وەک سەرکردەیەکی پارتی دێمۆکراتی کوردستان وەدەرکەوت. کەچی لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٥ دا، تاڵەبانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی دامەزراند. چونکە «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بە فەلسەفە و ناوچەگەریی جیۆگرافی و جیاوازیی شێوەزمان لە یەکترییەوە جودانە، بۆیە هەندێ جار هاریکاری یەکتریان کردووە و جاری ئاواش بووە خوێنی یەکتریان ڕشتووە. لە شاڵاوەکانی ئەنفالی ١٩٨٧– ٨ ٨ و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨یشدا، کە سەدام حوسێن بۆ جینۆسایدی کورد کردی، هەردوولا زیانی زۆریان لێ کەوت.

لە دوای شەڕی کەنداو و هەرەسهێنانی ڕاپەڕینی کورد لە ئاداری ١٩٩١، کۆڕەوی پەنابەرانی کورد بەرەو شاخەکان هەڵکشاو ئەمەش بە دوودڵیەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ناچار کرد کە ناوچەی دژە فڕین دابمەزرێنێ و لەو ناچەیەدا بوو کە چرۆی حکوومەتێکی دیفاکتۆی کورد لە باکوری عێراقدا، گەشەی کرد. جگە لەمەش بڕیارە بێهاوتایەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێونەتەوەیی ژمارە ٦٨٨ لە ٥ی نیسانی

١٩٩١ دا دەرچووو "سەرکوتکردنی هاوولاتییانی عێراقی ... لە ناوچە کوردنشینەکان" سەرکۆنە و ڕیسوا کرد و خواستیشی "کە عێراق ... دەمودەست سەرکوتکارییەکان ڕابگرێ." بڕیارەکە بەڕادەیەک ئەوپەڕ هێماساز symbolic بوو، چونکە پێشتر کوردەکان، بە فەرمی لە ئاستی نێونەتەوەیی، نە هێندە باسیان کرابووو نە هیچ جۆرە پارێزگاریشیان هەبوو.

هەرچەندە لە دوای دۆڕانی سەدام حوسێن لە شەڕی کەنداو، حکوومەتێکی دیفاکتۆ لە باکوری عێراق دروست بوو، بەلام هێشتا «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» شەڕێکی ناوخۆی قورسیان لە ١٩٩٤ تا ١٩٩٨ دژی یەکتر کرد. لە ئەنجامی ئەو شەڕە و لە دوای ١٩٩٤ دا، دوو حکوومەتی لاوەکی لە کوردستانی عێراقدا دروستبوون: حکوومەتی «پ. د. ک» لە هەولێر و هی «ی. ن. ک» یش لە سلێمانی بوو. نەبوونی ئارامی و بۆشایی دەسەلات، ولاتانی دراوسێی وەک تورکیا و ئێران و ولاتە یەکگرتووەکان و سووریا و عێراقیشی ناچار کرد دەستیان لە کاروباری ناوچەکە وەربدەن؛ چونکە هیچ لەم ولاتە دراوسێیانە نەیاندەویست حکوومەتێکی کوردی لە باکوری عێراقدا پەیدا ببێ.

لە کۆتاییدا ولاتە یەکگرتووەکان بارزانی و تالەبانیی هێنا بۆ واشنتن و لە سێپتێمبەری ١٩٩٨ دا، ناوبژیوانیی ئاگربەستێکی نێوانی کردن. هەروەها، لە دوای ١٩٩٥یشەوەڕا کە عێراق ڕێگەی نەفت فرۆشتنی پێ درا، ١٣ لە سەدی بە های ئەو نەفتە بۆ کوردەکان تەرخان کرا. ئاشتی و جۆرە گەشانەوەیەک و دیموکراسی لەو دەولەتە دیفاکتۆیەی کوردستان لە باکوری عێراق دەستی پێ کرد گەشە بکا. لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢، پەرلەمانە یەکگرتووەکەی دەولەتی دیفاکتۆی کوردستان بۆ یەکەمجار لە دوای ١٩٩٤ دا کۆبووەوە و سستمی فیدرالیی بۆ کوردستانی عێراق، لە عێراقی دوای سەدام، جاڕ دا.

لە پایزی ٢٠٠٢، سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکان جۆرج و. بووش داوای لە سەدام حوسێن کرد، دا چەک بێ و هەڕەشەی شەڕێکی هاوپەیمانانی لە عێراق کرد، ئەگەر سەدام خۆی چەک نەکا. لە سەرەتای ٢٠٠٣، شەڕ کەوتە ترکزە. ترس و دلەڕاوکێیەکی زۆریش لە ئایندەی کورد لە عێراقی دوای سەدام، پەیدا بوو.

هەرچەندە زۆرینەی کوردەکان پشتیوانییان لە لادانی سەدام حوسێن دەکرد، بەڵام پێشنیازی وڵاتە یەکگرتووەکانیان بۆ ناردنی لەشکری تورکیا بۆ ناو خاکی کوردستانی عێراق پەسند نەکرد؛ چونکە هاتنی لەشکری تورک بۆ ئەو هەرێمە، هەڕەشەیەکی زۆری لەو حکوومەتە دیفاکتۆیەی کورد دەکرد. تورکیاش ترسی لەوەدا هەبوو کە کوردەکانی عێراق نموونەیەکی ترسناک و زیندی بە کوردەکانی تورکیا نیشان بدەن؛ ئەمەش ببێتە هۆی دووبارە تەقاندنەوەی بارەکەو خەباتی چەکدارییان دەست پێ بکەنەوە. لە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ بوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان هێرشی سەربازی بۆ سەر عێراق هێناو خێرا ڕژێمی سەدام حوسێنی سەرئەنگێو کرد. تا ئەو دەمی کە حکوومەتێکی فیدراڵی باڵا، دەسەڵاتێکی بەرفرەی بە کوردستان دەدا، حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەر کارەکانی خۆی ڕادەپەڕێنێ و تا ئەوکاتەی ئەم کتێبەش نووسراوە. هێشتا ئەوە نەهاتبووە کایەوەو ئایندەی کوردەکانی عێراقیش هێشتا هەر مسۆگەر نەبووبوو.

## ئێران

هەرچەندە ژمارەی ئەو کوردانەی کە لە ئێراندا دەژین، دوو هێندەی ژمارەی کوردەکانی عێراقە، بەڵام بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەوێ سەرکەوتنی کەمتری بەدەستهێناوە و ئەمەش لەلایێکی لەبەرئەوەیە کە ئێران زۆر لە مێژە حکوومەتی بەهێزی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا، سمایل ئاغای سمکۆ لە بیستەکاندا چەند شۆڕشێکی گەورەی بەرپا کرد کە تا حکوومەتی ئێرانی بە خیانەت وای هەڵخست کە دانوستانی لەگەڵدا دەکاو لە ١٩٣٠دا، تا نەیکوشت، ئەو شۆڕشانە کۆتاییان نەهات.

ئەم تەکنیکەی ئێرانییان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، دیسان لە ١٣ پووشپەڕی ١٩٨٩ دا دووبارە بووەوە و بەکرێگیراوانی ئێرانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، عەبدولڕەحمان قاسملوویان بە بیانووی دانوستانکردن لەگەڵیدا، لە ڤیەنا، کوشت. لە ١٧ سێپتێمبەری ١٩٩٢ش، سیخوڕانی ئێران جێگرەکەی قاسملووشیان کوشت. سادق شەرەفکەندی لە کاتی چێشتخارن، لە نێو خارنگەکا لە بەرلین کوژرا. پێشتر لە ١٩٨١، شۆڕشی کورد دژی ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی، بە هۆی زلهێزی ئێرانەوە، سەرتاپا تەفروتونا کرا.

لەگەڵ ئەم هەموو فەیلەرانەشیان، کوردەکانی ئێران وا لە نێو برا کوردەکانیان بەناودەنگن کە ئەوان یەکەم کۆماری کوردیی تەمەن کورتی مەهابادیان لە سەدەی بیستەم (ینایر دیسێمبەری ١٩٤٦) دامەزراندووە. دوای ئەو کۆست کەوتنە کۆماری کوردستان خاپوور کرا و سەرکۆماریش، قازی محەمەد، دوای دادگاییەکی ساکار لە ٣١ ئاداری ١٩٤٧، لە سێدارە درا و ئەمەش نسکۆیەکی وابوو کە تا ئێستاش کوردەکانی ئێرانی لێ وەخۆ نەهاتوونەتەوە.

## سووریا

نزیکەی یەک ملیۆن کورد لە سووریادا دەژین. ئەم ژمارەیەش زۆر لەو ژمارەیەی کە لە تورکیا و ئێران و عێراقشدا دەژین، کەمترە. هەرچەندە لە سووریا گەورەترین کەمینە پێک دێنن، بەڵام کوردەکان لەوێ، لە سێ هەرێمی لەیەک دووردا دەژین و وەک ئەوانی سێ وڵاتەکەی تر نەیانتوانیوە بە چاکی خۆیان ڕێک بخەن و گەشە بکەن. زۆر لە کوردەکانی سووریا تەنانەت ناسنامەی سووریاییشیان لێ سەندراوەتەوە. حزبی بەعسی سەرکوتکار تا ٢٠٠٠ لە ژێر فەرمانی حافز ئەسەد و دواتریش لەبەر سێبەری بەشاری کوڕی، لە نزیکەوەڕا چاودێریی کوردەکان دەکا. بۆ نموونە، بە پێی فەرمانێکی باڵا لە سێپتێمبەری ١٩٩٢ڕا، تۆمارکردنی ناوی منداڵ قەدەغە کراوە، ئەگەر ناوەکە کوردی بێ. ناوەندە کولتوورییە کوردی و کتێبخانە کوردییەکان و چالاکییە هاوشێوەکان یاساغ کراون. گەلێک گومان لەوە دەکەن چونکە سووریا چەند ساڵێک بوو «پ. ک. ک»ی لە پەنای خۆی نابوو، بۆیە «پ. ک. ک»ش لەلای خۆیەوەڕا، دەرخوونەی لەسەر کوردەکانی سووریا نابوو و نەیدەهێشت هیچ دژی ڕژێم بکەن. لەبەر ئەم هۆیانەیە کە کوردەکانی سووریا هێندە گرفتی گەورە لەپێش دەسەڵاتدارانی سووریا دانانێن.

## ئایندە

هەرچەندە پێ ناچێ بە درێژاییی سەدەی ڕابردوو شەڕ و کوشتار پسابێتەوە، بەڵام هێشتا ڕەنگە کوردەکانی تورکیا بە مسۆگەربوونی شێوەیەکی گونجاوی مافە کولتوورییەکانیان و دیموکراسی قایل بن. لە ئێران و سووریاش کە بزووتنەوەی کورد

کەمتر پەرەی سەندووە، ڕەنگە سەپاندنی ئەم جۆرە مافەیان زۆر شادمانیان بکا. بەڵام لە عێراق و دوای ئەو هەموو کارە ناشایستانەی کە سەدام حوسێن کردی و ئەوەی لە شەڕی کەنداوی ١٩٩١ بە سەری خۆیدا هێنا، بووە هۆی ئەوەی کە ئەو دەوڵەتە دیفاکتۆیەی کوردستان لە باکوری عێراق دروست ببێ و ڕەنگە لە دوای سەدامیش، کوردەکانی عێراق بە کەمتر لە فیدرالی قایل نەبن.

وەک لەپێشدا باسمان کرد، خواستەکانی کورد لە تورکیا و عێراق دیارە بە پوختەیی ڕێک خراون، بەڵام هێشتا زۆر گرفتیان لە ڕێدا هەیە. تا دیموکراسییش لە ئێران بۆ پێشەوە بچێ، پیاو ئومێدی دەبێ کە پتر ڕێگەی مافەکانی کولتووری بۆ کورد بەدەست بێ. تەنانەت ئومێدێکی کەم لە سووریاش وەدی کراوە کە دەرگای نەرمە مافێکی کولتووری بۆ کوردەکان بکاتەوە؛ لەمێژ بوو حافز ئەسەد دەرگای ئەو مافانەی بەڕووی کورداندا داخستبوو، ئێستاش بەشار ئەسەد کە پیاوێکە پتر پێشکەوتنخوازە و هاتە شوێنی باوکی، ئومێدی لێ دەکرێ کە ئەم دەرگایە پتر واڵا بکا. بەڵام تەنیا کات ئەمە دەسەلمێنێ.

وڵاتە دراوسێکان، بە توندی دژی هەر جۆرە سەربەخۆبوونێکی کوردن و سەربەخۆیی کورد بە هەڕەشە لەسەر یەکێتیی خاکی ئەو وڵاتانەی خۆیان دەزانن، بۆیە ئەگەری هەر جۆرە سەربەخۆبوونێکی کورد یان تەنانەت یەکگرتنێکی پتری کورد، ئەگەرێکی فرە کەمە. هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکان حکوومەتە دیفاکتۆیەکەی کورد لە ناوچەی دژە - فڕینی باکوری عێراقدا دەپارێزێ، بەڵام دژی سەربەخۆبوونیەتی، چونکە نایەوێ تورکیا لە خۆی بڕەنجێنێ و ترسی ئەوەشی هەیە دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی، ڕەنگە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بێنێتە هەژان و ئەم ناوچەیەش لە بواری جیۆپۆلیتیکەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان فرە گرینگە. ئەم بارە ناسەقامگیرەی ئێستا، مەترسیی بۆ ئایندەی کورد لە عێراقی دوای ڕووخانی سەددامی هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستییەکە لەوەدایە کە گرینگیی کورد لە ئایندەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین و سیاسەتی نێودەوڵەتیشدا، ڕۆژ لە ڕۆژ پتر لە بەرزبوونەوەدایە.

# فەرهەنگ

أ

**ئاپۆ**. سەیری (عەبدوڵڵا ئۆجەلان) بکە.

**ئارامیی نوێ (تارگوم)**. زمانی کوردە جوولەکەکانە و هەموو لە هەمووی هەر زمانێکی زارەکییە و نانووسرێتەوە. ڕێسای ئارامیی نوێ هەندێ تایبەتمەندیی شێوەزاری کرمانجیی زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و ئارامیی کۆن و زمانی هیبرۆ (عیبری)ی تێدا هەیە. چونکە تارگوم، تەنیا زمانێکی زارەکییە و نانووسرێتەوە، بۆیە نە دەربڕینی وشەکانی و نە وشەکان خۆشیان شێوەیەکی ستاندارد(ڕەسەن)یان نییە و جیاوازیی زۆری تێدا بەدی دەکرێ.

بەلای کەم، ئەم زمانە سێ دیالەکتی جودای هەبووە. شێوەزاری ڕۆژئاوای لە ئامێدی و دهۆک و نێروە و زاخۆدا قسەی پێ کراوە و لە دیاربەکر و ئورفە و ماردین و جزیرەش هەمان شێوەزاری وەکار هاتووە. لە ئازەربایجانی ئێرانیش شێوەزاری باکووری ڕۆژئاوایان بەکار دەهێنا؛ بەڵام شێوەزاری باشووری ڕۆژهەڵات لە کوردستانی ئێراندا بەکار دەهات و ناوچەی ڕەواندز و هەولێر و سلێمانییش هەر ئەو شێوەزمانەیان بەکار هێناوە.

**ئارنۆڵد ویلسن (١٨٨٤– ١٩٤٠)**. یەکێک لە کارمەندە سیاسییە گرینگەکانی بەریتانیا بوو. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، قزگەی لە عێراق لێ داکوتاو لە دانانی ئەو سیاسەتەی کە کوردەکانی ویلایەتی مووسڵی ئاخنییە نێو عێراق، پشکدار بوو. ئارنۆڵد ویلسن باری ئابووریی بەریتانیای ڕەچاو کرد و بناغەی سیاسەتی خۆی لەسەر گرفتە داراییەکانی ئەو وڵاتەدا دانا و باوەڕی وابوو کە لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانەوەڕا دەشێ زۆر بە هەرزانتر بەرگری لە

مێسۆپۆتامیا بکرێ. کە ئارنۆڵد ویڵسن نەیتوانی لە ڕێی شێخ مەحموودەوەڕا، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کۆنترۆڵی کوردستان بکا، سێر پێرسی کۆکس لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٠، شوێنی ویڵسنی گرتەوە. ویڵسن کتێبی مێسۆپۆتامیای لە١٩١٧ – ١٩٢٠و ململانێی دڵسۆزییەکان Clash of loyalties لە ١٩٣١نووسی.

**ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی (CIA).** ئاژانسی هەواڵگریی وڵاتە یەکگرتووەکانە، لە زۆر لە کاروباری کورد تێ گلاوە؛ لە١٩٧٩ کان لەو پشتیوانییە بەشدار بوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران پێشکێشی مەلا مستەفا بارزانییان کرد و پاشانیش لە خیانەتەکەشدا دەستی هەبوو کە لێیان کرد. لە دوای شەڕی یەکەمی کەنداوی ١٩٩١یش هانی وڵاتە یەکگرتووەکانی دا بۆ ئەوەی پشتی کورد بگرێ. لە نەوەدەکانیش هاوڕێ لەگەڵ کوردان، لەو پیلانانەدا بەشدار بوو کە دەیویست ڕژێمی سەدام حوسێن لە عێراق بگۆڕێ و سەرنەکەوت. سەیری (ڕاپۆرتی کۆمیتەی پایک) بکە.

**ئاشوورییەکان.** زاراوەیەکی مەیلەو نوێیە؛ کەمینەیەک لە فەلەکان بەکاری دێنن. ئاشوورییەکان زمانێکی ئارامییان هەیە و لە دیرزەمانەوە لەگەڵ کورددا دەژین و ناوە ناوە پێوەندیی کۆیلەتییان لەگەڵ یەکتریدا هەبووە، بەڵام ئەمە پێوەندییەکی نەگۆڕ نەبووە. ئاشوورییەکان خۆیان بە نەوەی ئیمپراتۆرایەتی ئاشووریی کۆن دەزانن و بە خاکی باپیرانیان دەڵێن بێت نەهرێن. ڕەنگە بەشی زۆری ئاشوورییەکان و موسڵمانە دراوسێکانیان یەک ڕەگەزیان هەبێ.

ئاشوورییەکان سەر بە کڵێسەی نەستوورینە. ئەم کڵێسەیە٤٣١ لە دوای جودابوونەوەی لە کڵێسەی ڕۆمیی کاتۆلیک، پەیدا بوو. هۆی جودابوونەوەکەش ئەوەبوو کە ئەنجوومەنی ئێفێسوس ڕێی نەدا وانەکانی نێستۆریۆس، کە ئەوسا پاتریارکی کۆستەنتەنییە بوو، بگوترێنەوە. نەستوورییەکان عیسا بە دوو کەسی جیاواز دەزانن، یەکێکیان خوداوەند و ئەویتریان مرۆڤە. مشتومڕیش لەسەر ئەوە دەکەن کە خودا عیسای وەک خواوەندێک داهێناوە، بەڵام وەکو ئینسانێک لە مەریەم بووە. بۆیە نەستوورییەکان قایل نینە بڵێن مەریەم (دایکی خودا)یە.

لە سەردەمێکی مێژوودا دەسەڵاتی نەستوورییەکان بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت و

گەیشتە چین و لەوێ لە ٧٨١، مۆنیومێنتی ناوداری زیانXian یان دروست کرد. ڕەنگە نەستوورییەکان ئەفسانەکانی تایبەت بە پریستەر جۆونیان لە چەرخەکانی ناڤین داهێنابێ. پریستەر جۆون پاشایەکی فەلە بووە کە گوایە لە شوێنێکی تایبەت لە ڕۆژهەلاتدا ژیاوە. پریستەر جۆون، هاوپەیمانێکی چاوەڕوانکراوی ڕۆژئاوایە لەو ململانێیەی کە لەگەڵ ئیسلام دەیکا.

لە دوای پەلامارەکانی تەیمور لەنگ لە سەدەی ١٤ەوە و بەهۆی سزادانیشیان، ئیتر هەرگیز نەستوورییەکان جارێکی تر هەڵنەستانەوە. ژمارەی نستوورییەکان لە کۆتاییدا هێندە کەم بووەوە کە تەنیا لە ناوچەیەکی شاخاویی هەکاری لە باکوری کوردستان، کە ئێستا باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیایە کۆ بووینەوە. لە سالانی دەوروبەری ١٨٧٠دا نزیکەی ٩٧,٠٠٠ ئاشووری مابوون کە لە هەکاری دەژیان. لەوانە ٥٢,٠٠٠ پێوەندییان بە هۆزەوە هەبوو، بۆیە نەدەبوونە خزمەتچیی ئەو کوردانەی کە ١٦٥,٠٠٠ یان لە هەکاریدا لێ کوشتن. پاتریارکێک سەرکردایەتیی ئاشوورییەکانی دەکرد کە ناوی مار شەمعۆن بوو. لە سەدەی ١٩دا ئاشوورییەکان چەند جارێک بە دەستی کوردەکان دووچاری کوشت و کوشتار هاتن. ئەو کاولکاری و تالانکردنانەی کە بەکر خانی بەگ لە ١٨٤٠ دژی ئاشوورییەکان کردی نموویەیەکی سەرەکیی ئەو کردەوانەیە.

لە شەڕی یەکەمی جیهانی، زۆر لە ئاشوورییەکان، چونکە پشتیوانیی هاوپەیمانانیان دەکرد، مردن. لە دوای شەڕ، بەریتانیا زۆریانی هێناو لە ناوچە کوردییەکانی باکوری عێراق نیشتەجێیکردن. کورد زۆر لە سنوور بەزاندن و بەکرێ گرتنی ئاشوورییەکان بێزار و نیگەران بوون. بەریتانییەکان گرووپێکی سەربازیی تایبەتی ٥,٠٠٠ کەسییان لە ئاشوورییان بەکرێ گرت و مەشقیان دان، بەو ئومێدەی بتوانن دووبارە لە باکوری عێراق حوکم بکەنەوە. لە ١٩٣٣، کورد و ئەفسەرە نەتەوەپەرستەکانی سوپای عێراق، گەلێک ئاشوورییان کوشت و هێزە سەربازییەکەیان تێک شکاندن.

ئێستا زۆربەی ئاشوورییەکان کۆچیان کردووە و لە ولاتە یەکگرتووەکان و ئەورووپادا دەژین. هێشتاش نزیکەی ٥٠,٠٠٠ یان لە باکوری عێراقدا دەژین و بەم

نزیکانە بزووتنەوەی دیموکراتیی ئاشووری، پێوەندیی بە بەرەی کوردستانی عێراقەوە کرد و هاریکاریشی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کرد. پەرلەمانی کوردستانی عێراق و حکوومەتی هەرێمی کوردستان و کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان کە پارتی کرێکارانی کوردستان پشتیوانیی لێ دەکا، نوێنەر ئاشوورییانیان تێدا هەیە. مەد تیڤی و لە دوای ئەویش میدیا تیڤی، هەواڵ و نووچەیان بە زمانی ئارامی پەخش دەکرد. هەندێ گرفتی تایبەت بە پارە و پەروەردە و زەوی هێشتا هەر ماوە، چارەسەر ببێ.

چاودێران هەندێ گرووپی بچووکی دیکەی کریستیانەکانیش لەگەڵ ئاشوورییەکان یەک دەخەن. ئەو گرووپانە کلدانییەکانن کە لەم چەرخەدا رۆمان کاتۆلیسیزمی فرەنسی رێبازی پێیان گۆڕی. سوورییانیش هەنە؛ ئەوانەش یان ئۆرتۆدۆکسی یان یاقۆبییان پێ دەڵێن. ئەوەش بەشێکی ئاینی فەلەیە؛ وەک کڵێسەی پاپای ئەرمێنییەکان و کەنیسەی قیپتیی میسری وایە. تاکپەرستەکان Monothests باوەڕیان وایە کە عیسا تەنیا یەک سروشتی تاکی خواوەندانەی هەبووە. ئەنجوومەنی کلدانی لە٥١٤ بڕیاری دا کە بیر و باوەڕی ئاینی ئەوانە هزرێکی نائاساییە.

**ئاغە.** سەرۆک هۆز و خێڵ و تیرە و بنەماڵەی کوردە و بە گشتی لە ناو خێڵەکەی خۆیدا دەژی. زۆربەی ئاغەکان دیوەخانی خۆیانیان هەیە و میوان ڕادەگرن. ئاغە و شێخ (سەرکردەی ئاینی) سەرکردەی نەریتی کوردەوارینە، هەر بۆیەش بە تایبەتی لە تورکیا بە دەرەبەگ و تەگەرەی سەر ڕێی نوێخوازی و دیموکراسی دەناسرێن. لەگەڵ ئەمەشدا، زۆربەی سەرکردەکانی ئێستای کورد لە بنەڕەتدا یان ئاغانە یان شێخن.

**ئافرەت.** سەیری (ژن) بکە.

**ئاق پارتیسی (ئـ.ک.پ.)** ئاق پارتیسی (پارتی داد و گەشەپێدان) پارتێکی ئیسلام – سیاسیی نەرمڕۆیە، لە تورکیا لە ٢٠٠١دا، دوای قەدەغەکردنی پارتی (فەزیلە – ڕەوشت چاکی)ی ئیسلامی دامەزراوە. ئـ.ک. پیتبەندی acronym ئەو هەردوو وشەی تورکی داد و گەشەپێدانە و تەنیا وشەکە بەخۆی (ئاق) واتای سپی، پاک یان دڵسۆز دەبەخشێ.

لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٢، پارتی داد و گەشەپێدان (ئـ.ک.پ.) سەرکەوتنێکی گەورەی لە هەڵبژاردنەکان بەدەست هێنا و توانیی بۆ یەکەم جار دوای بیست ساڵ، حکوومەتێکی زۆرینە پێک بێنێ. چونکە ئەو پارتانەی پێشتر حوکمیان دەکرد، هیچیان نەیانتوانی تەنیا ١٠ لە سەدی دەنگەکانیش بەدەست بێنن بۆیە هەموویان لە وەزارەتەکان وەدەرنران. قەیرانی سەختی ئابووری و کۆمەڵایەتیی تورکیا بوو، کە ئەم گۆڕانکارییە مەزنەی لێ کەوتەوە. سەرۆکی ئـ.ک.پ. ڕەجەب تەیب ئەردۆغان، کە پێشتر شارداری ئەستەمبوڵ بوو، نەیتوانی، یەکسەر لە دوای هەڵبژاردنەکە، پۆستی سەرۆک وەزیران وەربگرێ، چونکە بە تاوانی هاندانی ڕق و کینە حوکم درابوو. جا عەبدوڵڵا گولی یاریدەدەری لە پۆستەکە دامەزرا. لە ئاداری ٢٠٠٣، ئینجا ئەردۆغان پۆستەکەی لێ وەرگرتەوە و گول پۆستی وەزیری دەرەوەی وەرگرت.

سەرکەوتنەکەی ئـ.ک.پ. ئومێدی لێ دەکرا سیاسەتی تورکیا ڕاست بکاتەوە و هەندێ چارەسەری گونجاوی ئەرێنیش بۆ کێشەی کورد لە تورکیادا بدۆزێتەوە؛ بەڵام تەنیا کات ئەمە دەسەلمێنێ. لە ١ی ئاداری ٢٠٠٣، پەرلەمانی تورکی دەنگی لە دژی ڕێگەدانی هێزەکانی ئەمەریکا دا و نەیهێشت لەوێوەڕا لە شەڕی دووەمی کەنداو پەلاماری عێراق بدەن. بەم چەشنە ڕێگە لەبەر تورکیا داخرا و بواری نەما لە داگیرکردنی باکوری عێراق هاریکاری بکا و وەک هاوپەیمانێکی وڵاتە یەکگرتووەکان لە شەڕی عێراق بەشدار ببێ. ئەمە وای لە وڵاتە یەکگرتووەکان کرد چیتر یارمەتیی ئابووریی تورکیا نەدا. ئەم بڕیارە هەموو یارمەتییەکی لە تورکیا بڕی لە کاتێکدا کە زۆر پێویستی پێی هەبوو. مەترسی لە ئـ.ک.پ. کرا دەست بە گێرەشێوێنی بکا.

**ئاق قۆینلو (کاوڕی سپی).** و قەرە قۆینلو (کاوڕی ڕەش) دوو ڕەچەڵەکی تورکمانی دوژمن بوون. لە زۆربەی ساڵەکانی سەدەی ١٥م؛ لە پاش مردنی تەیمور لەنگ لە ١٤٠٤دا، چەند بەشێکی کوردستانیان بە چەتوونی حوکم کردووە. لە زووەوە ئاق قۆینلوی سوننە مەزەب ئامەد (دیاربەکر)یان کردووەتە پایەختی خۆیان و قەرەقۆینلوی شیعە ڕێبازیش دەریاچەی وانیان بە ناوەندی دەسەلاتی خۆیان داناوە. کورد ڕۆڵی سەرەکییان لە ململانێی چەکدارانەی نێوانیان نەگێڕاوە.

لە ١٤٦٧، سەرکردەی دەستڕۆیشتووی ئاق قۆینلو، ئوزوون حەسەن (حەسەنە

درێژ)، دەوڵەتی قەرە قۆینلوی تێک شکاند و زۆربەی خاکی کوردستانی وەبن دەستی کەوت. بە گوێرەی شەرەفنامە، ئوزوون حەسەن بە خۆی "خانەوادە ناودارەکانی کوردستانی قەلاچۆ کردووە، بە تایبەتیش پەلاماری ئەو بنەماڵانەی داوە کە یان پشتیوانیی قەرەقۆینلویان کردبوو یان بە ژێردەستییان قایل بووبوون."و پایەتەختی خۆی بۆ تەورێز (ئێستا لە ئێرانە) گواستەوە. لە ١٥٠٢، ئوزوون حەسەن مرد و سەرکردەی سەفەوی، ئیسماعیل، ئاق قۆینلوی تێک شکاند و خۆی کردە شا.

**ئاکین بیردال (١٩٤٨-     ).** ئاکین بیردال، کوردێکی تورکیاییە و ناودارترین پشتیوانی مافەکانی مرۆڤی نێونەتەوەییە. چەند ساڵ سەرۆکی کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤی تورکیایی بوو. لە ١٢ ئایاری ١٩٩٨، هێزە نادیارەکانی باڵە ڕاستڕەوەکان ویستیان لە ئۆفیسەکەی خۆی تیرۆری بکەن؛ بە شێوەیەکی سەرسامکەر؛ لە کردەوەکە قورتار بوو، بەڵام هەرگیز باش چاک نەبووەتەوە. پاش ماوەیەکی کورت، بە هۆی ئەو گوتارەی بە ئاشکرا خوێندییەوە و باسی مافەکانی گەلی کوردی تێدا کرد، لە سێپتێمبەری ١٩٩٦، بەند کرا.

**ئاگربەستی مودرۆس.** ئاگربەستی مودرۆس لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لە نێوان بەریتانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە ٣٠ ئۆکتۆبەری ١٩١٨دا ڕاگەیەندرا. بەپێی ئەو ئاگربەستە، عوسمانییەکان خۆیان بە دەستی ئینگلیزیەکانەوە دا. هەر ئەو ئاگربەستە بوو کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بڕییەوە و پاشان مستەفا کەمال ئەتاتورک وڵاتی تورکیای لەسەر بنەمای ڕەگەزپەرستیی تورکی دامەزراند. ئاگربەستەکە مۆر کرابوو، بەڵام پاشتر لەشکری ئینگلیز پەلاماری ویلایەتی مووسڵی دا و داگیری کرد و پاشان بە عێراقیانەوە نووساند. ئەم جووڵانەوە سەربازییەی بەریتانییەکان، ناکۆکیی لە نێوان تورک و ئینگلیزدا نایەوە. پاشان لێژنەیەکی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٩٢٦، بڕیارێکی دەرکرد، بە پێی ئەو بڕیارە ویلایەتی مووسڵی هاوێشتە بندەستی بەریتانییەکان و ئەوانیش گەورەترین هەڵەی دیرۆکییان کرد؛ کوردستانی باشووریان بە عێراقە وە لکاند.

**ئاڵای ڕزگاری.** یەکێک لەو پارت و گرووپە سیاسییە بچووکە کوردییانە بوو کە لە ڕۆژانی بێقەراری حەفتاکان لە تورکیا پەیدا بوو، لە ١٩٧٩، ئاڵای ڕزگاری لە

ڕزگاری مارکسی کەل بوو. زۆر جار ئەم گرووپە قاش بووە بە ترۆتسکینیستەکان ناوزەد دەکران و بەزۆری دوور لە توندی و تیژی دەوەستان و هەڵوێستێکی سیاسیی نەرمیان هەبوو، لە ڕزگارییش پتر، ڕەخنەیان لە یەکێتیی سۆڤیەتی دەگرت.

**ئەمنیستی ئینتەرناشناڵ.** سەیری (لێبوردنی نێونەتەوەیی) بکە.

**ئامەد.** سەیری (دیاربەکر) بکە.

**ئاو.** بە پێچەوانەی زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، کوردستان سامانێکی پڕ بێری ئاوی هەیە. هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە خاکی باکوری کوردستانی بن دەستی تورکیاوە، هەڵدەقوڵێن و ئینجا بەناز شەپۆل دەدەن و بەناو سووریا عێراقدا دەخشن.

لەم ساڵانەی دواییدا تورکیا هەر خەریک بووە ئەو ئاوانە پاوان بکا و بۆ ئەم مەبەستەشی چەندین بەنداوی لەسەر لقەکان و بەستی هەردووکیان دامەزراندووە. گونەیدۆغو ئەنادۆڵو پرۆژەسی (گاپ) دەودەوانێی زۆری لە نێوان تورکیا لەگەڵ سووریا و عێراق دروست کردووە. ڕەنگە هۆی داڵدەدانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان و پارتی کرێکارانی کوردستان تا ١٩٩٨، لە سووریا بەهۆی پرۆژەی گاپ بووبێ. بەنداوەکان فرە شوێنەواری گرینگی کوردستانیان نقوم کردووە و کە هەمووشیان دروست بوون، هێشتا هەندێکی دیکەش دادەپۆشن؛ بۆ نموونە ئەگەر پرۆژەی بەنداوی ئیلسو تەواو ببێ، هەموو شوێنەوارەکانی حەسەن کێف بەبن ئاو دەخا. ئەم پرۆژانە نیگەرانییەکی زۆری لە ناو کورد و ئەو بیانییانەشدا پەیدا کردووە کە بایەخ بە شوێنەوارە مرۆییەکان دەدەن.

لە کوردستانی باشووریش سێ بەنداوی گەورە هەنە: بەنداوی دووکان، لەسەر زێی سۆران، دامەزراوە و بەنداوی دەربەندیخان، بەر لە زێی سیروان دەگرێ و بەنداوی مووسڵ، لەسەر ڕووباری دیجلە. بڕیارە پرۆژەی بەنداوی بێخمەش دروست بکرێ، ئەمەیان دەکەوێتە سەر زێی بادینان. جگە لەو ڕووبار و زێیانە، خاکی کوردستان پڕە لە کانیاوی زوڵاڵ. زۆر لە ناوی شار و گوندەکانی کوردان ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەکاتەوە، چونکە گەلێک پێشگری وەک سەراو- و کانی- لەو ناوانەدا هەیە؛ وەک سارداو و کانی کەوە و کانی ماسی و...هتد.

له چەند ساڵی ئایندەدا ئەو سەرچاوانەی ئاو هێشتا گرینگتر دەبن. ئەو ئاوە زۆرەی کوردستان و ئەو نەوتەی لە نزیک کەرکووک و شوێنەکانی دیکەدا هەنە، لە بواری ئابووری و سیاسیدا بارێکی تایبەتی زۆر گرینگ بۆ کوردستان دەرەخسێنن.

**ئاین.** سەیری (دین) بکە.

**ئەنستیتوی کورد لە پاریس:** ئەنستیتوی کورد لە پاریس لە شوباتی ۱۹۸۳، دامەزراوە و ڕەنگە کۆنترین و گرینگترین ڕێکخراو بێ کە ئێستاش هەر چالاکیی هەیە. ئەم ئەنستیتویە ڕێکخراوێکی سەربەخۆی، ناسیاسی، عیلمانییە و جگە لە پسپۆرە ڕۆژئاواییەکانی بواری کوردناسی، زانا و هونەرمەندە کوردەکانی وڵاتانی جوداش دەباوەش دەگرێ. ئامانجەکانی ئەم ئەنستیتویە پاراستنی زمان و مێژوو و کولتووری کوردییە، لە ناو کۆمەڵدا و دەیەوێ ڕێگەی ئاشنابوونی کوردە پەناهەندەکان لە ئەوروپا خۆش بکا و کێشەی کوردیش نیشانی کۆمەڵ بدا.

لە دە ساڵی یەکەمی دامەزرانیدا، ئەنستیتوی کورد لە پاریس کۆمەڵەیەکی قازانج نەویست nonprofit بوو. بەپێی یاسای فرەنسی لە ۱۹۹۳، بووە دامەزراو. foundation ئەم داهاتەی لەم یاسایەوە دێ، یارمەتیی دارایی بۆ ڕاپەڕاندنی چالاکییەکانی مسۆگەر دەکا. ئەنستیتو پارە لە سندووقی چالاکیی کۆمەڵایەتیFundSocial Action و وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکوومەتی فرەنسی وەردەگرێ. جگە لەمە کۆمەکی لە یەکێتیی ئەوروپاشەوە بۆ دێ؛ ئاژانسی سوێدی بۆ گەشەکردنی نێونەتەوەیی و وەزارەتی دەرەوەی نەرویجی و ناوەندی نێونەتەوەیی ئۆلف پالمە و بزووتنەوەی کرێکارانی نەرویج و ژێنێرالیتاتی کاتالۆنیا و ژمارەیەک شارەوانیی ئیتاڵی یارمەتی دارایی ئەنستیتۆی کورد لە پاریس دەدەن.

کەندال نەزان کە کوردێکی تورکیایە و لە بانشگەدا دەژی، لەمێژە سەرۆکی ئەم دامەزراوەیە. لە ۱۹۸۷ەوڕا ئەنستیتو تەلاری تایبەتی خۆی هەیە کە کتێبخانەیەکیش لە خۆ دەگری و ژمارەیەکیش چاپەمەنی بڵاو دەکاتەوە. ئەدرێسەکەی لە پاریسی پایەتەختی فرەنسا ئەمەیە Paris, France ۷۵۰۱۰ rue la Fay- ette ۱۰٦ ژمارەی تەلەفۆنەکانیشی ئەمانەن؛ ۰۱٤۸۲٤٦٤٦٤ـەو ژمارەی فاکسەکەشی ۰۱٤۸۲٤٦٤٦٦ـەو ماڵپەڕەکەشی WWW. fikp. org. ئەنستیتویە

کوردییه گرینگەکانی تریش له برۆکسل و بەلجیک و واشنتن دی سی دا هەنە.

**ئەنستیتوی کوردی له واشنتن.** ڕێکخراوێکی قازانج نەویستی توێژینەوەو پەروەردەییه و بەرگری له کورد دەکا و له ۱۹۹٦دا دامەزراوه. بارەگایەکەی له واشنتن دی سی پایتەختی ولاته یەکگرتووەکانه. نەجمەدین کەریم سەرۆکی پەیمانگەی کوردیی واشنتنون (مایکڵ ئامیتا)ش کارگێڕی ڕاپەڕاندنی بووه.

هەر له دامەزراندنییەوه تا ئێستا، ئەنستیتۆی کوردی کۆنفرانسی دەربارەی بابەتی فره چەشن ڕێک خستووه؛ لەوانه کاریگەریی درێژخایەنی هێرشەکانی چەکی کیمیایی لەسەر دانیشتوانی هەڵەبجە، پشتیوانیکردنی دەستپێشخەرییه کولتوورییەکان و کردنەوەی کۆرسی فێربوونی زمانی کوردی و فشاری زۆریشی له سەر کێشەی کورد، خسته سەر حکوومەتی ولاته یەکگرتووەکان و چەندین چالاکیی دیکەشی کردووه. پەیمانگەی کوردیی واشنتن، ماڵپەڕێکی ئینتەرنێتیشی هەیه؛ www. kurd. org و پێوەندی له نزیکەوەڕا لەگەڵ ئەنستیتۆی کوردی پاریس له فرەنسا، هەیه.

**ئەبولفیدا (۱۲۷۳-۱۳۳۱).** میرێکی کوردی نەوەی ئەیوبییەکانه، له سووریا له دایک بووه و به نووسەرێکی چاک ناسراوه. دوو له کتێبەکانی ناوبانگی زۆریان هەیه: (مختصر تاریخ البشر) مێژووی گێتییه و هەر له سەردەمی بەر له ئیسلامەتییەوه تا ۱۳۲۹ دەگرێتەوه و ئەوی دیکەیان "تکوین البلدان"ە کە له جیۆگرافیا دەدوی و بەشێوەیەکی ڕووکەش زانیاریی فیزیک و بیرکاریشی لەخۆ گرتووه. هەردوو کتێبەکان بەزۆری دەقی کۆکراوەن و ئەبولفیدا ڕێکی خستوونه و تەواوی کردوونه.

له دوای سەرکوتکردنی میرنشینی ئەیوبی له "حەما" ۱۲۹۹، ئەبوو ئەیوب هەر له خزمەتی حاکمی مەملووکی حەما ماوه و برادەراتیشی لەگەڵ سوڵتان تێک نەدا. له کۆتاییدا سوڵتان کردییه فەرمانداری حەما و تا مرد هەر لەو پۆستە ماوه و کرا گەورەی هەموو فەرماندارانی سووریا.

**ئەحمەد چەلەبی (۱۹٥٤-    ).** بانکەوانێکی شیعەیه؛ له بانشگه دەژی. له ۱۹۹۲ که کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی دامەزرا، ئەحمەد چەلەبی کرا به سەرۆک. ڕەنگه به

دەسەڵاتترین کەسایەتیی ناو ئەو ڕێکخراوە بێ. لە وڵاتە یەکگرتووەکان خوێندنی خۆی تەواو کردووە و پلەی دکتۆرای لە ماتماتیک لە زانکۆی شیکاگۆ لە ١٩٦٩دا وەرگرتووە. ئینگلیزی بە ڕەوانی دەزانی و هەر لە سەردەمی مەلا مستەفا بارزانییەوە هاوسۆزی گەلی کورد بووە. یارمەتیی بارزانیی داوە بۆ ئەوەی کە چەک وەدەست بێنێ.

لە سەرۆکایەتیکردنی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی زۆر سەرکەوتوو نەبووە و لە ناوەوەی عێراق ژمارەیەکی کەم لایەنگری هەیە. تەنانەت وڵاتە یەکگرتووەکانیش بەهۆی ئەو ناو و ناتۆرانەی سەبارەت بە ناڕێکیی کاروباری داراییەوە لە دواوەیەتی، پشتیوانییەکی ساردی لێ دەکا. نەیارەکانی هەمیشە بە کاری ناڕێکی دارایی تاوانباری دەکەن، دەڵێن ئەو بوو لە ١٩٩٠ بانکی پێترای پوول چک bankrupt پێ کرد. ساڵی ١٩٧٧ چەلەبی بانکی پێترای لە ئوردن دامەزراندبوو. هەرچەندە ئەو هەموو تەپوتۆزەی بەدوواوە بوو، هێشتا ئەحمەد چەلەبی هەر وەک ئەندامێکی باڵای ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی ماوە؛ هەرچەندە لە دوای ڕووخانی سەدام حوسێن لە نیسانی ٢٠٠٣، بەئەندامی ئەنجوومەنی حوکم دەستنیشان کرا؛ بەڵام وا پێ دەچێ ئایندەی ئەم پیاوە هێندە پڕشنگدار نەبێ.

**ئەحمەدی خانی** (١٦٥٠– ١٧٠٦). دانەری لاوکی نەتەوەیی "مەم و زین"ـە. هەر بەهۆی ئەو شاکارەشیەوەیە کە ئەحمەدی خانی بە پێشەنگی هەڵگری هزری کوردایەتی دەناسرێ. خانی درزی نێوان کوردی تەسک کردەوە. باوەڕی وابوو کە تەنیا پاشایەکی بەهێز و بەدەسەڵات دەتوانێ کورد یەک بکا و لە بن چنگی بێگانەی دەربێنێ و پێشی بخا و گەشەی پێ بکا. هەرچەندە خانی تا بڵێی بە ناوودەنگ بوو، وەلێ ئەو هزرەی ئەو باوەڕێ پێ بوو نەیتوانی کورد زۆر لە یەکتر نزیک بکاتەوە و یەکی بخا.

**ئەحمەد نەجدەت سیزەر**(١٩٤١– ) لە ٥ی ئایاری ٢٠٠٠، پەرلەمانی تورکیا بە دەیەم سەرۆکی وڵاتی هەڵبژارد. سیزەر لە١٩٨٨ـەوەڕا ئەندامی دادگای دەستووری و لە ١٩٩٨یشەوەڕا کورسیی سەرۆکی دادگای دەستووریی وەرگرت.

سیزەر لە ١٩٩٩، لە نەکاوڕا هاتە نێو مەیدانی سیاسییەوە، کاتێک کە ڕەخنەی لە

دەستووری وڵاتەکەی گرت و گوتی کە دەستووری تورکی تەگەرە لەسەر ڕێی ئازادییە بنەڕەتییەکاندا دروست دەکا. سیزەر بە شێوەیەکی تایبەت باسی لە پێویستیی بەرگریکردنی لە ئازادیی قسەکردن و نەهێشتنی (تاوانی هزری) کرد؛ چونکە ئەو بەندە دەستوورییە هەر کەسێکی داوای مسۆگەرکردنی مافەکانی مرۆڤی کورد بکا، ئەوە بە تۆمەتی تیرۆریستی بەندی دەکا. هەروەها بەتوندی هێرشی کردە سەر ئەو تەگەرانەی کە هێشتا هەر ماون و ڕێگە نادەن زمانی کوردی بەکار بێ و مکوڕبوو کە دەبێ هەموو بنەماکانی مافەکانی مرۆڤی نێودەوڵەتی ڕەچاو بکرێن و داوای پێداچوونەوەیەکی گونجاوی بە دەستووری تورکیدا کرد. یەک ساڵ دوای ئەو قسانەی، ئەحمەد نەجدەت سیزەر بە سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا. زۆر کەس لەو باوەڕەدابوون کە ئەم هەڵبژاردنەی لە بەرانبەر سلێمان دیمیرێل لە ئەنجامی ئەو ڕاگەیاندنانەی بوو.

هەڵبژاردنی سیزەر هەناسەیەکی وەبەر لایەنگرانی چاکسازی لە تورکیا هێناوە. سیزەر لە کاتێکدا ئەو قسانەی کرد کە خەریک بوو دادگاییکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان دەست پێ بکا. کە بووە سەرۆکیش، سیزەر کەم سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا، ئەگینا فرە گرفتی ئابووری و سیاسی تووشی وڵاتەکەی هاتن. دەبێ باسی ئەوەش ژبیر نەکەین کە ئەو جۆرە دیموکرسییە پەرلەمانییەی لە تورکیادا هەس، فرە کەم دەسەڵات وە سەرۆکی وڵات دەدا و ئێستاش سوپای تورک هێشتا دەسەڵاتی هەرە باڵای وڵاتی لە بن دەستدایە.

**ئەدەب.** سەیری (وێژە) بکە.

**ئەرتەشی ڕزگاریی گەلی کوردستان (ئەرگک):** کۆنگرەی سێیەمی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٦ دایمەزراند. لەو کاتدا گەریلاکانی «پ. ک. ک» لە شاخ و دەشتەکانی کوردستانی باکور چالاکییان دەنوواند. ئەرگک لەگەڵ ئەرنک جیاوازیی هەبوو، ئەمەی دوایی لە ناوچە شارستانییەکان پرۆپاگەندەی بۆ «پ. ک. ک» دەکرد و چالاکیی خۆی ئەنجام دەدا.

ئەرگک هەرگیز ژمارەی جەنگاوەرەکانی لە ١٠,٠٠٠یان ڕەت نەدا. پێویست بوو ئەندامەکانی لە ڕیزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان ئەندام بن و یەکبەرگە -uni

form بپۆشن و بواری کارکردنیان له بواری ئەندامانی دیکەی «پ. ک. ک» توندتر و سەختتربوو. له دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵلا ئۆجەلان و شکستهێنانی خەباتی چەکدارانەی «پ. ک. ک»، ئەرتەشی ڕزگاریی گەلی کوردستان له تورکیا کشاوه و هات له کوردستانی باشوور له عێراق دالّدەی گرت و ناوی گۆڕا و بووه هێزی بەرگریی میللی. ئەم ناوگۆڕینەشی بۆ ئەوەبوو ستراتیژی تازەی «پ. ک. ک» ڕەوشەن بکاتەوه؛ کە تێکۆشانێک دەبێ بۆ ئەوەی مافەکانی گەلی کورد له تورکیایەکی دیموکراسیدا له ڕێی ئاشتییانەوه مسۆگەر بکا.

**ئەردەلان:** میرنشینێکی کۆنی کوردە؛ له سەدەی چواردەدا پانتاییەکی زۆری خاکی هەردوو بناری ناوەڕاستی شاخەکانی زاگرۆسی حوکم دەکرد. بەپێی شەرەفنامه، بابه ئەردەلان له نەوەی بنەماڵەی پایەبەرزی مەروانی کوردییه.

له مێژوویەکی تازەتردا، ئەردەلانییەکان هاوکات لەگەڵ بابانه نەیارەکانیان، هەموو خاکی ئەمدیوو ئەودیوی مەرزی ئێستای نێوان ئێران و عێراقییان له بن دەستدا بووه. له سەدەی نۆزدەدا، ئەردەلان پێوەندیی نزیکی لەگەڵ ویلاتی خۆراسانی ئێستای ئێران هەبووە؛ والییەکانی ئەردەلان کە پایەتەختیان له سنه (سەنەندەج) بووه، به ڕەچەڵەک ناوبانگیان به فره دڵسۆزی بۆ فەرماندارانی ئیمپراتۆریەتی فارسی دەرکردووه. ئەو شێوه فەرمانداریيه نا مەرکەزییەی پێشتر هەیان بوو، له خۆیانیان کەم کردەوه کەچی له پاش ئەوان سەفەوی و قاجارەکان پەیڕەویان کرد. زمانی ئەدەبی ئەردەلانی له بنەڕەتدا هەورامی بووەو ئەمەش شێوەزارێکی گۆرانه. ئەردەلانەکان مەتنێکی زۆری ئەدەبی کوردییان به دایالەکتی گۆران نووسیوەتەوه.

**ئەرمەنییەکان.** ئەرمەنییەکان گەلێکی کۆنن و زمانەکەیان زمانێکی هیندۆ ئەورووپییە و پێش له شەڕی یەکەمی جیهانی له ڕۆژهەڵاتی تورکیادا دەژین و تا ئێستاش هەر له چیاکانی قەوقازدا هەنه. له ٣٠١ د.ز. یەکەم نەتەوەبوون کە به فەرمی باوەڕیان به ئاینی مەسیحی christianity هێنا. له ئەرمینیا، پاپایەک سەرۆکایەتیی دێری گریگۆریی ئەرمینییان دەکا؛ کەچی نەیارێکی ئەو پاپایه، کە سیلیسی کاتۆلیکۆسییه له لوبنان دادەنیشێ. بەشێکی خاکی مێژوویی ئەرمەنییەکان لەگەڵ خاکی کوردان تێکەڵی یەکتر دەبن. لەگەڵ زەمان، خوێنی زۆر له

نێوان کوردە ڕەوەند و ئەرمەنییە نیشتەجێیەکان ڕژاوە. لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانی، ئەرمەنییەکان زۆریان بەدەستی تورکە عوسمانییەکانەوە چێشت؛ هەندێک بە جینۆسایدی دەزانن. دز و ڕێگرە کوردەکان ڕۆڵێکی ترسناکیان لەو ڕووداوانەدا گێڕا.

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی هەردوولا تورکیایان بە دوژمن بینی، بۆیە چینێکیان پێشنیازیان کرد کە ئەرمەنی و کورد هاوپەیمانێتییەک دژی تورکیا پێک بێنن. هاریکارییەکی کەم لە نێوان هەردوولادا پەیدا بوو. لە نێوان ١٩٧٣ تا ١٩٨٤، تێرۆریستە ئەرمێنییەکان نزیکەی ٣٠ دیپلۆماتی تورک و خزمە نزیکەکانیان تیرۆرکردن. لە ١٩٩١و لە دوای تێکشکانی یەکێتیی سۆڤیەت، ئەرمینیا سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و بووە دەوڵەت. پتر لە ٣ ملیۆن ئەرمێنی ئێستا لە ئەرمەنیادا دەژین و نزیکەی ٣ ملیۆن ئەرمەنیی تریش لە تاراوگە لە وڵاتانی پێشووی یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکان و فرەنسا و چەندین شوێنی دیکەدا دەژین.

**ئەڵمانیا.** سەیری (جەرمانستان) بکە.

**ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (میللی گوڤەنلیک کورولو).** گەلێ جار لە تورکیا کەس نییە قسە لە قسەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بکا. بۆیە ئەو ئەنجوومەنە بەردەوام گەورەترین سەرکوتکەری کوردی ئەو وڵاتە بووە و گەورەترین تەگەرە و کۆسپ لە ڕێی هەر جۆرە چاکسازییەک دادەنی و ناهێڵێ کێشەی پتر لە ١٥ملیۆن کورد لەوێ چارەسەر ببێ.

**ئەندییەکان** بنەماڵەیەکی کوردیبوون لە ساڵانی نێوان ٩٩١ تا ١١١٧ لە ناوچەکانی سنووری نێوان عێراق و ئێران گەشەیان کرد. ئەو ئەندییانە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە میرنشینەکانی سەردەمی بووەیهییەکاندابوون. ئەبولفەتح محەمەد بن ئەنەس بنەماڵەکەی دامەزراند و حوکمڕانی هەڵوانی کرد. هەڵوان کەوتبووە سەرەتای ئەو ڕێیەی بۆ دەشتی ئێران دەچوو. ناو و ناتۆرە عەرەبییەکانی زۆرینەی ئەندییەکان ئەوە دەگەیەنێ کە پێوەندییان لەگەڵ عەرەباندا بووە. ئەندییەکان مەیلەو شارستان بوونە و لەو کاتەی کە لە بن ڕەشماڵدا ژیاون، لە هەمان کاتیشدا، بۆ پاراستنی خۆیان، ئاوایییەکانیان سەنگەربەند کردووە.

**ئەنسارولئیسلام "أنصار الإسلام"**. واتای (پشتیوانانی ئیسلام) دەبەخشێ. ئەنسارولئیسلام ڕێکخراوێکە لە ٢٠٠١ لە ئەنجامی یەکگرتنی چەند گرووپێکی بچووکی ئیسلامی توندڕەوی کورد دروست بوو. ئەندامەکانی لە کورد و عەرەب و ئەفغانی پێکهاتوونە. لە سەرەتادا ناوی لە خۆی نابوو جوندولئیسلام "جند الإسلام"؛ واتە (سەربازانی ئیسلام) بەڵام ٢٠٠٢ ناوەکەی خۆی گۆڕی. گەلێک لەو باوەڕەدانە کە جند الإسلام پێوەندیی بە القاعدەوە هەیە. هیتریش هەنە مشتومڕ لەسەر ئەو پێوەندییە دەکەن و دەڵێن نییە. وا پێ دەچێ هەندێک لە ئەندامانی ئەنسار لە بنکەکانی ئەلقاعیدە، لە ئەفغانستان مەشقیان کردبێ. وڵاتە یەکگرتووەکان پاگێندەی ئەوە دەکا کە ئەنسار یارمەتیی دارایی لە ئەلقاعیدە وەرگرتووە و ڕاهێنانی لەسەر گازی ڕایسین کردووە.

ئەم گرووپە لە ناو شاخەکانی نزیک هەڵەبجە لە تەنیشتی سنووری ئێران دامەزرا. لە دوای تاڵیبانەکانی ئەفغانستان، ئەنسار خۆی تازەکردەوە و پەیڕەوی لە توندترین ڕێبازی پارێزگاریی ئاینی کرد و پشتیوانیی تیرۆر و شەڕی دژی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کرد. لە پاییزی ٢٠٠١ شەڕی خوێناوی لە نێوان هەردوولادا قەوما و هەمان شێوەی شەڕی قورس لە پاییزی ٢٠٠٢ش دووبارە بووەوە. ئەنسار تەرمی هەندێ لەو کەسانەی پەلپەل کرد کە کوشتبوویانی و لە نیسان هێندەی نەمابوو، بەرهەم ساڵح سەرۆک وەزیرانی ئیدارەی «ی. ن. ک» لە سلێمانی، بکوژن. لە شوباتی ٢٠٠٣، بە خیانەت شەوکەتی حاجی موشیری ئەندامی «ی. ن. ک» یان کوشت، کوشتنەکەشی لە کاتێکدا بوو کە چووبوو دانوستانیان لەگەڵدا بکا.

ئەنسارولئیسلام ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانی وەک تەلەڤیزیۆن و ڕادیۆی قەدەغە کرد و بەزۆرەملێ ڕیشی بە پیاوان بەرداوە و ژنانی ناچارکردن کە عەبای سەرتاپا بپۆشن و ڕووخساریشیان بشارنەوە. مەلا کرێکاری سەرکردە و دامەزرێنەری لە سێپتێمبەری ٢٠٠٢ لە هۆڵاندە گیرا. لەدوای ئەو مەلا محەمەد حەسەن بووە سەرۆکی تازەیان. ئەو گرووپە ئەنجوومەنێکی واتا ڕاوێژکاریی هەیە کە لە ١٥ ئەندام پێک هاتووە.

**ئەنفال "الأنفال"**. شاڵاوەکانی ئەنفالی ١٩٨٨ زنجیرەیەک هێرشی سەربازی بوو بە

مەبەستی قڕکردنی ئەو کوردانەی عێراق کرا کە بە قسەی بەرپرسانی ڕژێمی بەعس، لەمیانی شەڕی ئێران- عێراق (١٩٨٠- ١٩٨٨) پشتیوانیی ئێرانییان کردبوو. عەلی حەسەن مەجیدی پسمامی سدام، سەرکردایەتیی شاڵاوەکانی کرد. لە کاتی کردەوە سەربازییەکانی ئەنفال ١٨٠,٠٠٠ کەس بێ سەروشوێن کران و لە ناو ژمارەیەکی زۆری گۆڕی بەکۆمەڵ ناژران. لە ئەنفال چەندین هێرش بە چەکی کیمیایی کرانە سەر کوردستانی عێراق؛ شاری هەڵەبجە لە ١٩٨٨دا بە گازی ژاراوی بۆردومان کرا. لە نێوان ٢٠٠٠- ٣٠٠٠ گوند خاپوور کراون ژمارەیەکی زۆری کوردیش لە خاکی خۆیان دەرکران و لە بانشگەی گوندە هاوچەرخەکاندا ئاخنران، یانیش ڕەوانی باشووری عێراق کران. لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١، هەزاران بەڵگەنامەی فەرمیی عێراقی تایبەت گیران؛ هەموو گەڤاهی لەسەر ئەو کوشتن و قەسابخانانە دەدەن. دۆکیومێنتەکان گواسترانەوە بۆ وڵاتە یەککگرتووەکان و لەوێ لە زانکۆی کۆلۆرادۆ University of colorado لە بۆڵدەر تەقەت کراون. هیومەن ڕایتس وۆچ / ڕۆژهەلاتی ناڤین، هەندێ لەو بەڵگەنامانەی کردە ئینگلیزی و بڵاوی کردنەوە. زاراوەی (ئەنفال) لە قورئان وەرگیراوە، ناوی سوورەتی هەشتەمینە و مانای (پاتاری شەڕ - تالان) دەگەیەنێ. عێراقییەکان بۆیە ئەو زاراوەیان بەکارهێنا تا ڕەوابەندییەکی دینی بە کردەوەکانیان بدەن و قڕکردنی کورد بەپێی دینی ئیسلام حەڵاڵ بکەن.

**ئەنیا ڕزگارییا نەتەوەییا کوردستان (ERNK).** لە ئاداری ١٩٨٥ دامەزرا. ئەرکی ئەوەبوو ببێتە دەروازەیەکی جەماوەریی «پ. ک. ک» و پرۆپاگەندەشی بۆ بکا. بۆیە ئەنیا ڕزگارییا ناڤاتا کوردستان، بەزۆری چالاکییەکانی لە ناو شارەکان بوو و هانی گەنجانی دەدا تا پێوەندی بە «پ. ک. ک» وە بکەن و خۆیان لە سوپایەکەی (سوپای ئازادیی گەلی کوردستان) ناونووس بکەن و چالاکییەکانی «پ. ک. ک» لە شێوەی خۆپیشاندان ڕێک بخەن و پارە و زانیاری بۆ کۆ بکەنەوە و پێوەندی بە «پ. ک. ک» بکەن و بە مەبەستی پرۆپاگەندەکردن بۆ «پ. ک. ک» بچن نوێژ بکەن و بە ڕۆژی بن و یارمەتی بۆ لەشکری ئازادی مسۆگەر بکەن و شارستانەکان لە ناو ڕیزەکانی «پ. ک. ک»دا ڕێک بخەن.

لە ئەوروپا، ئەڕنەک، پێوەندیی بەئەندامانی «پ. ک. ک» لە هەندەرانەوە کرد و لە پڕۆپاگەندە بەشداریی کرد و خۆنیشاندانی ساز کرد بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵک بۆ کێشەی «پ. ک. ک» ڕابکێشی و ئەندامی نوێشی بۆ ئەرنک پەیدا کرد و جەنگاوەرەکانی ئەرتەشی ڕزگاریی حەشاردان. لە وڵاتە یەکگرتووەکانیش تۆڕی زانیاریی کوردی ئەمریکی AKIN بەڕادەیەکی کەمتر هەمان ئەرکی ئەرنکی ڕاپەڕاند.

هەرچەندە ئەندامانی ئەرنک، دەیانتوانی شەڕ بکەن و هەندێ جاریش بەڕاستی لە بەرەنگاربوونەوەکان بەشداربوون، بەڵام هەرگیز وەک ئەرتەشی ڕزگاری، یەکبەرگەیان لەبەر نەکرد. ئەندامانی ئەڕنەک، بە ڕۆژ لە چێشتخانە و دووکان و کێڵگەکان کاریان دەکرد و دەچوونە بەر خوێندن. لە ساڵە هاتەکانی کە لە درەنگی ۱۹۸۰کان دەستی پێ کرد و هەتا ناوەڕاستی ۱۹۹۰کان بەردەوام بوو، ئەڕنەک بە فەرمی ۵۰,۰۰۰ ئەندام و ۳۱۵,۰۰۰ هەواداری هەبوو. لە دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان۱۹۹۹، ئەڕنەک هەڵوەشاوە. لە دوای ئەو، ڕێکخراوێکی تر بە ناوی یەکێتییا دیموکراتییا گەلێ کورد دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە پتر لە ناوەندەوەڕا فەرمانداری دەکرا.

**ئەهلی هەق (هەقپەرستان - ڕاستی ناسان).** ئاینێکی ڕەسەنی کوردییە و تا ئێستاش لە کوردستانی عێراق و ئێراندا ماوە و لە کەمینەکیان بترازێ، ئەوەی دیکەی هەموو بە زاراوەی گۆران بەستراونەتەوە. بە کاکەیی و یارسانیزمی و عەلی ئیلاهی (ئەوانەی عەلی بە خوا دەزانن) دەناسرێ. لە زۆر لە نەریتە ئاینییەکانیان لەگەڵ عەلەوی و ئێزیدییەکان یەک دەگرنەوە. ڕیاکاری dissimulation (تقوية- شیعەکان بەکاری دێنن) ئەوە دەکەن تا سەر لە نەیارەکانیان بشێوێنن و خۆیان بپارێزن و ئەمەشیان زۆر لە ڕێبازی شیعە دەکا. گڵکۆی سەرەکیی ئەهلی هەق لە بابە یادگار، لە لایەنی کوردە شیعەکانیشەوە بە پیرۆز دەناسرێ. سەیری (غولات) بکە.

**ئەولیا چەلەبی (١٦١١-١٦٨٥).** گەڕیدەو نووسەرێکی عوسمانی بوو، کتێبی "سیاحەتنامە"ی نووسیوەتەوە، کە بە یەکێک لە باشترین سەرچاوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و کولتووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەدەی

١٧ دەژمێردرێ ١٦٥٥و ١٦٥٦ چەلەبی سەردانی گەلێک ناوچەی کوردستانی کردووە (بەتایبەتیش بتلیس) و تێبینیی چڕوپڕی دەربارەی هەر شتێک نووسیوەتەوە کە چاوی پێی کەوتووە.

**ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکور Operation Northern Watch**. لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی لەمیانی شەڕی براکوژیی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەسەر ناوچەکەدا هات، ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن ڕاگیرا و فەرەنسا لە پرۆسەکە وەدەرکەوت و ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکور لە ١ی یەنایری ١٩٩٧، لە شوێن ئەو دەست پێ کرا.

**ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن Operation provide comfort**. زاراوەی ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی گەلی کورد لە ئاداری ١٩٩١، پەیدا بوو. زاراوەکە ئاماژە بۆ ئەو پرۆسەیە دەکا کە ولاتە یەکگرتووەکان، سەرکردایەتیی کرد و پەنابەرانی کوردی هان دا تا بۆ شوێنەکانی خۆیان، بگەڕێنەوە. ولاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانان ناوچەی نەفڕینیان لە ئاسمانی کوردستانی باشوور دامەزراند. لە سەرەتادا ناوی ئۆپەراسیۆنی چەکوچی ئامادە Operation Poised Hammer. بنکەی ئۆپەراسیۆنەکەش لە کوردستانی باکور (تورکیا) بوو.

لە دوای ئەو پێشنیازەی تورگۆت ئۆزالی سەرۆکی تورکیا پێشکێشی سەرۆکی فەرەنسی، فرانسوا میتران و سەرۆک وەزیرانی بەریتانی، جۆن مێجەری کرد، ئۆپەراسیۆنەکە لە ٥ی نیسانی ١٩٩١دا دەستی پێ کرد. ئەرکی بنەڕەتیی پرۆسەکە، پێشکێشکردنی یارمەتیی مرۆیی هەنووکەیی بوو کە دەبوو پێشکێشی ئەو پەنابەرە کوردانەی بکەن کە ماڵەکانی خۆیانیان لە ترسی تۆڵەسەندنەوەی سەدام حوسێنی بەجێ هێشتبوو و لە شاخەکان، لەسەر سنوورەکانی تورکیا و ئێران بەو سەرمایە گیر بووبوون. کۆڕەو لە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕین بوو. کە هێزەکانی سەدام حوسێنی لە شەڕی کەنداوی ١٩٩١، لە کوێت دەرکران و ئاگربەستی لەگەڵ هاوپەیمانان مۆر کرد، ئیتر پەلاماری جەماوەرە ڕاپەڕیوەکەیان دا و کۆڕەوی لێ کەوتەوە. لە ئایاری ١٩٩١، ولاتە یەکگرتووەکان، ١٢,٠٠٠ سەربازی خۆی بۆ یارمەتیدانی پەناهەندە کوردەکان نارد. ژەنراڵی ئەمریکی ڕیچەرد م. ناب، ڕۆڵێکی

دیاری لە گەیاندنی یارمەتییە مرۆییەکاندا هەبوو.

ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن بە فەرمی تا ١٩٩٦ بەردەوام بوو. بۆ پاراستنی ناوچەکەش ٨٠ فڕۆکەی جەنگی ئەمەریکی لە بنکەی سەربازیی ئەمەریکی لە ئەنجەرلیک لە باشووری ویلایەتی ئەدەنە لە تورکیا لە ئامادەباشیدابوون. لەوێوەڕا ڕۆژانە چەند جارێک بە ئاسمانی دژە فڕین بەسەر کوردستاندا دەفڕین و هەمیشە گەفیان لە هێزەکانی سەدام حوسێن دەکرد نەکەن پەلاماری هەرێمی کوردستان بدەن. هەر شەش مانگ جارێک پەرلەمانی تورکی، ماوەی مانەوەی هێزەکانی هاوپەیمانانی لە تورکیا، بۆ پاراستنی هەرێمی کوردستان، تازە دەکردەوە. ناوەندێکی ڕێکخستنی کاروباری سەربازیی بچووک لە زاخۆ بنکەی هەبوو. ئەو ناوەندە چاودێریی جموجۆڵی سەربازیی ڕژێمی عێراقی دەکرد. چەند هەزار کوردێک بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی مرۆیی و سیخوڕیش لەو هەرێمەدا بەکرێ گیرابوون. وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیاو فەرەنسا سێ لایەنی سەرەکیی بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆنەکە بوون.

بابەتی مانەوەی ئەو هێزانە لە تورکیا، بووە کێشەکی سەرەکیی وڵات؛ چونکە زۆر لە تورکەکان لەو باوەڕەدابوون کە بۆشاییەک لە باشووری کوردستان دروست دەکا و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە «پ. ک. ک» بتوانێ لەوێ بنکە و بارەگاکانی دابمەزرێنی و بەهێزیان بکا. تەنانەت هەندێ لە تورکە ڕەگەزپەرستەکان لەمەش پتر ڕۆیشتن و گوێبەندی ئەوەیان لێ دەدا کە ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن دەقی پەیماننامەی سیڤەر نوێ دەکاتەوە و ڕەنگە دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ لە باکوری عێراق دابمەزرێنێ. مشتومڕی ئەوەش هەبوو کە کاتێک تورکیا ڕێگەی بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن دەدا، بەو کارەی، بۆ خۆی جۆخینی خۆی دەسووتێنێ. بەڵام ئەگەر ڕێگەیان لە بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیۆنەکە بگرتایە، دەیانزانی کە دەبوو لە شوێنێکی دیکەوەڕا بەڕێوە بچی و بەم چەشنەش، تورکیا هیچ هەلێکی بەدەستەوە نەدەما بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری هەرێم وەربدا. لە ڕاستیشدا، ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن، زانیاریی زۆر بەهاداری سەبارەت بە جموجۆڵی «پ. ک. ک» لە بەردەستی تورکیا دانا و ڕێگەشی بە تورکان دا بۆ ئەوەی تا ڕادەیەکی زۆر دەست لە

کاروباری هەرێمی کوردستان وەربدەن.

لە دوای ڕووداوەکانی ١٩٩٦، دەستە سەربازییە بچووکەکەی هاوپەیمانان، ئەوەی لە زاخۆ جێگیر بوو، لەوێ دەرکەوت بۆ تورکیا چوو، یارمەتییە مرۆیییەکانیش کە بۆ دانیشتوان پێشکەش دەکران، ڕاگیران. فەرەنسا لە ئۆپەراسیۆنەکە کشاوە و ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکور بەڕێوەچوو، بۆ ئەوەی لە ١ی یەنایری ١٩٩٧ـەوەڕا ناوچەی نەفڕین بپارێزێ.

**ئۆزال.** سەیری (تورگۆت ئۆزال) بکە.

**ئۆزال حەرەکەت تیم.** سەیری (دژە گەریلا) بکە.

**ئۆزگورلوک یۆلو.** سەیری (پارتی سۆشیالیستی کوردستان) تورکیا، بکە.

**ئۆهال.** سەیری (یاسای نائاسایی) بکە.

**ئۆیل.** سەیری (نەوت) بکە.

**ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤- ٢٠٠٠).** بۆ ماوەیەکی درێژ بەربەرەکانێی مەلا مستەفا بارزانی کرد و خەزووری جەلال تاڵەبانی و ڕاوێژکارێکی کارامەی سیاسیشی بوو. لە کۆلێژی یاسای زانکۆی بەغداد دەرچووە و لێکۆڵینەوەی بڕوانامەکەی دەربارەی پێوەندیی کورد و عەرەب لە ١٩٣٧دا بڵاو کردەوە. هەرچەندە - وەک زۆر لە ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەو سەردەم- مێچکەمێچکی لەبەر شیوعییەکان کرد و بە گومانی چالاکیی ناو حزبی شیوعی لە ١٩٥٠کاندا، سێ ساڵی تەمەنیشی لە زیندان ڕابوارد، بەڵام دەشێ ئیبراهیم ئەحمەد، پتر بە کوردێکی نەتەوەپەرستی چەپڕەو بناسرێ.

ماوەیەکی کەمی لێ دەرچێ، ئەویتر هەموو هەر لە ١٩٥٣ تا ١٩٦٤، سکرتێری گشتیی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. هاوڕێ لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، ئیبراهیم ئەحمەد، لە ساڵانی شەستەکاندا، سەرکردایەتیی باڵێکی چەپڕەوی ڕووناکبیرانی مارکسیی ناو پۆلیتبیرۆی «پ. د. ک» یان کرد و دژی باڵە پتر پارێزگارە نەریتییەکەی بارزانی یاخی بوون. هەرچەندە دواتر هزرەکەی لەلایەن تاڵەبانییەوە کە لەو گەنجتر بوو، وەرگیراو لە ١٩٧٥، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی (ی.ن.ک) دامەزراند، بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد لە کۆتاییدا بەزی. ئیبراهیم ئەحمەد بۆ ماوەیەکی

درێژ لە بانشگە لە لەندەن ژیاو لەوێڕا چالاکانە بۆ کورد تێ هەڵچووەوە و تا ڕۆژی مردنی وەک کوردێکی پیری ڕێزداری نەتەوەپەرست، خەمی کێشەی کوردی لەبەر بوو.

**ئیبراهیم پاشای میلان (؟-١٩٠٨).** لە ١٨٦٣دا، سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنی میلان بوو. ئیبراهیم پاشای میلان، بە پەلە لەو شوێنەی کە ئێستا باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیایە، کۆنفیدراسیۆنەکەی دووبارە دروست کردەوە و کردییە هێزێکی گەورە. ئەم ئیبراهیم پاشایە ژەنراڵ ئیبراهیم پاشای میسری نییە کە لە سەرەتای سەدەی ١٩دا، هەڕەشەی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد. ئەم ئیبراهیم پاشایە هێندە دڵسۆزی سوڵتان بوو کە سوڵتان کردییە سەرکردەی جاشەکانی حەمیدییە.

کە تورکانی گەنج (تورکە گەنجەکان) لە ١٩٠٨، سوڵتانیان لەسەر حوکم لادا، ئیبراهیم پاشا یاخی بوو، بەڵام بەزی. پاشان بە ماوەیەکی کورت بەزگیدا. نووسەرانی تورک و نووسەرانی تریش بە مەلیکی کوردستانی بێ تاجی دەناسن. محەمەدی کوڕیشی کابرایەکی خودان دەسەڵات بوو.

**ئیبراهیم تاتلیس (١٩٥٢-    ).** گۆرانیبێژیکی میللیی زۆر ناوداری تورکییە. لە ئورفە بە کوردی لە دایکی بووە. لە کۆتاییی هەشتاکان لە ئێوارە ئاهەنگێکی کوولتووری لە ئوساک لە تورکیا، داوایان لێ کرد بە کوردی سترانێک بێژێ. ئەویش نکووڵی لێ کرد و گوتی: "ئەز کوردم، وەلێ ئەز دبێژم کو قانوون نە ڕێگە دەدا ئەز بە کوردی یێ ستران بێژم." پاشتر بە گومانی (پڕۆپاگەندەی جوداخوازی) دادگایی کرا. هەرچەندە تاوانبار نەکرا، بەڵام ئەم کردەیە ڕوونی کردەوە کە تا چ ڕادەیەک هاووڵاتییانی کورد لە تورکیا بە هۆی جیاوازیی کولتوورییانەوە چێشتوویانە و دەچێژن.

**ئیبراهیم قاپقایا.** کوردێکی عەلەوی چەپڕەوی شۆڕشگێڕ بوو لە شەستەکان، دەڤ گەنج پێی گەیاند. قاپقایا سەرکردەی سوپای ڕزگاریخوازی پاڵە و جووتیارانی تورک (تورکیا ئیشجی کۆیلو کورتولوس ئۆردوسو) بوو. پاشان سوپایەکە پارتی کۆمۆنیستی مارکسیستی - لێنینستی تورکی دامەزراند. هەرچەندە قاپقایا لە سەرەتای حەفتاکاندا کوژرا، بەڵام سوپای ڕزگاریخوازی پاڵە و جووتیارانی تورکی

بەردەوام ڕۆڵێکی سەرەکیی لە ئەنجامدانی ئەو کردەوە تێرۆریستییە توندوتیژانەدا گێڕا کە بەر لە کودەتایە سەربازییەکەی ١٩٨٠، تورکیای دووچاری مەرگەسات کردبوو. وا مەزەندە دەکرا کە حکوومەتە سەربازییەکە بڕبڕەی پشتی سوپای ڕزگاریخوازی پاڵە و جووتیارانی تورکی شکاندبێ، بەڵام سوپایەکە لە کۆتاییی هەشتاکاندا بەدەرکەوتەوە و بەزۆری لە ناوچەی شرناخ چالاکییەکانی خۆی دەکرد.

**ئیدریس بارزانی (١٩٤٤- ١٩٨٧).** کارە هەرە گەورەکانی کە ئیدریس بارزانی ئەنجامی دا ئەوە بوو بە شێوەیەکی کارامە توانی ڕیزی لایەن و گرووپ و پارتە کوردستانییەکان لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانیدا کۆ بکاتەوە و شەڕی براکوژیی نێوانیان بۆ دوواجار لە شاخ بوەستێنێ. ئیدریس بارزانی کوری پێشەوا مەلا مستەفا بارزانی بوو. لە دوای نسکۆی بارزانیی گەورە، لە ١٩٧٥و مردنی لە ١٩٧٩دا، ئیدریس و مەسعوود بارزانیی برای، وێکڕا سەرۆکایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستانیان کردو بەسەر پێیان خستەوە. ئیدریس ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کە پیاوێکی عیلمانی و زیرەک و بەڕێز و نەریتپەروەر traditionalist بوو. لە١٣ی یەنایری ١٩٨٧، کتوپڕ دڵی ڕاوەستا و دواماڵئاوایی کرد و لە دوای ئەو مەسعوود بارزانی سەرۆکایەتیی بنەماڵەکە و پارتەکەشی وەرگرت. کورد دەڵێن ئیدریس بارزانی وجاغی زۆر ڕوونە؛ چونکە کوڕێکی وەک نێچیرڤان بارزانی، سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی هەیە.

**ئیدریس بتلیسی (؟-١٥٢٠).** ئیدریس بتلیسی گەورە زانا و دیپلۆماتێکی کورد بووە، ناوبژیوانیی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و میرنشینە کوردەکانی کردووە و بەمجۆرە کە لە سەرەتادا دەوڵەتی عوسمانی خەریک بوو بەرفرەوان دەبوو، بە هۆی ناوبژیوانی ئیدریسی بتلیسی، بێ شەڕ هەموو میرنشینەکان لە سەدەی ١٦مدا، کەوتنە بەر دەستی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانییەوە.

سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠) دەسەڵاتی بەئیدریسی بتلیسی دا بۆ ئەوەی بە دڵی خۆی پۆستی گەورە بە بنەماڵە خانەدانە کوردان بدا و ڕێیان بۆ خۆش بکا تا دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان لەو ناوچانەی کوردستان بسەپێنن کە تازە عوسمانییەکان داگیریان کردبوو. لەبری ئەو دەسەڵاتەی عوسمانییەکان بە

کوردەکانیان بەخشی، کوردەکانیش قایلبوون کە دان بە دەسەڵاتی فەرمی عوسمانییەکان بە سەر کوردستاندا بێنن. جا پاشتر، نزیکەی ١٦ حکوومەتی (میرنشینی کوردی) دروستبوون و بە فەرمیی دانیان پێدانان. ئەو حکوومەتە کوردییانە نزیکەی ٣٠ لە سەدی سەرجەم خاکی کوردستانیان بەڕێوە دەبرد. هەندێک لەو حکوومەتانە تا ناوەڕاستی سەدەی ١٩م مابوونەوە.

ئەو ناوچانەی تر کە میرنشینیان نەبوو، دابەشی ٢٠ سنجەق، واتا ناوچەی بەڕێوەبەرێتی. هەندێک لەو سنجاقانە کوردە ناسراوەکانی وەک سەرۆک هێزەکان، حوکمیان دەکرد و ئەوانی تریش فەرمانداری تازەیان بۆ دامەزرا. زۆربەی ئەو میرنشین و سنجاقانە گەلێ جار باجیان لێ وەرنەدەگیرا، بەڵام کە دەوڵەت پێویست دەبوو دەهات و باجی لێیان دەستاند. هەمیشە پارسەنگی هێزە سەربازییەکانی ئەو میرنشینانە لە بەرچاو دەگیرا. هەرچەندە نە حکوومەتی ناوەندی و نە دەسەڵاتدارە کوردەکان پڕ بەدڵ لە گۆڕانکارییەکان دڵنیا نەبوون، بەڵام تواناکانی ئیدریسی بتلیسی لە بواری ڕێکخستنی سیاسیدا، تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتنی وەدەست هێنا. لە ١٥١٥ش، ئیدریس بتلیسی دیسان سەرکەوتنێکی سیاسیی گەورەی بەدەست هێنا، چونکە توانیی شەش مانگ بەرگری لە ئامەد بکا؛ فارسەکان گەمارۆی تەواویان دابوو، بەڵام نەیهێشت داگیری بکەن. لە ئەنجامدا خۆی ماردین و چەند شارێکی تری لە کوردستانی باکور لە بن دەستی فارسەکان ئازاد کرد. ئیدریسی بتلیسی لە هەموو ئەو شەڕانەیدا، بەزۆری هێزەکانی کوردی ڕەوانی مەیدان دەکرد. ئیدریس لە کتێبە مێژووییەکەی "هەشت بەهەشت"، باسی سەردەمی هەشت سوڵتانی عوسمانی دەکا؛ لە سوڵتان عوسمان تا سوڵتان بایەزیدی دووەم، باس دەکا و بە قەشەنگترین شێوەی زمانی فارسی نووسراوەتەوە.

**ئیسرائیل.** بەهۆی هەڵوێستی نامۆی لە ناو جیهانی عەرەبی و بەتایبەتیش لە ترسی ئەو هەڕەشانەی عێراق لە ئیسرائیلی دەکردن، ئیسرائیل لەمێژە دەیەوێ خۆی تێکەڵی کێشەی کورد بکا و مەبەستیشی لەو کارەی تەنیا ئەوە بووە نەختێک لەو مەترسییانە کەم بکاتەوە کە عەرەب بۆ ئیسرائیلیان هەیە. خۆ تەنانەت بەر لە دروستبوونی ئیسرائیلیش، ئاژانسی جوولەکە Jewish Agency لە بەغدا چالاکیی

خۆی هەبوو. لەوێوەڕا، ڕۆڤێن شیلۆح، کە پاشتر دەزگای هەواڵگریی ئیسرائیلی دامەزراند، خۆی کردە ڕۆژنامەنووس و بەناو شاخەکانی کوردستاندا ڕۆیشت و لە ١٩٣١، لەگەڵ کورد کاری کرد تا بەمەبەستی پتەوکردنی ئاسایشی جوولەکە و پاشانیش هی ئیسرائیل (تێگەیشتنێکی دەرەکی) پەیدا بکا. زۆربەی کوردە جوولەکەکان لە دوای دامەزراندنی ئیسرائیل لە ١٩٤٨، کۆچیان بۆ ئەوێ کرد. ئیسحاق مۆردەخای، کە لە نەوەدەکان وەزیری بەرگریی ئیسرائیل بوو، لەسەر لیستی لیکود، یەکێک لەو کوردانە بوو.

لە شەستەکان سوپای ئیسرائیلی مەشقی بە پێشمەرگە دەکرد، بۆ ئەوەی لەو هەڕەشانە کەم بکاتەوە کە عێراق لە دەوڵەتی جوولەکەی دەکردن و بۆ ئەوەش یارمەتیی جوولەکە عێراقییەکان بدا تا بتوانن لە عێراق دەرچن و بچنە ئیسرائیل. ئەم ئۆپەراسیۆنی مەشق پێکردنە ناو-کۆدی مارڤاد (مافوور)ی لێ نرابوو. هەڵاتنە بەهادارەکەی ئەو فڕۆکەوانە عێراقییەی لە ئابی ١٩٦٦، مێگێکی بۆ ئیسرائیل برد، بە یارمەتیی کوردان ئەنجام درا. دەشڵێن ئەفسەرانی ئیسرائیلی بوون کە لە ئایاری ١٩٦٦، یارمەتیی مەلا مستەفا بارزانییان دا بۆ ئەوەی سەرکەوتنەکە گەورەکەی هەندرێن لەسەر بەغداد، تۆمار بکا.

لە سێپتێمبەری ١٩٦٧، بارزانی سەردانی ئیسرائیلی کرد و لەگەڵ مۆشێ دایانی وەزیری ئەو کاتی بەرگریی ئیسرائیل کۆبووەوە. مۆسادی ئیسرائیلی و ساڤاکی ئێرانی یارمەتیی پارتییان دا تا دەزگایەکی موخابەراتی دابمەزرێنی و ناوی پاراستن بوو. لە کاتی شەڕی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، لە ١٩٧٣، شۆڕشڤانە کوردەکانی بارزانی سوپای عێراقیان بەستەوە، ئەگەر نا، ڕەنگ بوو دژی ئیسرائیل بەکار بهاتبایە.

لە ١٩٦٦، ئیسرائیل و تورکیا هاوپەیمانییەکیان لە نێوان خۆیان دروست کرد، ئەمەش هاوسۆزیی کوردی لەگەڵ ئیسرائیل تا ڕادەیەکی زۆر، کەم کردەوە. زۆربەی کورد لەو باوەڕەدانە کە دەزگای هەواڵگریی ئیسرائیل، یارمەتی تورکیای دا بۆ ئەوەی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان، لە شوباتی ١٩٩٩، لە کینیادا، بگرێ.

**ئیسلام.** ئیسلام کە واتای (ملکەچبوون بۆ خودا) دەبەخشێ، یەک لەو سێ ئاینە

تاک پەرستە سەرەکییانەی دنیایە. محەمەد پێغەمبەر (د.خ) (٥٧٠-٦٣٢)، کەسایەتییەکی عەرەب بووە. لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا سروشی بۆ هاتووە. یەک لە پێنج کۆڵەگەکانی ئیسلام شەهادەی "أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محەمەدا رسول الله" یە. ئەم بنەما سادە و پاراوە، نهێنیی ئەو سەرکەوتنەیە کە ئیسلام بە سەر ئاینی مەسیحییەت و چەندین باوەڕی کۆنی دیکەدا بە دەستی هێنا. کریستیانەتی پابەندی چەندین بیرۆکەی خودا پەرستییە کە هیچیان ئاشکرا و سادە نینە. پاشتر، لە ڕۆژهەلاتی ناڤین، ئیسلام بە پێش هەموو ئاینەکانی دیکە کەوت.

لەمیانی یەکەم شەپۆلی بلاوەکردنی ئیسلام، لە دوای ٦٤٠، زۆرینەی کورد ئیسلامبوون. بۆیە ئیسلام ڕەگی قووڵی لە ناو هەموو لایەنەکانی کولتوور و کۆمەڵی کوردەواریدا داکوتاوە و تەنانەت کاری لە ناسنامەی نەتەوەیی کوردیش کردووە. کوردە سوننەکان پەیڕەوی ڕێبازی سۆفییاتی دەکەن و بەمەش لەو سوننە تورک و سوننە عەرەبانە جودا دەکرێنەوە کە پەیڕەوی ڕێبازی حەنەفی دەکەن. هەردوو تەریقەتی نەقشبەندی و قادری، لەلای خۆیانەوەڕا، ڕۆڵی ئاینی و سیاسیی گرینگیان لە ناو کوردەواریدا گێڕاوە. لە ڕاستیدا نزیکەی هەموو سەرکردە سیاسییە گەورەکانی سەدەی بیستەم، وەک (شێخ مەحموودی بەرزنجی و شێخ سەعید و مەلا مستەفا بارزانی و مەسعوود بارزانی کوڕی و جەلال تاڵەبانی و هیتریش) هەموویان لە سەرەتای ژیانی سیاسییاندا قەرداری ئەو پشتیوانییەن کە سۆفییاتی لێی کردن. شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە دەسپێکی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەدا، هەمان ڕێبازی گرت بوو. عەبدوڵڵا ئۆجەلان (ئاپۆ)ی سەرکردەی پارتی کرێکارانی کوردستان، ڕەنگە یەکێک لەو سەرکردە دەگمەنانە بێ کە بە ڕەچەڵەک پێوەندیی بە سۆفییانەوە نەبێ. خۆ تەنانەت «پ. ک. ک» کە زۆر عیلمانییە، لە دوا ساڵانی هەشتاکاندا، بنەما ئیسلامییەکانی پەیڕەو کرد و دوو دەزگای ئیسلامیی دامەزراند؛ یەکەمیان یەکێتیی کەسە موسڵمانەکان و ئەوی دیکەیان یەکێتیی ئیمامە وڵاتپارێزەکان بوو.

هەرچەندە ئیسلام گرینگایەتی بۆ ناسنامەی کورد هەبووە، بەڵام هێشتا ڕەنگە ئاینە دیرۆکییەکانی پێش ئیسلام کە تا ئێستاش هەر ماون، تەگەرەیان لە سەرتاسەری کوردستان دروست کردبێ. چونکە هەردوولا بە شێوەی دژەوەرانە

(متناقض) کاریان کردەوە؛ واتە هەرچەندە کوردەکان توندتر ڕێبازی سوننەیان گرتووە، لە بەرانبەریان ئەوانەی لەسەر دینە هەرتەقییە کۆنەکانی تری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بووینە، وەکو عەلەوییە قزڵباشەکان و ئەهلی هەق (یارسانە)کان و ئێزیدییەکان و ئەوانی دیکەش، توندتر دینەکانی خۆیانیان پاراستووە. هەرچەندە کورد هەمیشە ویستوویانە لەلای دینداریيانەوە نەرم بن، بەڵام هێشتا هەندێکیان هەر خۆ هەڵکێشانێک دەکەن. لەم بارەیەوە پەندێک هەیە دەڵێ: "ئەگەر لەگەڵ کافران بەراوردیان بکەین، کورد موسڵمانی چاکن." ئەم پەندە ڕەنگدانەوەی ئەم بارودۆخەیە.

ئەمڕۆش پارتە کوردییە گەورەکانی وەک پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان، بە ڕاشکاوی پەیڕەوی بنەمای سێکۆلاری دەکەن. لە دووبەرەکیی نێوان خۆیان بترازێ، لە کوردستان ئەو پارتانە تەنیا ئیسلامییەکان ڕکابەرییان لەگەڵدا دەکەن. هەندێ لەو گرووپە ئیسلامییانەی وەک کۆنتراکانی حزبوڵڵا لە تورکیا و ئەنسارولئیسلامیش لە عێراق، لە ڕادەبەدەر توندوتیژن.

هەرچەندە ناکرێ ژمارەیەکی ڕاست بدرێ، بەڵام ڕەنگە نزیکەی ٧٥ لە سەدی کورد، موسڵمانی سوننەبن و ١٥ لە سەدیان کە لە ناوچە کوردییەکانی لە ئێراندا دەژین، شیعە بن. ئەوانی تریشیان سەر بەو هەرتەقیانەی ترن کە لە سەرەوە باس کراون. ئەم ژمارانە تەنیا نزیکبەند"تقریبی"ن و هەندێ لە بەرپرسان لەو باوەڕەدانە کە ژمارەی ئەو هێتێرۆدۆکسانە زۆر لەو ڕێژەیە فرەترە. لە ڕابردوودا ئەم گرووپە هێتێرۆدۆکسانە ڕێژەیەکی دیاری کۆمەڵگەی کوردەوارییان پێک دێنا. هەندێ شیعە و هەندێکیش لەوانەی هێشتا هەرتەقیترن باوەڕەکانیان تێکەڵ و پێکەڵی یەکتری دەبن.

چونکە کورد کەوتوونەتە ناو جەرگەی مسوڵمانانی عەرەب و تورک و فارس و لێکیان جودا دەکەنەوە؛، بۆیە فرە کەڕەت زانایە کوردە موسڵمانەکان بوونەتە پرد و قوتابخانە جوداکانی دنیای ئیسلامیان بەیەک گەیاندووە. جێ پەنجەی زانا کوردەکان زۆر بە ڕاشکاوی لە گەشەکردنی ئاینی ئیسلامدا دیارە. لەم بارەیەوەش هێندەی داوی سەری مرۆڤ نموونەی زیندوو هەنە. بۆ وێنە؛ مەلا گۆران (لە ١٤٨٨دا مردووە) زانایەکی ئیسلامی بووە لە کوردستانی عێراقی ئێستادا ژیاوە. لە بەغداد و

دیمەشق و قودس و قاهیرە خوێندوویەتی. پاشان پلەی موفتیی یەکەمی ئەستەمبۆڵ هەبووە، ئەمەش، لە سەردەمی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا، بالاترین پلەی ئاینی بووە. شێخ مەولانا خالید لە سەرەتای سەدەی ١٩دا، تەریقەتی سۆفیی نەقشبەندیی بۆ کوردستان هێناوە. سەعیدی نوورسی لە تورکیای ئیمرۆدا، داهێنەری بزووتنەوەی نورجولوک Nurculuk بووە.

دەبێ ئەمەش خامۆش نەکەن کە حوجرەی فەقێیانی کوردەواری شوێنی کۆبوونەوەو گەشەکردنی هزری ناسنامەی کوردی بووە. هۆزانڤانە ناودارەکانی کورد، ئەوانەی هۆزانەکانیان کولتووری کوردیان دەوڵەمەند کرد و زیندوویان هێشتەوە، زۆربەیان لەو حوجرانەی فەقێیان دەرچوونە و ئەدەبی خۆیانیان پەخش کردووە. جگە لە مەدرەسەکانی دەوڵەتی و ئەوانەی میرنشینەکان ڕایان دەگرتن، زۆر لە گوندەکان حوجرەی فەقێی خۆیانیان هەبوو. ئەم حوجرە کەم دەسەلاتانەبوون کە مەلایەکانیان پەروەردە دەکردن بۆ ئەوەی پاشتر خزمەتی دانیشتوانی گوندەکان بکەن. بەمجۆرە مەلایەکانی جاران، هانی پەیدابوونی هزری کوردایەتییان داوە و ئەمش بە پێچەوانەی کردەوەی کوردە ئیسلامییەکانی ئەم سەردەمەیە کە هەستی نەتەوەیی مرۆڤ بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دەزانن.

**ئیسلامییەکان (ئیسلامە توندڕەوەکان).** لە ئەنجامی ئەو نسکۆیەی تووشی بزووتنەوەی نەتەوەپەروەریی هاوچەرخ لە ڕۆژهەلاتی ناڤین هات کە (جەمال عەبدولناسر لە میسر لە شەستەکاند ا، نموونەیەکی باشی بوو)، موسڵمانە نەتەوەپەرستەکان، بە نیازی ئاگرکردنەوە، بەرەو ڕەگ و ڕیشەی ئیسلامەتی چوونەوە. هەر بەو مەبەستەشە ئیسلامییەکان یا ئیسلامە توندڕۆیەکان، لە هەموو دنیا، داکۆکی لە بۆچوونێکی کۆنی هزری ئیسلامەتی دەکەن و دژی دەسەلاتە هاوچەرخەکان دەوەستن و داواش دەکەن دووبارە کۆمەڵگەی مێژوویی ئیسلامەتی بژیێننەوە. بۆ نموونە، ئیسلامە فەندەمێنتاڵەکان داوای جیهاد دەکەن، واتە دەیانەوێ شەڕی پیرۆز دژی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا بکەن.

ئەوەی جێی سەرسووڕمانی نوێخوازانە، ئەوەیە کە ئیسلامییە توندڕۆیەکان هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئێران نموونەیەکی زەقی ئەو سەرکەوتنەیان بوو.

(ئیخوان مسلمین) له میسر و حزبوڵڵا له لبنان و حەماسی فەلەستینی و ئوسامە بن لادن، نموونەی دیکەی ئەو سەرکەوتنەن. تەنانەت عیلمانییەکانی وەک سەدام حوسێنیش لەوە سەرکەوتن لە پەنای ئیسلامەوەڕا داوای پشتیوانی بۆ خۆیان بکەن. لە تورکیاش کە تاکە دەوڵەتی ئیسلامیی سێکولارە، ئیسلامییەکان لە جاران بەهێزتر بووینە و تەنانەت لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٦، با بۆ ماوەیەکی کورتیش بووبێ، توانییان نەجمەدین ئەربەکان هەڵبژێرن و پاشان لە سەرەتای ٢٠٠٠ـەکاندا گەورەترین سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکان بەدەست بێننەوە و حکوومەتێکی تاکلایەنە پێک بێنن.

هەرچەندە ڕێبازی سۆفییاتی لە ناو کوردان ڕەگی توندی هەیە، بەڵام هێشتا دەڵێن: "ئەگەر کوردێک لەگەڵ بێ ئیمانێک لە تەرازوو بنێی، کوردە ئیمانێکی باشی هەیە" واتە کورد بەهای ئیسلام دەزانن، بەڵام هەرگیز پێیان لە ڕێی تۆندڕەوی نەناوە. توندڕۆیی ئیسلامی هەرگیز لە ناو کوردی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا گەشەی نەکردووە. بۆ نموونە، بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، ڕاستە لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٢، سێیەم دەنگی هێنا، بەڵام هێشتا زۆر لە دوای دوو پارتە سێکۆلارە پێشەنگەکان بوو.

بەڵام لەم دواییانەدا، ئیسلامییەکان خۆیان توندتر کردووە و کردەوەی توندوتیژیشیان لە باکوری عێراقدا کردووە. لە تورکیاش، ئیسلامییەکان خەریکە بە ئاشکرا، لە دەنگدانیان بۆ پاڵێوراوە کوردەکان، ڕکابەرکێی پارتە سیاسییە کوردییەکانی وەک هادەپ دەکەن. سەیری (ئەنسارولئیسلام و حزبوڵڵا و شێخ) بکە.

**ئیسماعیل بێشکچی (١٩٣٩– )**. کۆمەڵناسێکی تورکە. لە ١٩٧١ڕا بە هۆی نووسینەکانی کە دەربارەی کورد دەیاننووسێ؛ چەند جار زیندانی کراوە. چونکە هەرگیز پەنای نەبردووەتە بەر توندوتیژییەوە، بۆیە ئەمنێستی ئینتەرناشناڵ وەک زیندانی کراوێکی هزر پشتیوانیی لێ کردووە. لە ناو گەلێک ئەو ڕێکخراوانەی بایەخ بە کاروباری یاسای سەرکوتکاریی کوردی تورکیا دەدەن، بێشکچی وەک کەسایەتییەکی دیار پێشوازیی لێ کراوە.

**ئیکی بین دۆغرو**. سەیری (بەرەو ٢٠٠٠) بکە.

**ئیگلتن.** سەیری (ویلیەم ئیگلتن) بکە.

**ئیلەری یورت.** سەیری (بۆ پێشەوە ولات) بکە.

**ئیمپراتۆریی عوسمانی.** لە کۆتاییی سەدەی ١٣دا دامەزرا و بە یەکێک لە گەورەترین دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە مێژوودا دەژمێردرێ، لە ١٤٥٣، عوسمانییەکان قوستەنتەنییەی پایەتەختی بێزەنتییەکانیان گرت، بەم سەرکەوتنە مێژووییەشیان ئیمپراتۆریەتی بێزەنتییان لەناو برد. لە سەدەی پاشتر دەوڵەتی عوسمانی گەشەی کرد و بەرفرەوانتر بوو تا توانیی هەندێ بەشی هەر سێ ولاتی باشووری ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا (ڕۆژهەلاتی ناڤین) و باکوری ئافریقا بگرێ. ئیمپراتۆری عوسمانی لەمیانی پەرەسەندنیدا بەرەنگاری کریستیانەکانی ڕۆژئاوا بووەوە و بە ناوی بلاوکردنەوەی ئیسلامەتی دەستی بەسەر ولاتەکانیاندا گرت. پاشتر کە زانستیی لە ئەوروپا گەشەی کرد، ئیتر عوسمانییەکان هێدی هێدی لە بەرانبەریان شکستیان خوارد و تا لە سەدەی ١٩دا ناوی (پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا Sick Man of Europe)ی لێ نرا. بەلام هێشتا ئەو پیاوە نەخۆشە توانیی تا سەدەی بیستەمیش خۆی ڕابگرێ، ئینجا لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بەزی و پارچە پارچە بووو نەما. مستەفا کەمال لە ١٩٢٣، کۆماری تورکیای ئێستای لە شوێنی دامەزراند.

عوسمانییەکان لە سەرەتادا لەگەڵ کورد یەکیان گرت؛ چونکە کورد لە ١٥١٤، لە شەڕی چالدیرانی باکوری ڕۆژهەلاتی ڤان، یارمەتیی سەرەکیی عوسمانییەکانیان دا و وایان کرد سەفەوییەکان ببەزێن. لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا بوو کە سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی کێشراو ئەو سنوورە تا سەدەی ٢٠ـەمیش، هەر وەک ئەو سەردەمی مابووەوە. زۆرینەی کورد وەژێر دەستی عوسمانییەکان کەوت و تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆیی هەبوو. بەلام لە سەدەی ١٩ دەوڵەتی عوسمانی سیاسەتی خۆی بۆ حوکمێکی ناوەندی گۆڕی و هەموو میرنشینە سەربەخۆیەکانی کوردی لەناو برد. ئەو کوردانەی مانەوە فارسەکان کۆنترۆڵیان کردن. چونکە کورد کەوتبووە سەر سنووری ئیمپراتۆریەتی فارسی و عوسمانی، بۆیە هەمیشە ڕۆڵی سەرەکیی لە شەڕەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەکەدا هەبووە و هەمیشە زیانی هەرە گەورەی

ئەو شەڕانەش هەر لە کورد کەوتووە.

لە ئەنجامی بێ هێزی و کزیی دەوڵەتی عوسمانی، هەستی کوردایەتی گەشەی کرد، بەڵام سەرکردەکانی کورد نەیانتوانی گەلەکەیان یەک بخەن و سوود لەو هەلە وەربگرن کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بۆیان رەخسابوو. تا ئێستاش هەندێ لە مێژوونووسان مشتومڕی ئەوەیانە ئایا شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بزووتنەوەیەکی کوردایەتی بوو، یان ڕاپەڕینێک بوو داوای گەڕانەوەی سیستەم خەلیفایەتیی دەکرد. ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە زۆر لەوانەی هەستی کوردایەتییان هەبوو، بۆ ئەوەی نەهێڵن شێخ سەعیدی پیران سیستمی ئیسلامی بگەڕێنێتەوە، نەیانهێشت خێڵەکان پێوەندی بە شۆڕشەکەیەوە بکەن.

ئەوروپا ئێستا هەوڵی زۆر دەدا بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری تورکیا وەربدا و وابکا کە حکوومەتی ئەنکارا ملکەچی هەندێ لە داخوازییەکانی گەلی کورد بێ و دان بە بوونی ئەو گەلە لەو وڵاتەدا بنێ. هەندێ لە چاودێران وای بۆ دەچن کە ئەو فشارەی ئەوروپا دەیکا بۆ ئەوەیە، هێدی هێدی تورکیا لاواز بکەن و لە کۆتاییدا ڕێگە بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی خۆش بکەن. تورک نکووڵی لە بوونی گەلی کورد لەو وڵاتەدا دەکا، ئەمەش بەپێی ئەو بنەمایە ئیسلامییەیە کە عوسمانییەکان پەیڕەویان دەکرد و دەیانگوت ئیسلام یەک میللەتە. ئەمەش بەڕاستی لەگەڵ بنەمای سێکولاریزمی دەوڵەتی کەمالیی تورکیا ناگونجێ. بۆیە تورکیا تەنیا دان بە هەندێ لە مافەکانی کەمینە ناموسڵمانەکانی وڵاتەکەدا دەنێ. ئەمەش بەتەواوەتی لەگەڵ دەقی پەیمانی لۆزان (١٩٢٣) دەگونجێ. ئەو پەیمانە هیچ بەندێکی سەبارەت بە کورد تێدا نییە و هیچ ئاماژەشی بۆ نەکردووە، کەچی پەیمانەکەی سیڤەر (١٩٢٠) ویستی ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی بۆ گەلی کورد مسۆگەر بکا.

دەوڵەتی عوسمانی چۆن بە توندی هەڵسوکەوتی لەگەڵ گەلی کورد دەکرد، پاشی ئەویش هەردوو دەوڵەتی سووریا و عێراق کە میراتگری دەوڵەتی عوسمانینە، بە هەمان شێوەی توند گەلی کورد سەرکوت دەکەن و لە هەمان کاتیشدا ترسیان لە دەوڵەتی نوێی تورکیا هەیە. لە ڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، عوسمانییەکان هەر بە گومان براگەورەی مەلا مستەفا بارزانییان لە سێدارەدا؛ گومانەکەشیان ئەوەبوو

کە ڕەنگ بێ شێخ عەبدولسەلامی بارزانی هاریکاریی ڕووسییانی کردبێ؛ ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە هەمیشە دوژمنانی گەلی کورد، تۆمەتی ئاوها بێبەها وەپاڵ سەرکردەکانی کورد دەدەن؛ بۆ ئەوەی بە دڵی خۆیان چ سزایەکیان گەرەک بێ بەسەریاندا بسەپێنن و بیانکوژن.

**ئێدمۆندز.** سەیری (سێسیل جۆن ئێدمۆندز) بکە.

**ئێدوەرد نووێل (١٨٨٦– ١٩٧٤).** ئەفسەری سیاسیی (سیخوڕ)ی بەریتانیا بوو، لە ١٩١٩، لە سلێمانی کاری کرد. مێجەر نووێل هێندە بە توندی پشتیوانیی کوردی دەکرد، کە کارمەندانی ئۆفیسی کۆلۆنیالی ناتۆرەی (لۆرەنسی دووەم)یان لێنا. نووێل باوەڕی بە کارامەیی و بەهێزیی هزری کوردایەتی هەبوو؛ بۆیە خەباتی کرد بۆ ئەوەی یان دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆ یان ئەگەر هەر نا هەرێمێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دابمەزرێنێ و لە بن کۆنترۆڵی بەریتانییەکان بمێننەوە.

نووێل لە کارەکەی خۆی لە قەوقاز و لەسەر سنوورەکانی باکوری ڕۆژئاوای هیندستان، سەرکەوتنی زۆری وەدەست هێنا و پاشان لە ١٩١٩، گەشتێکی چڕوپڕی بە سەرتاسەری کوردستاندا کرد. ڕۆڵێکی گرینگی لە دامەزراندنی شێخ مەحموود بە حوکمداری سلێمانی، هەبوو. بەڵام لەلایەک چونکە شێخ مەحموود نکوولیی لە هاریکارکردنی بەریتانییەکان کرد و لەلایەکی دیکەشەوە مستەفا کەمال ئەتاتورک لە تورکیا سەرکەوت، بۆیە حکوومەتی بەریتانیا پشتیوانیی ئەرکی نووێلی لە کوردستانی باکوردا نەکرد، کە چووبوو هانی کوردانی دەوێ بدا تا پێوەندی بە حکوومەتی کوردستانەوە بکەن. تورکەکانیش لە لای خۆیانەوە، گومانیان لە نووێل پەیدا کرد و هەستیان کرد دەیویست کوردەکانی باکوری کوردستان هان بدا بۆ ئەوەی پەلاماری بنکەکانی حکوومەتە تازە دامەزراوەکەی کەمالییەکان بدەن. نووێل لەسەر کارەکەی لادرا و لە جێی ئەو مێجەر ی. ب. سۆن دامەزرا.

مێجەر نووێل ڕاپۆرتێکی٧٧ لاپەڕەیی دەربارەی ئەزموونی خۆی لە ناو کوردان نووسییەوە. ڕاپۆرتەکەی بەناوی (یادداشتی مێجەر نووێل دەربارەی ئەرکە تایبەتییەکەی لە کوردستان، لە١٤ ی حوزەیران تا ٢١ سێپتێمبەری ١٩١٩) بوو. ئەو ڕاپۆرتە لە ئارکایڤی ئۆفیسی ڕێکۆردی گشتی Public Record office، لە کیو گاردنز

ژمارە ٣٧١/٥٠٦٨ FO یە. مێجەر نووێل لە کۆنفرانسە گرینگەکەی قاهیرە بەشداریی کردووە؛ کۆنفرانسەکە دەربارەی ڕۆڵی ئایندەی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بووو لە ئاداری ١٩٢١ بەسترا.

**عێراق.** لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی، بەریتانیا دەوڵەتی دەستکردی عێراقی لە هەرسێ ویلایەتی پێشانی عوسمانییەکان، کە مووسڵ و بەغداد و بەسرە بوون، پێک هێنا. بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان دەوڵەتە تازەکە وەژێر دەسەڵاتی بەریتانییەکان کەوت. فەیسەڵی یەکەم، کە هاوپەیمانێکی بەریتانییەکان بوو، کرا مەلیک و عەرشی عێراقی پێ سپێردرا. وا بڕیار بوو کورد بتوانن بڕیار لە ئایندەی چارەنووسی خۆیان لەو وڵاتە پڕ نەوتە بدەن.

لە سەرەتادا کوردەکان بێ پسانەوە لە شۆڕشدابوون؛ چونکە مافە چاوەڕوانکراوەکانیان بۆ مسۆگەر نەکرا. لە ١٩١٨، بەریتانییەکان شێخ مەحموود بەرزنجییان لە سلێمانی کردە حوکمدار، بەڵام پاشتر دەموودەست لە بەریتانییەکان یاخی بوو، خۆی بە مەلیکی کوردستان ناوزەد کرد. هێزی ئاسمانیی شاهانەی بریتانی بە شێوەیەکی کاریگەر هێزەکانی شێخی بوردومان کرد و ڕاپەڕینە یەک لە دوای یەکەکەکانی دامرکاندەوە. لەوکاتی کە شۆڕشی شێخ بۆ دواجار لە ١٩٣١، هەرەسی هێنا، لە هەمان کاتدا ئەستێرەی مەلا مستەفا بارزانی هەڵات و وەک سەرکردەیەکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراق وەدەرکەوت.

هەرچەندە لەلایەنی تەکنیکییەوە عێراق لە١٩٣٢، سەروەریی خۆی وەرگرت، بەڵام لە ڕاستیدا تا کاتی ڕووخانی بنەماڵەی هاشمییەکان لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ سەروەریی ڕاستەقینەی وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆی نەبوو. بەندی ٢ی دەستووورە کاتییە تازەکەی عێراق بە شێوەیەک کوردی ناسی کە پێشتر لە هیچ وڵاتێک بەم شێوەیە نەناسرابوون: لە دەقی دەستوورەکەدا هاتبوو: (کورد و عەرەب لەم وڵاتەدا هاوبەشن. دەستوور هەموو مافەکانیان لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا دەپارێزێ.) لەگەڵ ئەوەشدا کە ئومێدی چارەسەری کێشەکە لە ئارادا هەبوو، بەڵام لە سێپتێمبەری ١٩٦١، شەڕ و کوشتاری نێوان حکوومەت و کورد دەستی پێ کرد و بە درێژایی شەستەکان نەپساوە.

ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم، هەر لە ١٩٥٨ـەوەڕا تا ڕۆژی لەسەر کورسی لادان و کوشتنی، لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ حوکمی کرد. حزبی بەعس بۆ ماوەی نۆ مانگ لە دوای لادانی قاسم حوکمی کرد و پاشان لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ دووبارە هاتەوە سەر حوکم و ئیتر بەری نەدا. لە ١٩٧٠، سەدام حوسێن دانوستانی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی کرد و بەیانی ئادار دەرچوو. ئەم بەیانەی ئادار تا ڕادەیەکی بەرچاو حوکمی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد مسۆگەر کرد. لە کۆتاییدا هیچ لایەنێکیان متمانەی بە ئەوی دیکەیان نەما و لە ١٩٧٤ شەڕ دەستی پێ کردەوە. شارە پڕ نەفتەکە و ناوچەی کەرکووک هۆی سەرەکیی ڕێک نەکەوتنەکەبوون. بە پێی ڕێککەوتنەکەی جەزایر، ئێران هەموو جۆرە یارمەتییەکی لە بارزانی بڕی و لە ئاداری ١٩٧٥، هەرەسیان بە شۆڕش هێنا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شەڕی پارتیزانی لە حەفتاکاندا دەستی پێ کردەوە، ئینجا حکوومەتی ئیراق ویستی بە ڕێگەیەکی تر کێشەی کورد لەناو ببا و هەستا پتر لە ٣٠٠٠ گوندی کوردانی خاپوور کرد و ٥٠٠,٠٠٠ کوردیشی بۆ باشوور نارد و ناوچەی سنوورییەکانی باکوری عێراقی لە کورد قەدەغە کرد.

شەڕی ئێران– عێراق، لە هەشتاکان، هەلێکی دیکەی بۆ کوردی عێراق هێنا پێشەوە و هەلەکە مەترسیی زۆریشی تێدا بەدی دەکرا. لەو شەڕەدا، کوردەکان پشتیوانیی ئێرانییان کرد. بەرەی کوردستانی عێراق لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و چەند پارتی سیاسیی بچووکی دیکە پێک هات و ئومێدی یەکگرتنی کوردەکانی زیندوو کردەوە. سەدام حوسێن بۆ ئەوەی تۆڵە لە کورد بکاتەوە، گورزی چەکی کیمیایی لە کورد لە هەڵەبجە وەشاند و هەڵمەتی ئەنفالیشی بۆ جینۆسایدکردنی ئەنجام دا.

داگیرکردنی کوێت لەلایەنی سەدام حوسێنەوە لە ٢ی ئابی ١٩٩٠دا، شەڕی کەنداوی ١٩٩١ی لێ کەوتەوە. بەزینە خێرایەکەی عێراق لە شەڕەکە و هەرەسهێنانی ڕاپەڕینی کورد لە باکور و هی شیعەکانیش لە باشوور و پاشان ئەو کۆڕەوە ترسناکە کە کورد بەرەو سنوورەکان کردی، وڵاتە یەکگرتووەکانی هان دا بۆ ئەوەی بێتە ناو کێشەکە و ناوچەی دژە فڕین لە باکوری عێراقدا بسەپێنێ. بە هاناوەهاتنی کورد، لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە، دەوڵەتێکی دان پێدانەنراوی ناسەقامگیری بۆ

کورد پێک هێنا. هەرچەندە لە ناوەڕاستی ١٩٩٠ـەکاندا، پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی مەسعوود بارزانی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی جەلال تاڵەبانی، شەڕێکی سەختیان دژی یەکتر کرد، بەڵام هێشتا ئەو دەوڵەتە دیفاکتۆیە توانیی بە شێوەیەکی زۆر دیار گەشە بکات.

لە ٢٠٠٢، زۆر چاک بە دەرکەوت کە عێراقی سەدام حوسێن، دەوڵەتێکی سەرنەکەوتووی نامۆی بێ متمانە بوو. هەرچەندە تورکیا و ئێران و سووریا زۆر بە توندی دژی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی بوون، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان، ناوچەی دژە فڕینی سەپاند و ئەو پارەیەش کە لە فرۆشتنی نەوتی عێراق، بە پێی بەرنامەی نەوت بە خۆراکی نەتەوە یەکگرتووەکان هات، ڕێی بۆ کوردی عێراق خۆش کرد تا کۆمەڵگەیەکی مەدەنی دروست بکەن و گەشەی پێ بدەن. لە سەرجەمی ٢٠ ملیۆن ژمارەی دانیشتوانی عێراق، ژمارەی کورد لە نێوان ٣,٥ بۆ ٤ ملیۆن کەس دەبێ. واتە ڕێژەی لە نێوان ١٧ تا ٢٠ لەسەدی دانیشتوانی عێراق کوردن. ڕێژەی سەدیی کورد و ژمارەی دانیشتووانی عێراق لەوە کەمترە کە زۆر لایەن ئاشکرای دەکەن. چونکە سەرژمێرییەکی ڕاستەقینەمان لە بەردەستدا نییە، بۆیە هەموو ئەو ژمارانە ژمارەی نزیکەنە. سەیری (شەڕی دووەمی کەنداو) بکە.

**ئێران**. ئێرانیش وەک تورکیا و عێراق و سووریا کوردی تێدا دەژی. ئێرانی ئێستاو پێشتریش ئیمپراتۆریی فارس، هەمیشە ڕۆڵی دیاریان لە کاروباری کورد گێڕاوە. بەزۆری خاکی کورد گۆڕەپانی ئەو شەڕ و کوشتارانە بووە کە لە ١٥٠٢- ١٧٣٦ لە نێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و فارسە سەفەوییەکاندا قەوماوە. ململانێی ئێستای نێوان تورک و ئێرانییەکان لەسەر کوردستان، لە دەوڵەتی دیفاکتۆی ئێستای کوردستان لە باکوری عێراق، مەیدانی گرتووە.

لە ١٨٨٠، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری گەورەترین شۆڕشی سەدەی ١٩مینی لە سنووری نێوان عوسمانییەکان و ئێرانییەکان بەرپا کرد. هەرچەندە شۆڕشەکە ڕاپەڕینێکی خێڵەکی بوو، بەڵام شێخ عوبەیدوڵڵا پشتی بە هزری زیندووی کوردایەتی بەست. لە ١٩١٨وەڕا تا ١٩٢٢ش، سمایل ئاغای سمکۆ، شۆڕشێکی خێڵەکیی تری گەورەی لە کوردستانی ئێران بەرپاکردو تەنانەت حکوومەتی ئۆتۆنۆمیشی

دامەزراند. حکوومەتەکەی تا کاتی دەست هەڵگرتنی لە شۆڕش و کوشتنی بە دەستی حکوومەتی ئێرانەوە، هەر بەردەوام بوو.

کۆمارە تەمەن کورتەکەی کوردستان لە مەهاباد (١٩٤٦)، بە سەرۆکایەتیی سەرکردەی ناودار، قازی محەمەد، ئەویش هەر لە ئێران بوو. لە شەستەکان و نیوەی یەکەمی حەفتاکانیش، ئێران پشتیوانیی شۆڕشی مەلا مستەفا بارزانیی لە عێراق، کرد. لە کۆتاییدا چونکە ئێران یارمەتییەکانی خۆی لە کوردی عێراق ڕاگرت؛ عێراق لە ١٩٧٥، سەرکەوت؛ لە بەرانبەر ئەوەشدا چەند قازانجێکی سنووریی لە عێراق وەرگرت.

لە بیستەکاندا، حکوومەتی ئێران، جۆرە سیاسەتێکی تازەی پەیڕەو کردو لەوەڕداریی نەهێشت کە ئابووریی ناوخۆی خێڵەکان بوو. ئەم هەنگاوە بەوە جێبەجێ کرا کە شوێنگۆڕی بە خێڵەکان کرد و سەرۆکەکانیشیانی بانش (نەفی) کردن. کە کۆمەڵی کوردەواری کەوتە نێو سنووری ئابووریی بازاڕی گەشەکردووی ئێرانەوە، هێشتا گۆڕانکاریی دیکەی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا لێ هاتە دی. چاکسازیی زەوی کە شاله ١٩٦٣دا کردی، کاریگەریی زۆری لەم پرۆسەی گۆڕانکارییەدا هەبوو.

لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە ١٩٤٦، لە مەهاباد، بزووتنەوەی کوردایەتی لە ئێران زۆر هاندەری لە دەست داو لەو کاتەوەڕا، زۆر چالاکیی نەتەوەیی کوردی لە عێراق و تورکیادا جێبەجێ دەکرێن، بەڵام، ژمارەیەکی کەمتر لەو بزووتنەوانە لە ئێران دووبارە بووەتەوە. لە چلەکان و پەنجاکاندا، پارتی دیموکراتی کوردستان، لە نزیکەوەڕا هاریکاریی لەگەڵ حزبی توودە (پارتی کۆمۆنیستی ئێرانی)دا کرد. کە لە ١٩٥٣، شا هاتەوە سەر تەختەکەی، توانیی زۆربەی چالاکییەکانیان ڕابگرێ.

لە شەستەکان، کوردەکانی ئێران ویستیان هاریکاریی شۆڕشی کوردی عێراق بکەن کە مەلا مستەفا بارزانی سەرکردایەتیی دەکرد. لە کۆتاییەکانی ١٩٦٠ـەکانیش، کۆمەڵە گەنجێکی پارتی دیموکراتی کوردستان، دەستیان بە شەڕی پارتیزانی دژی تاران کرد، بەڵام هەرەسیان هێنا. پێوەندیی نێوان کوردەکانی عێراق

و ئێران تێک چوو؛ چونکە مەلا مستەفا بارزانی پێویستی بە یارمەتییەکانی ئێران هەبوو، بۆ ئەوەش ئەو یارمەتییانە ڕانەگیرێن، بارزانی نەیدەویست کوردی ئێران لەو بارودۆخە ناسکەی ئەوکاتەدا شۆڕش دژی شا بکەن و ویستی چاوەڕێی کاتێکی گونجاوتر بن.

لە کاتی شۆڕشی ئیسلامی ل ١٩٧٠کاندا، دوو پارتی گەورەی کوردی لە ئێران هەبوو، حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، کە نەرمڕۆ و کارامە بوو. ئەوەی دووەمیش کۆمەڵە بوو کە پارتێکی مارکسیی ڕادیکاڵی بوو. پرۆگرامی هەردووکیان عیلمانی بوو. بۆ ماوەیەک کۆنترۆڵی هەموو کوردستانیان کرد. دروشمی پارتی دیموکراتی کوردستان (ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیموکراسی بۆ ئێران) بوو. مەلا نائاساییە سوننەکەش، شێخ عیزەدین حسەینی، ڕۆڵێکی گرینگی لە ناوبژیوانی و یەککردنی لایەنەکان گێڕا. بەڵام لە کۆتاییدا دەرکەوت کە کوردە ئێرانییەکان یەک نەبوون، بۆیە لە ١٩٨٣، شۆڕشە چەکدارانەکەیان بەتەواوەتی هەرەسی هێنا. لە ١٩٨٥، شەڕ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و کۆمەڵە بەرپا بوو، سەدان کەس گیانی خۆیان لەدەست دا.

لە کاتی شەڕی ئێران-عێراق (١٩٨٠- ١٩٨٨)، کوردە ئێرانییەکان یارمەتیی لۆجستییان لە عێراق وەرگرت. بەڵام هەرگیز لە بواری سەربازیدا هاریکاریی حکوومەتی عێراقیان نەکرد. لە ١٩٨٩دا، ئێران، عەبدولڕەحمان قاسملووی سەرکردەی هەرە ڕیزداری حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانی کوشت و لە پاش ئەویش لە ١٩٩٢، سادق شەرەفکەندیشی تیرۆر کرد. کوشتنی ئەو سەرکردانە، کە هاوکات لەگەڵ زنجیرەیەک تێکشکانی سەربازی لە ١٩٨٠ کاندا هات، تا ڕادەیەکی زۆر ورەی کوردپەروەرانی لە ئێران دابەزاند. پێشمەرگەکانی ئێستا هەموو لە بانشگە لە خاکی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردستان، لە باکوری عێراقدا دەژین.

لەمیانی شۆڕشی پارتی کرێکارانی کوردستان لە تورکیا، (١٩٨٤- ١٩٩٩) تورکیا گەلێ جار ئێرانی بە کۆمەککردن و داڵدەدانی «پ. ک. ک» گومانبار دەکرد. لە ١٩٩٦، لەو شەڕەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە پێناوی باڵادەستی لە باکوری عێراقدا دەیانکرد، ئێران بە ئاشکرا

پشتیوانیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی کرد و تورکیاش لای پارتی دیمۆکراتی کوردستانی گرت. لەو کاتەوە ئێران و تورکیا پشتیوانییان لە لایەنە جیاوازەکان کردووە، بەڵام هەمیشە ئامانجیان ئەوە بووە کە نەهێڵن دەوڵەتێکی ڕاستەقینەی کوردی لەو ناوەدا دروست ببێ؛ چونکە ئەو دەوڵەتە ڕەنگە بە توندی کوردەکانی هەردوولا گرێدا.

لەمیانی شۆڕشەکانی کوردی عێراق لە ١٩٧٥ تا ١٩٩١، ئێران پێشوازیی لە ژمارەیەکی زۆری پەناهەندەی کورد کرد. فارسەکان وەکو تورک و عەرەب نینە، ئەمانە پێوەندیی نزیکیان لەگەڵ کوردان هەیە. ئەو خزماتی ڕەگەزییە ڕەنگە وای کردبێ کوردەکانی ئێران کەم دەستکەوتێکی نەتەوەیی کوردیان بوەدەست هێنابێ. سەرەڕای ئەمەش، کوردەکان وەک ئازەرییەکان نینە، ئەمانە بە دانیشتوانی ئوستانی کوردستانی باکوری خۆرئاواشەوە، ڕێگەیان پێ نەدراوە پۆستی گەورە لە دەوڵەتی ئێران وەربگرن. هەرچەندە ئوستانی کوردستان تاکە هەرێمە کە بە فەرمی ئەو ناوەی هەیە، بەڵام کوردەکانی ئێران لە سی ئوستانی دیکەشدا دەژین، کە ئوستانەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کرماشان و ئیلامیش دەگرێتەوە. ئێستا ٦,٥ ملیۆن کورد لە ئێراندا دەژین، کە ١١ لە سەدی ژمارەی دانیشتوان دەکا. سەیری (وڵاتی فارس) بکە.

**ئێزیدییەکان.** گرووپێکی کوردن، ئاینێکی داهێندراویان هەیە. بە هەڵە پێیان دەڵێن ئەهریمەن پەرستن. بەڵام لە ڕاستیدا ئاینی ئێزیدی، دینێکی ڕەسەنی کوردەوارییەو باوەڕی بە ڕێبازی فریشتەکان هەیە.

ئێزیدییەکان دوو کتێبی پیرۆزی نووسراویان هەیە و جێی سەر سووڕمانە کە هەردوو کتێبەکەیان بە زمانی عەرەبی نووسراونەتەوە. یەکەمیان؛ "مەسحەفی ڕەش"ـە. کتێبی ڕەش، زۆر لە کتێبەکەی دیکەیان درێژترە و بنەماکانی ئاینی ئێزیدی تێدایە. دووەمیشیان: کتێبی ڕووناهی "کتاب الجلوە"یە. ئەمەیان زۆر لە کتێبی ڕەش کورتترە و لە نزا و پاڕانەوە و ستایشکردنی دامەزرێنەری ئاینەکە، شێخ ئادی، پێک هاتووە.

"ئێزیدی" ئاماژە بۆ فریشتان دەکا و مەلەک تاوس گەورە فریشتەیەکە ئێزیدییەکان

دەپپەرستن. مەلەک تاوس میری تاریکی نییە، بەڵام لە هەموو فریشتە لە پێشەکان بەهێزترە. ئەنزال پەیکەری باڵندەیەکە و لەکن ئێزیدییەکان پیرۆزترین متفەڕکی مەلەک تاوسە، ماوەتەوە. مەلەک تاوس دنیای مەتیریاڵی لە پارچە ڕەسەنەکانی هێلکەیەکی تیشکی ئاسمانی دروست کردووە کە پێشتر ڕوح لە ناویدا ژیاوە. کە ئادەم لە بەهەشت دەرکرا، هیچ کونێکی لە دامێنیدا نەبوو، بۆیە تووشی زگ ئێشانێکی لە ڕادەبەدەر هات و حەوانەوەی نەما، تا خودا باڵندەیەکی نارد تا کونێکی لێ بکا. گرینگترین جەژنی ئێزیدییان جەژنی (جەم)ـە کە لە حەفتەی دووەمی ئۆکتۆبەر، لە دوای حەوت ڕۆژ بەڕۆژی بوون دێ. لەم جەژنەدا پەیکەری ئەنزال ئامادە دەکرێ.

خواردنی خاس و ماسی و مامز(ئاسک)و گۆشتی پەڕەوەر و کوولەکە (کودی) لە ئێزیدییان حەرام کراوە. ڕەنگی شینی تاریک و بە پێوە میاستن و بە دانیشتنەوە بەرگ دەبەر کردن و بەکارهێنانی چەکمەچە و خۆ شوشتن لە ناو گەرماودا لێیان حەرامە.

چونکە لە چەند قۆناغێکی مێژووییدا، موسڵمانەکان، جیرانە ئێزیدییەکانی خۆیان بە یاخیبوو لە ئاین زانیوە، بۆیە ژمارەیەکی زۆریان چەوساندووەنەتەوە و کوشتوویانن. ڕەنگە لە ۲۰۰۷، ئێزیدییەکان لە ٥ لە سەدی سەرجەم دانیشتوانی کورد کەمتربن و لە چەند ناوچەیەکی بادینانی هەرێمی کوردستاندا کۆ بوونەتەوە: لە باشووری ڕۆژئاوای مووسڵ و لە لالشی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ نیشتەجێنە. گرینگترین گلکۆی ئێزیدییەکان، کە گلکۆی شێخ ئادییە، لە لالشە.

لە ۱۸۳۰یەکان، پاشا کۆرەی ڕەواندز زۆر ئازاری ئێزیدییەکانی دا و ناچاریکردن، بە کۆمەڵ، لەم ناوچانە بار بکەن و بچن لە نێوان ماردین و میدیات لە نزیکی باتمانی باکوری کوردستان تازەهەوار بۆ خۆیان ئاوەدان بکەنەوە. پاشتر، بۆ ئەوەی چیتر ئازار نەدرێن، زۆربەیان کۆچیان کرد و چوون لە ئەڵمانیا نیشتنەوە. لە سەدەی ۱۹دا، هەندێ ئێزیدی کۆچیان بۆ ناوچەی قەوقازی ڕووسی کرد. لەم دواییانەدا ئێزیدییەکانی ئەرمینیاش تووشی ئازاردان هاتن.

ئێزیدییەکان بە دیالەکتی کرمانجیی کوردی دەئاخێڤن. لەو ساڵانەی دواییدا،

عەرەبەكان هەوڵی زۆریان دا بۆ ئەوەی ناسنامەی كوردی لە ئێزیدییەكان وەربگرنەوە و بۆ ئەم مەبەستەش جاڕیان دا كە ئەوانە لە نەوەی عەرەبەكانی بەنی ئومەییەنە. ئەم دووبارە مێژوو نووسینەوە، هەوڵێک بوو بۆ ئەوەی بە ساختە ئێزیدییەكان وا پێناسە بكەن كە نەوەی خەلیفەی ئەمەوی یەزیدی كوڕی مەعاوییەن. یەزید لە ٦٨٠وەڕا تا ٦٨٣ی زایینی خەلیفەی ئەمەوییەكان بووە و لە دیمەشقی شام فەرمانداریی كردووە.

**ئێڵی بانستەر سۆین.** سەیری (سۆین) بكە.

## ب

**بابان.** ئەم میرنشینە کوردییە، لە نزیکی ١٥٥٠وە تا کاتی لەناوچوونی لە١٨٥٠، ڕۆڵێکی گرینگی لەو هەرێمەی کوردستاندا هەبووە کە ئێستا بە باکوری عێراق دەناسرێ. بە پێی شەرەفنامەی شەرەفخانی بتلیسی یەکەم سەرۆک کە تیرەی بابانی دروست کردووە و ناوی ئەویشی لێ نراوە؛ (پیر بابۆک بەبە) بووە. بەڵام ئەم بەرەبابە هەر زوو لەناو چووە. بەرەبابێکی دیکە دەڵێن نەوەی کەیخانن جێیان گرتنەوە؛ کەیخان ئەو خانمە فەرەنگە بووە کە بە دیل گیراوە و پاشان نەوەی لێ بەپاش کەوتووە و نەوەکانی دەسەڵاتی بەبەیان وەرگرتووە. لە ١٦٧٧، بابە سلێمان بەدیار کەوت و لە ماوەی چەند ساڵێکدا، ١٧ میر و پاشای بەبە سەریان بۆی دانەواند و هاتنە ژێر دەسەڵاتییەوە.

هەرچەندە ئەو میرنشینە تەکتیکێکی هەلپەرستانەی پەیڕەو کردووە، بەڵام بەناو هەر سەر بە ئیمپراتۆری عوسمانی بووە. لە سەرەتای سەدەی ١٧م، میری بەبە ناتۆرەی (پاشا)ی لە سوڵتانی عوسمانییان وەرگرتووە؛ میری بەبە ئەم نازناوەی چەندین دەیە بەر لە میرانەکانی تری وەک خۆی، وەرگرتووە. تا ١٧٨٥، قەڵاچوالان پایەختی میرنشینەکە بووە و پاشان پایەتەختیان بۆ سلێمانی هێناوە. میرنشینی ئەردەلان کە ئێستا کەوتووەتە ناو ئێرانەوە، دوژمنی هەمیشەیی میرنشینی بەبە بووە. دوا پاشای بەبە، عەبدوڵلا پاشا ١٨٥٠ لەسەر تەخت لادراوە.

**باجەلان (باژوان، باژوران).** باجەلان کۆمەڵگەیەکی بچووکی کوردەوارینە و ٤٥کم لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مووسڵ دەژین و بنەمای باوەڕی کاکەیی پەیڕەو دەکەن؛ بۆیە پێیان یێژن (غوللات) یان بە شیعەی توندڕۆ ناوزەدیان دەکەن. ئەمانە بە شێوەزمانی گۆران قسە دەکەن. باجەلان لە شەبەک نزیکن، تەنیا جیاوازییان لەگەڵ شەبەک ئەوەیە کە ئەمانە خێڵەکینە، بەڵام شەبەک پێوەندییان بە هۆزەوە نییە. چونکە لەم سالانەی دوایی گەلێک ژنیان لێک هێناوە و تێکەڵ بووینە، بۆیە ئێستا لە جاران ئەستەنگترە بتواندرێ بە ئاسانی لێک جودا بکرێنەوە.

**بادینان.** میرنشینێکی پێشانی کوردییە و لە باکوری خۆرئاوای ئەو ناچەیەی ئێستای بەر فەرمانی پارتی دیموکراتی کوردستانە هەڵکەوتووە و بە شێوەزاری کرمانجی دەئاخێڤن. تا ئێستاش ئەم ناوچەیە بە شێوەی نافەرمی هەر بە بادینان دەناسرێ. شارە سەرگردەکەی ئامێدی پایەتەختی بوو. بادینان تا ١٩٣٠یەکان میرنشینێکی مەیلەو سەربەخۆ ماوە. زاراوەی (بادینان) لە ناوی خانەوادەی "بەهادین" وەرگیراوە کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شەمدینان (ئێستا تورکساز کراوە و بووەتە شەمدینلی) بوون. شەمدینان کەوتووەتە باکوری ویلایەتی هەکاری لە تورکیا.

**بادینی.** سەیری (کرمانجی) بکە.

**باران.** سەیری (دکتۆر باران) بکە.

**بارزان.** لانکی بارزانییانە. گوندێکی دووری کۆنی شاخاوییە و لە بواری ئابوورییەوە پەراوێز کراوە و کەوتووەتە هەرە هەورازی ئەو هەرێمەی کە ئێستا هەرێمی کوردستانی باکوری عێراقە و لە بن سنووری ئێستای تورکیایە و لە کەناری ڕۆژهەڵاتی زێی بادینانە. شەرەفخانی بتلیسی لە کتێبی ناوداری شەرەفنامە، ناوی بە بازیران بردووە و دەڵێ لە سایەی میرانی بادینان بووە، شێخ عەبدولڕەحمان لە بارزان نیشتەجێ بوو. (تاجدین مریدێکی شێخی نەقشبەند بووە، نەقشبەندییش ئەو تەریقەتەیە کە مەولانا خالید لە کوردستان دروستی کرد). ئیتر شێخ عەبدولڕەحمان یەکەم بارزانی بووە کە ئەم هۆز و بنەماڵە ناودارەی ئێستای لێ پەیدا بووینە. ئەوکات بارزان لە کۆمەڵێکی چاکساز Utopianی وا پێک دەهات کە پێشوازیی لە هەموو پەنابەرێک کردووە.

چونکە بارزان دراوسێی خێڵی بەهێزی زێبار بووە، بۆیە گەلێ شەڕیان لە نێواندا قەوماوە. شێخەکانی بارزان ناوبانگیان بە دەسەڵاتی ئاینی و جەنگاوەری نەبەرد دەرکردووە. لە کاتی شەڕی نێوان حکوومەت و بارزانییەکاندا، حکوومەتەکانی بەغداد چەند جارێک گوندی بارزانییان خاپوور کردووە؛ بەڵام لە دوای ١٩٩١، دووبارە ئاوەدان کراوەتەوە. بارزان لە بناری باشووری چیای شیرینە و گڵکۆی مەلا مستەفا بارزانی ئەوێی پیرۆز کردووە.

بارزانییەکان. لە ١٨٤٠کان سەید تەهای نەهری، خەلیفەیەکی خۆی، کە ناوی شێخ عەبدولڕەحمان بوو، پێیان دەگوت تاجدین (کڵاوگوڵینەی ئاین)، بۆ ئەو گوندە دوورەی بارزان نارد؛ بۆ ئەوەی لەوێ تەریقەت (هزر و باوەڕ) بڵاو بکاتەوە. هەرچەندە بارزان تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، بەڵام وادیارە شوێنێکی گونجاو بووبێ بۆ شێخ بۆ ئەوەی خۆی وەک ناوبژیوانێک نیشان بدا. چونکە، لەو سەردەمی کە دوایین میرنشینەکانی کوردان لەناو دەبردران، بارزان چەقی چەند تیرەیەکی دوژمنداری گرتبوو. بەمجۆرە شێخ عەبدولڕەحمان یەکەم پیاوی ئەم بنەماڵە هاوچەرخە ناودارە بوو کە پاشتر لەگەڵ چەند خانەوادەیەکی پەناهەندەی تر، کە ئەو بنەماڵەیە گرتیانییەوە، وێکڕا ئەم هۆزەیان پێک هێنا. هاتنی شێخ عەبدولڕەحمان دوژمندارییەکی درێژخایەنی لە نێوان بارزانی و زێبارییەکان پەیدا کرد؛ چونکە بارزان نزیکی بنەگەی زێبارەکانە.

هەرچەندە لە سەرەتادا، دەسەڵاتی بارزانییەکان لە ئاینەوە سەرچاوەی دەگرت، چونکە شێخی نەقشبەندبوون؛ بەڵام، چونکە توانییان بەرگری لە خۆیان بکەن و توانای شەڕکردنیان هەبوو، ئیتر گەشەیان کرد و خێلێکیان لێ پەیدا بوو. ئەندامانی هۆزی بارزانی تا ئێستاش هەر جەمەدانیی سوور لەسەر دەنێن. هەندێ لە شێخەکانی بارزان (وەک شێخ ئەحمەد بارزانی) ناوبانگیان بەوە دەرکردووە کە کەرامەتیان هەبووە. چونکە عەشیرەتی بارزانی هەمیشە وەک کۆمەڵگەیەکی چاکخواز بووە و پەناهەندەی حەواندووەنەتەوە، بۆیە بووەتە ئەو ناوەندەی کە هەست و باوەڕی کوردایەتیی لێ پەیدابووە و بەرگری لە بوونی خۆی کردووە و گەشەی کردووە.

مەلا مستەفا بارزانی کە بەناوبانگترین کوردی سەدەی بیستەم بوو، نایابترین نموونەی گەشەکردنی ئەو نیشتمانپەروەرییە بوو. براگەورە و باوکی و باپیرەشی هەموویان، لەبەر چەندین هۆی سیاسییەوە، عوسمانییەکان ئیعدامی کردن. کوڕەکەشی، مەسعوود بارزانی، سەرۆکی کوردستان و سەروکی پارتی دیموکراتی کوردستانە. ئایندەی «پ. د. ک» زۆر لە نزیکەوە بە چارەنووسی بنەماڵەی بارزانییەوە بەندە. لە ١٩٨٠دا، ڕژێمی سەدام حوسێن، چەند هەزار پیاوێکی بارزانی

کۆ کردەوە و، بە بیانووی ئەوەی کە گومان لە دڵسۆزییان دەکرێ، هەمووی کوشتن.

**بارش دونیاسی (جیهانی ئاشتی).** ژۆرناڵێکی چاندیی گرینگی تورکییە لە سەرایی ١٩٦٠ـەکاندا، تورکێکی لیبراڵ کە ناوی ئەحمەد حەمدی بەشار بوو، بۆ ماوەیەکی کورت دەری کرد. ڕۆژنامەکە هانی مشتومڕی نێوان کاربەدەستانی تورک و ڕووناکبیرانی کوردی، ئەوانەی وەک مووسا عەنتەری دا و بەمجۆرە دەرگەیەکی بەرینی بۆ دووبارە باسکردنەوەی کێشەی کوردی لە تورکیا والا کردەوە. ئەو دەروازەیە لە دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی دەرسیم، داخرابوو.

**بەتلیس (بدلیس)** لە سەدەکانی ١٦ و ١٧ دا، بەتلیس میرنشینێکی گەورەی کورد بووە. لە باکوری کوردستان (باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا)ی ئێستایە. بەتلیس ناوی هەرێمێک و ناوی گەورەترین شاری هەرێمەکەشە. هەرچەندە شارێکی سەیرە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئەوانەی سەردانییان کردووە، سەریان لێی سووڕماوە، بەڵام باشە بزانین کە هاوینی ئەم شارە گەرم و زستانیشی سەختە. ئەفسانەکان دەڵێن کە یەکێک لە گەورە ئەفسەرەکانی ئەسکەندەری گەورە ئەو شارەی لە شێوەی سەنگەرێکی سەربازی توند دروست کردووە.

یەکێک لە میرەکانی ئەم شارە کە ناوی شەرەفخانی بەتلیسی بووە، (شەرەفنامە)ی نووسیوەتەوە. ئەم کتێبە ناودارترین کتێبە کە دەربارەی مێژووی کورد نووسرابێتەوە. مێژووەکە فرە زانیاری دەربارەی میرنشینەکەی تێدا نووسیوەتەوە. گەڕیدەی ناوداری تورک "ئەولیا چەلەبی" کە نووسەری "سیاحەتنامە"یە، ماوەیەکی باش لە ١٦٥٥، لەم شارە ماوەتەوە. زۆربەی دانیشتووانی میرنشینەکە ئەرمێنی بووینە و شارەکە ڕۆڵێکی گرینگی لە مێژووی ئەرمێنییەکاندا هەبووە. تا ئەودەمی گرفتەکان لە کۆتایی سەدەی ١٩دا هاتنە پێشەوە، ئەرمەنی و کورد و تورک و دیانە یاقۆبییەکان ژیانێکی ڕێکیان پێکەوە بەسەر بردووە.

**بەتلیسی. سەیری (شەرەفخان) بکە.**

دوو ناوچەی کوردی بەم ناوە هەیە.یەکێکیان لە باشوورە و کەوتووەتە نێوان

شاری ورمێ و ڕایات و ڕەواندز؛ ئاوایی (کانی ڕەش) لە سەرشاخێکە و ٤,٠٠٠ پێ بەرزە، گەورەترین شارۆچکەی ئەم ناوچەیەیە. بەردی قۆرەتووی "کێلە شین" کە بەردێکی تاشراوە لێرەیە. برادۆستەکەی تر پێی دەڵێن سۆمای برادۆست. ئەویش لە هەورازترە و کەوتووەتە نێوان تەرگەوەڕ و قوتوورەوە گەورەترین شاری ئەم ناوچەیەش (چاری قەڵا) یە. سەید عەلی محەمەدی شیرازی لە چاری قەڵا (قەڵای چاری) زیندانی بوو تا کاتێ لە ١٨٥٠دا لە تەوریز لە دار درا.

هەندێ دەڵێن کە بنەماڵەی کوردی حەسەن وەحیدی (٩٥٩- ١٠٩٥)یە کەم جار برادۆستیان دروست کرد. لەشکری شا عەبباسی گەورەی فارس، خانی یەکدەستی میری برادۆستی لە قەڵای شاخاویی دمدم لە ١٦٠٩-١٦١٠ گەمارۆدا. ڕووداوی قەڵای دمدم لە فۆلکلۆری کوردی زۆر ناودارە. دەستەواژەی کوردیی (برادۆست، هاوڕێی مانگێک،) ئاماژە بەوە دەکات کە سەرۆکێکی پێشووی برادۆست، بە خیانەت یەک لە هاوپەیمانەکانی خۆی کوشت.

لە مێژوویەکی نزیکیشدا، برادۆست بە عێلێکی کوردی باکوری عێراق دەگوترێ کە وەک نەریتێکیان، لایەنگری حکوومەت بووینە و بەرهەڵستی بارزانییەکانیان کرد و. لە ١٩٢٠ـەکان، شێخ ڕەشیدی لۆلان تاوانی لە ئاین لادانی دا پاڵ شێخ ئەحمەدی بارزانی و برادۆستی تەیاردان و بەگژ شێخ ئەحمەدی بارزانیدا چوو. لە قسان شێخ ئەحمەدی بارزانی ڕێی بە موریدەکانی خۆی دابوو گۆشتی pork (بەراز) بخۆن تا بڵێن تەریقەتی نەقشبەندی کە خۆی لەسەری بوو، بە ئاینی مەسیحی دەچێ. لە کۆتاییدا شێخ ئەحمەد و مەلامستەفا بارزانیی برای، شێخ ڕەشیدیان ناچار کرد بچێتە ئێران و ناچەکە بەجێ بێڵێ.

لە ناوەڕاستی ١٩٤٠ کانیش، برادۆستەکانی موریدی شێخ ڕەشیدی هۆیەک بوون بۆ ئەوەی بارزانییەکان بەرەو ئێران ببنەوە و مەلا مستەفا بارزانی لەوێ پێوەندیی بە کۆماری کوردستانەوە کرد. کە لە ١٩٥٨، مەلامستەفا بارزانی لە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕاوە، جوامێرانە لەگەڵ برادۆست هەڵسوکەوتی کرد. برادۆستەکان هەر هاوپەیمانی حکوومەتی عێراق بوون و بەردەوام دژی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بووینە. بەڵام هەرچۆنێک بێ، لە ١٩٩١دا، برادۆست دژی حکوومەت، هاریکاریی

ڕاپەڕینەکەی کوردستانیان کرد. ئێستاش کەریم خانی برادۆست سەرۆکی دیاری خێڵی برادۆستە.

**بەریتانیای مەزن.** تا ماوەیەکی باشی سەدەی ٢٠ـەمیش، زلهێزی ڕۆژئاوایی بوو. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕۆڵێکی گرینگی لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیدا گێڕاو بەم شێوەیە، بواری ئەوەی هەبوو کار لە کاروباری کوردی بکا. ڕێککەوتنەکەی سایکس–پیکۆ لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دابەش کرد. بەریتانیا بە شێوەیەکی دەستکرد، عێراقی دامەزراند و پاشان بەپێی ڕاسپاردەی کۆمەڵەی نەتەوەکان تا ١٩٣٢، حوکمی کرد. تا ئەودەمی دەسەڵاتی پاشایەتی ١٩٥٨لە عێراق ڕووخا، بەریتانیا کاریگەرییەکی باڵای لە کاروباری وڵاتدا هەبوو.

لە بیستەکان و سییەکاندا، بەریتانیا هێزی ئاسمانی و گەلێ توانای دیکەی خۆی بۆ سەرکوتکردنی ژمارەیەک شۆڕشی کوردی کە بەسەرکردایەتیی شێخ مەحموود بەرزنجی و بارزانییەکان بوون، بەگەڕ خست. لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١، بەریتانیا هاوپەیمانی خۆی، لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی هەرێمی دژە فڕین دەوام پێ دا، بۆ ئەوەی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردی لە چنگی سەدام حوسێنی بپارێزێ. بەریتانیا هاوشێوەی وڵاتە یەکگرتووەکان، بەشداریی ئەو کۆششانەی کرد کە چەند پلانێکی ئاشتی بۆ وەستاندنی شەڕە ناوخۆییەکەی ١٩٩٠کان، لە نێوان کوردەکانی عێراق پیادە بکات. باسێکی ئەوە هەیە کە پتر لە ٢٠,٠٠٠ کورد لە بەریتانیادا دەژین.

**بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان.** کۆنفیدراسیۆنی ژمارەیەک گرووپی ئیسلامیی کوردیی بچووکە، بارەگایان لە باکوری عێراقە؛ لەوانە حزبوڵڵا کە شێخ محەمەد خالید (کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانی و پسمامێ مەسعوود بارزانی) سەرکردایەتیی دەکرد و یەکێتیی زانایانی کورد کە مەلا حەمدی سەرسەنگی سەرۆکی بوو. بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان بۆ ئەوە پێک هات دا لەو هەڵبژاردنانەی پەرلەمان و حکوومەتی کوردستان بەشداری بکا، کە بەرەی کوردستانی لە ١٩٩٢ز، ئەنجامی دا.

لەو هەڵبژاردنە بێهاوتایەدا، بزووتنەوەی ئیسلامی، پلەی سێیەمی هێنا و زۆر لە

دوای پارتی دیموکراتی کوردستـان و یەکێتیی نیشتـمـانیی کـوردسـتـان هات. بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان تەنیا ٥,١ لە سەدی دەنگەکانی پەرلەمانی هێنا و نەیتـوانی ڕێژەی ٧ لە سـەدا بێنێ بۆ ئەوەی تاکە نوێنەرێکی لە پەرلەمـاندا هەبێ. سـەرکـردەی بزووتنەوە شـێخ عـوسـمـان عـەبدولعـەزیزیش لە هەڵبـژاردنەکـەی سەرۆکایەتی، بە ڕێژەیەکی زۆر لە دوای مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانیدا هات. تەنیـا ٤ لە سـەدی دەنگەکـانی هێنا. بزووتنەوەی ئیـسـلامی لە ناوچە پارێزگـار و خێڵـەکـیـیـەکـانی وەک دهـۆک و هەولێـر بێـهێـزتر بوو لە شـوێنەکانی دیکەی وەک سلێمانی کە شارێکی پێشکەوتووترە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستـان کە پارتێکی پێشکەوتنخوازە، لەوێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لە دیسێمبەری ١٩٩٣، شەڕێکی دژوار لە نێوان بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان و یەکێتیی نیشـتـمـانیی کوردسـتـان، لە نزیک شـاری هەڵەبجە کـە شـوێنی شـێخ عـوسمان عـەبدولعـەزیز بوو، قـەومـا. ئەو خوێن ڕشتنە، سـەرەتای شـەڕێکی گـەورەتر بوو کـە لە نێـوان «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بەرپابوو ١٩٩٤ تا ١٩٩٨ی خـایاند.لە ماوەی ئەو شـەڕەدا، بزووتنەوە ناوە ناوە هـاوپەیمانیی «پ. د. ک»ی دەکرد و لە پەنای ئەو سـیـاسـەتەیـەوە شـوین پێی خـۆی لە ناوچەیەکـی فراوانی دەوروبەری هەڵەبـجـە و پێنجوێن و خورماڵ، توند دەکرد. ئێران پشتـیـوانییەکی باشی بزووتنەوەی ئیـسلامی کوردستـانی کرد. مـەلا عـوسـمان عـەبدولعەزیز ئاشکرای کرد کە دەیەوێ دەوڵەتێکی ئیسـلامیی لە شێوەی ئێران لە باکوری عێراقدا دروست بکا و پاشـان پەرەی پێ بدا تا ببێتـە دەوڵەتێکی سـەرتاسـەریی کوردی. ویستی سوود لە هەڵە و گەندەڵییـەی ناو «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» وەربگرێ. مـەلا عـەبدولعـەزیز یەک لەو شـەش کـەسـایەتیـیـە کوردانە بـوو کە لە کۆبـوونەوەکـەی سـەلاحـەدین، لە کـۆتـایی ئۆکـتـۆبەری ١٩٩٢، بۆ ئەندامێتیی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنی کۆنگرەی نیشتـمـانیی عێراقیی بەرهەڵسـتکار، دەسـتنیـشـان کـرا. لە کـۆتایی ١٩٩٠ـەکـان، مـەلا عـەلی عـەبدولعـەزیز جـێی مـەلا عـوسـمـانی برای گـرتەوە و بووە سـەرۆکی بزووتنەوەی ئیـسـلامـیی کـوردسـتـان. لە هەڵبژاردنی قوتابییانی ٢٠٠٠، ئیـسلامـییەکـان ٢٠ لە سـەدی کـورسییـەکـانی چەند ئەنجـوومـەنێکی قـوتابیـانیـان هێنا و ئەمـەش وەک هێـمـایەکی بـەهێـزبوونی بزووتنەوە

خوێندرایەوە. ئیسلامییەکان وەزارەتی دادی هەردوو حکوومەتەکەی «پ. د. ک» و «ی. ن. ک»یان هەبوو.

لە ١٨ی شوباتی ٢٠٠١، گرووپی تەوحید، کە چینێکی توندڕەوبوون و لە بزووزتنەوەی ئیسلامی نەرمڕۆتر جودا بووبوونەوە، فرەنسۆ هەریریان کوشت. فرەنسۆ هەریری ئەندامی پۆلیتبیرۆی پارتی دیموکراتی کوردستان و کریستیان بوو. دوای چەند مانگێک، تەوحید لەگەڵ گرووپێکی توندڕەوی تر یەکیان گرت و جوندولئیسلام (سەربازانی ئیسلام)یان پێک هێنا. ئەمەیان گرووپێکی ئیسلامیی توندڕەو بوو، تەقەی ئەوەیان لەسەر بوو کە چەند ئەندامێکی پێوەندییان لەگەڵ پیاوەکانی ئوسامە بن لادنی سەرۆکی ئەلقائیدە هەبوو. لە سێپتێمبەری پاشان لە پایزی ٢٠٠٢ش، شەڕی قورس لە نێوان «ی. ن. ک» و جوندولئیسلام لە دەوروبەری هەڵەبجەدا قەوما. ئێستا ناویان بووەتە ئەنسارولئیسلام (لایەنگرانی ئیسلام). لە نیسانی ٢٠٠٢، چەکدارێکی ئەنسارولئیسلام زۆری نەمابوو، بەرهەم ساڵحی سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی «ی. ن. ک» لە سلێمانی تیرۆر بکا. لە ٢٠٠٣، چاک بە دیار کەوت کە ئەنسارولئیسلام مەترسییەکی گەورەیان بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەبوو.

**بیل کلنتن (١٩٤٦).** لە ١٩٩٣ تا ٢٠٠١ سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان بووە. نەپسانەوەی لە پشتیوانیکردنی ناوچەی دژە فڕینی باکوری عێراق، ڕێگەی دا کە ئەم حکوومەتە دیفاکتۆیەی کوردستانی عێراق بمێنێ و هێدی هێدی گەشە بکا. لەگەڵ ئەمەشدا، چونکە تورکیا دەترسا لەوەی کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە باکوری عێراق ڕەنگە باری کورد لە تورکیا ئاڵۆز بکا، بۆیە کلنتن تووشی دوودڵی هات و نەیتوانی پتر پشتیوانیی کوردی عێراق بکا. کلنتن ترسی ئەوەشی هەبوو ڕەنگە ئەگەر پتر پشتیوانی کوردی عێراق بکا، عێراق پارچە ببێ و ئەم ناوچە گرینگە جیۆستراتیژەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین ناسەقامگیر بکا.

شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش، چەندین ئەستەنگی تری لە ڕێی کلنتن دروست کرد. بەمجۆرە، کلنتن ناچار بوو پشتیوانییەکی کەمی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لەدژی سەدام حوسێن بکا. سیاسەتی بە

جووته دەقاوغگرتنی عێراق و ئێران کە کلنتن پەیڕەوی کرد، هەرەسی هێنا. بە گشتی، کە کلنتن پشتیوانیی کوردی عێراقی لە کوردی تورکیا پتر کرد، لەبەرئەوە نەبوو، چونکە تورکیا هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو؛ بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە زۆر بەتوندی بەرهەڵستی عێراقی دەکرد.

**بلند ئەجەڤیت (١٩٢٥- ٢٠٠٦)** چەپڕەو بوو، بەڵام نەتەوەپەرستێکی توندی تورک بوو. لە ١٩٧٠کاندا، دوو جار پۆستی سەرۆک وەزیرانی تورکیای وەرگرت و پاشانیش لە نیسانی ١٩٩٩وەڕا تا دۆڕاندنە بێ ئەندازەکەی لە هەڵبژاردنەکانی وڵات، لە ٣ی نۆڤێمبەری ٢٠٠٢، سەرۆکایەتیی هاوپەیمانێتییەکی سێ پارتەی کرد.

ئەجەڤیت جەماوەرێکی گەورەی لە ١٩٧٤، بە دەستتێوەردانی لە کاروباری قوبرس، پەیدا کرد. سلێمان دیمێریلی ڕاستڕەوی نەرمڕۆ، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە مەیدانی سیاسیدا، نەیاری بوو. زۆر کەس ئەو جێگۆڕکێیەی دەسەڵاتی نێوانیان، بە نیشانەی ئەوە دەزانن کە تورکیا سیاسەتێکی ناوخۆی سەرنەکەوتووی هەیە. هەرچەندە هەردووکیان دوای کودەتا سەربازییەکەی ١٩٨٠، لە چالاکیی سیاسی قەدەغە کران، بەڵام لە کۆتاییدا هاتنەوە و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و لایەنگری زۆریشیان پەیدا کرد. سەیر ئەوەیە، لەو دەمە، ئەو دوو نەیارە وێکڕا کاریان کرد و یەکێکیان بووە سەرۆک کۆمار و ئەوی تریان سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بوو. ئەجەڤیت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کە لە تورکیا کێشەی نەتەوەیی کورد نییە، بەڵکو کێشەیەکی ئابووری هەیە.

**بەختیارییەکان.** گرووپێک یان خێڵێکی ٤٠٠,٠٠٠ کەسین بە شێوەزارێکی ئێرانی قسان دەکەن و دایالەکتی تایبەتی خۆیانیان هەیە و لە ناوچەیەکی شاخاوی باشووری خۆرئاوای ئێرانێ دەژین. زۆر لە کوردەوە نزیکن. بەختیارییەکان دەبنە دوو بەشی سەرەکی: حەوت لنگ، ئەمانە لە ٥٥ تیرە و چوار لنگ ئەمانەش لە ٢٤ هۆز پێک دێن. لە ساڵە زووەکانی سەدەی ٢٠مدا نەوت لە ناوچەکەیان دۆزراوە.

وا پێ دەچێ کە بەختیارییەکان، یان لە باکوری ئەفغانستان یانیش لە باشووری تاجیکستانەوە کۆچیان بۆ ئەم ناوە کردبێ. بەختیاریی کۆن لە تاجیکستان بووەو زاراوەی بەختیاری پێش ١,٠٠٠ لەوانەوە وەرگیراوە. کە هاتنە ئەم ناوچەیە، جاری

یەکەم لە سووریا جێگیربوون و پاشان بنەگەکانیان بۆ باشووری ناوچەی زاگرۆس بردو لە باشووری ناوچە کوردنشینەکانی ئێران و لە نزیک لوڕەکان بارگەیان لێ خست. بەختیارییەکان لەگەڵ لوڕیش زۆر لەیەکترییەوە نزیکن. لە دێرزەمانەوە و تا سەدەی پازدەش، بەختیارییەکان هەر بەلوڕی گەورە دەناسران.

لە مێژوودا، بەختیارییەکان سالانە بۆ لەوەڕی مالاتەکانیان مەودایەکی دوور دەڕۆیشتن، بەلام ئێستا زۆرینەیان نیشتەجێنە. بەختیارییەکان شیعەنە و بە ئازایەتی و سەربەخۆیی بەناوبانگن. ئەو بەختیارییانە هەندێ نەریتی جوانی منداڵبوون و ژن هێنان و مردن و گەمە هۆزان و چیرۆکی فۆلکلۆری و گۆرانیی دڵداری و سەرولکەی تایبەتی خۆیانیان هەیە. ژنەکانیان خۆیان داناپۆشن و شوێنی بالایان لە ناو کۆمەڵدا هەیە. کچی سەرۆکی بەختیارییەکان کە ناوی سۆرەیا بوو، لە ١٩٥١ تا ١٩٥٨ هاوسەری محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی بوو.

ئەو خێڵە لە مێژووی تازەی ئێراندا، چەندین سەرکردەی سیاسیی کاریگەری هەبووە. بۆ نموونە، شاپوور بەختیار لە ١٩٧٩، دوا سەرۆک وەزیرانی سەردەمی حەمە ڕەزا شای پالەوی بوو.

**بەدر.** سەیری (هێزی بەدر) بکە.

**بەدرخان بەگ (١٨٠٢– ١٨٤٧)** لە دەوروبەری ١٨٢١، میری میرنشینی بۆتان بوو (پایەتەختەکەی جزیرە بوو)؛ ئێستا لە باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیایە. بەدرخان ناوودەنگی بە ئازایەتی، جوامێری، خواناسی، ئاوات گەورەیی و لاساری دەرکردبوو. تا ئێستاش زۆر لە کوردان بە یەکەم کوردی نەتەوەپەروەری دەناسن.

لە سەردەمی ئەو، میرنشینی بۆتان هێندە بەربلاو و بەرین بوو کە نزیکەی هەموو خاکی باشووری ڕۆژهەلاتی ئێرۆی تورکیا و زۆربەی ناوچەی بادینانی ئێستای باکوری عێراقیشی گرتەوە. حوکمێکی هێندە توندی هەبوو کە ولاتەکەی بەئارامی و ئاسایش هەڵی دا. لاوازی ئیمپراتۆری عوسمانی لەو سەردەمی، بەدرخانی هان دا بۆ ئەوەی وەک هەندێک دەڵێن دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێک بێنێ. پاش ئەوەی لە کوشتنی ئەو کریستیانانە بەردەوام بوو کە ئەوروپییەکان هانیان دەدان، بەریتانیای

گەورە و فرەنسا عوسمانییەکانیان ناچار کرد دژی بەدرخان هەستنەوە. لە ١٨٤٧، بەدرخان بەزی و بانشگەی کرێت کرا و پاش ماوەیەکی کورت لەوێ مرد. جا چیتر بۆتان وەکوو میرنشینێکی مەیلەو سەربەخۆ، نەما.

نەوەکانی بەردەوامبوون و ڕۆڵی گرینگیان لە کاروباری عوسمانی و کوردیشدا گێڕا. دوو کوڕی نەوەی، کە سۆرەیا بەدرخان (١٨٨٣- ١٩٣٦) و جەلادەت بەدرخان (١٨٩٣- ١٩٥١) هەموو ژیانی خۆیانیان لە پێناوی کێشەی نەتەوەیی کورددا بەسەر برد. سۆرەیا چەند ساڵێکی ژیانی لە زیندان بەسەر برد و ڕۆژنامەیەکی بە ناوی کوردستان لە کۆستەنتەنییە لە پاش کودەتایەکەی ١٩٠٨ی "تورکی گەنج"، دەرچوواند و ئەندامێکی سەرەتاکانی پارتە کوردییە نەتەوەپەرستەکەی خوێبوون بوو. جەلادەتی براشی بە یەکەم سەرۆکی خوێبوون هەڵبژاردرا. پاشان جەلادەت، ژیانی خۆی بۆ کاری وێژەیی تەرخان کرد و یارمەتیی پوختکردنی ئەلفوبێی کوردی دا بۆ ئەوەی بە پیتی لاتینی بنووسرێتەوە.

**بەرهەم ساڵح (١٩٦٠-      )**. ئەندامێکی نەرمڕۆی قسەزانی پۆلیتبیورۆیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە. لە ٢١ی یەنایری ٢٠٠١، پۆستی سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی سلێمانیی وەرگرت. ئینگلیزسییەکی ڕەوان دەزانێ و لە عەرەبیش زمانێکی پاراوی هەیە.

بەرهەم ساڵح لە ١٩٧٦دا پێوەندیی بە «ی. ن. ک» کردو دوو جاران دەزگا ئەمنییەکانی عێراق زیندانیان کردووە. پاشان لە ١٩٧٩، خۆی گەیاندە بەریتانیا. لە زانکۆی لیڤەرپووڵ، پلەی دکتۆرای PHD لە ئامار Statistics کۆمپیوتەر وەرگرتووە. لە ١٩٨٥ ژێدەری «ی. ن. ک» بووە لە بەریتانیا و پاشانیش لە ١٩٩١ هەمان پۆستی لە وڵاتە یەکگرتووەکان هەبووە و بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەوێ ماوەتەوە. لە ٢٠٠٢، بە ئاستەم لە هەوڵێکی تێرۆریستانی ئەنسارولئیسلام قورتار بوو. لە دوای ئازادکردنی عێراقیش، دکتۆر بەرهەم ساڵح پۆستی بریکاری سەرۆک وەزیرانی عێراقی وەرگرت و تا ٢٠٠٧یش هەر لەو پۆستەدا مابووەوە.

**بەرەو ٢٠٠٠ (ئیکی بین دۆغرو)**. گۆڤارێکی لایەنگری کورد و کاریگەر بوو، لە سەرەتای ١٩٩٢ داخرا. زنجیرەیەک گۆڤاری هاوشێوەی تووشی هەمان چارەنووس

هاتن، لەوانە؛ گوندەم (ئەجێندا) ١٩٩٢-١٩٩٣؛ ئۆزگور گوندەم (ئەجێندەی ئازاد) ١٩٩٣-١٩٩٤؛ ئۆزگور ئۆلکە (زەویی ئازاد) ١٩٩٤- ١٩٩٥؛ یەنی پۆلیتیکا (سیاسەتی نوێ) ١٩٩٥و هی دیکەش هەبوون و ڕاگیران. سەیر ئەوەیە یاسای تورکیا ڕێگە دەدا گۆڤارەکان دوای بە ئاستەم ناو گۆڕینیان دەربچنەوە، بەڵام دەرچوونیان هەر تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت بووە. جگە لەمەش، گۆڤارەکان بە شێوەیەکی بەردەوام دەستیان بەسەردا دەگیراو بارەگاکانیشیان لەلایەن چەتەکانی حزبوڵلاشەوە دووچاری هێرشی کوشندە دەهاتن.

**بەرەی کوردستانی - عێراقی.** بەرەی کوردستانی - عێراقی پێویستییەکی کاتیی گرینگ بوو، بۆ ئەوەی کوردە عێراقییەکان، کە لەمێژ بوو لە دووبەرەکیدا بوون، یەکیان بکا. لە سەرەتادا لە تەمموزی ١٩٨٧دا جاڕی دامەزراندنی بەرە درا و لەو کاتەش کە شەڕی ئێران-عێراق خەریک بوو دەگەیشتە ترۆپکی کە لە ١٩٨٨ پێکهێنانەکەی بە فەرمی ڕاگەیەندرا. ئێران ڕۆڵێکی گرینگی لە نزیککردنەوەی هەردوو پارتە گەورەکەی پارتی دێمۆکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گێڕا. پاشان شەش پارت و گرووپی بچووکی دیکەش پێوەندییان پێیەوە کرد؛ ئەوانیش ئەمانە بوون: پارتی سۆشیالیستی کوردستان، بە سەرۆکایەتیی ڕەسووڵ مامەند بوو و مەحموود عوسمانیش ئەندامێکی ناوداری ئەم پارتە بوو؛ پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، سامی عەبدولڕەحمان سەرۆکی بوو؛ پارتی سۆشیالیستی کورد (پاسۆک)، ئەمەیان سەرکردایەتییەکی بە کۆمەڵی هەبوو؛ بەشی کوردستان لە حزبی شیوعیی عێراق، عەزیز محەمەد سەرۆکی بوو؛ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری و پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان، بە سەرۆکایەتیی قادر جەباری بوو. گرووپە جیاوازە ئیسلامییەکان (کە ڕەنگە لە کوردستانی عێراق سێیەم بە هێزترین گرووپ بن) پێوەندی بە بەرەوە نەکرد. گرووپە تورکمانەکانیش هەر دوورەپەرێز مانەوە.

لەگەڵ دامەزراندنیدا، بەرەی کوردستانی - عێراقی ڕای گەیاند کە ئامانجە گەورەکانی خۆی لە ڕووخانی ڕژێمی سەدام حوسێن و دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراسی ڕاستەقینە لە عێراق و گەشە پێکردنی سیستەمێکی فیدرالی بۆ کورد

دەنواند. جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانی بوونە هاوسەرۆک Co- presidentی بەرە.

هەرچەندە بەرەی کوردستانی، لە سێپتێمبەری ١٩٨٨، لە دوای شەڕی ئێران-عێراق تێک شکا و پاشانیش لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینیش لە نیسانی ١٩٩١ دووبارە، تەفروتونا کرا، بەڵام لە ئەنجامدا، لە پاش ئەوەی هاوپەیمانان ناوچەی ئارام و دژە فڕینیان بۆ پاراستنی کورد، دامەزراند، بەرەی کوردستان توانیی دەسەڵات وەربگرێ. لە سێبەری ئەو پاراستنەوە بوو بەرەی کوردستانی - عێراقی لە ١٩٩٢، هەڵبژاردنی کرد و لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش لە حوزەیرانی هەمان ساڵ، پەرلەمانی پێک هێنا و بەمجۆرە باشترین شێوەی یەکبوونی کورد هاتە دی و جێی بەرەی کوردستانیی گرتەوە.

**بەعس، بەعسییەکان.** سەیری (حزبی بەعس) بکە.

**بەغداد.** سەیری (پەیمانی بەغداد) بکە.

**بەگ.** وشەی بەگ لە بنەڕەتدا ناتۆرەی دەرەبەگە؛ دەدرێتە سەرۆک خێڵەکان و وەک پاشگری ناوی تایبەت بەکار دێ. ناتۆرەی (خان)یش بە هەمان شێوە بەکار دێ. لەگەڵ لەناوچوونی دەرەبەگایەتی، ئەم وشەیەش هێدی هێدی خەریکە لەناو دەچێ. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەو فەرماندارەشی دەگوت (ئاغە) کە سوڵتان بۆ بەڕێوەبردنی هەر هەرێمێک دای دەمەزراند. لە دوای ماوەیەک ئەم وشەیە ماناکەی گۆڕا، ئێستا وای لێ هاتووە ئەستەمە بە کورتی پێناسەیەکی تایبەت بکرێ.

**بەنداوی ئیلسو.** پێشنیازی پرۆژەی دروستکردنی ئەم بەنداوە لە کۆتاییی ١٩٩٠ـەکان و سەرەتای ٢٠٠٠ـەکاندا، بە توندی لەلایەن کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤی ئەورووپای ڕۆژئاواوە ماندەل و ڕیسوا کرا، تا لە نۆڤێمبەری ٢٠٠١دا، واپێ دەچوو پرۆژەکە پشتگوێ خرابێ. ئەم بەنداوە یەکێک لە بەنداوەکانی پرۆژە ژایانتەکەی (عیملاق) گاپە، کە حکوومەتی تورکیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دروستی دەکا. بەنداوی ئیلسو لەسەر ڕووباری دیجلە لە نزیک سنووری سووریا و عێراق دروست دەکرێ و بڕیارە درێژییەکەی دوو کیلۆمەتر و بەرزییەکەشی ١٠٠ مەتر دەبێ و ٢ بلیۆن دۆلاریشی تێ دەچێ. ڕووبەری ئەو دەریاچەیەی کە دروستیشی دەکا ١٢١

مایل دووجا دەبێت و هەموو زەویوزاری ئەو ناوچەیە دادەپۆشێ؛ جگە لەمە شارە دێرینەکەی حەسەن کێفیش بەبن ئاو دەگرێ.

دەسەڵاتدارانی تورک دەڵێن کە ئەو بەنداوە گەلێک سوودی ئابووری و کۆمەڵایەتیی بۆ دانیشتووانی ناوچەکە دەبێ، کە زۆربەیان کوردن. بەرهەڵستکارانی بەنداوەکەش دەڵێن ئەو بەنداوە پاشماوە کوردییە دێرینەکانی ناوچەکە بە یەکجاری لە ناو دەبا و کولتووری کوردی لەوێ ناهێڵێ و ژینگەی ناوچەکەش دەشێوێنێ. جگە لەمەش، سووریا و عێراق ڕەخنە لەو پرۆژەیە دەگرن و دەڵێن ڕێژەی ئەو ئاوەی کە بۆیان بەردەدرێتەوە زۆر لە ئێستا کەمتر دەبێ. ئەو هەڵمەتە نێونەتەوەیییەی کە دژی دروستکردنی بەنداوی ئیلسو کرا، کۆمپانیا بەریتانیاییە گەورەکەی بالفۆر بیوتی Balfour Beauty قایل بوو واز لەو تەندەرە بێنێ کە بۆ دروستکردنی بەنداوەکە پێشکەشی کردبوو. وا پێشبینی دەکرا کە ئەمە پرۆژەکە چیتر نەهێڵێ، بەڵام لە ۲۰۰۷، تورکیا گەڕاوەتەوە سەر پرۆژەکەو خەریکە بەنداوەکە دروست دەکا.

**بەنداوی دووکان.** بەنداوەکە لە ۱۹۵۰کاندا لە سەر «زێ»ی بچووک (ڕووباری سۆران) لە ناوەڕاستی باکوری کوردستانی عێراق دروست کراوە. دەریاچەیەکی گەورە لە هەورازی بەنداوەکەدا هەیە. ئاوەکەی بۆ ئاودان و بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا سوودی گرینگی هەیە. سەیری (بەنداوی دەربەندیخان و ئاو)یش بکە.

**بەنداوی دەربەندیخان.** لە ۱۹۵۰کاندا لەسەر ڕووباری سیروان و ڕووباری دیالە لە نزیک هەڵەبجەی نزیکی سنووری ئێران، لە کوردستانی عێراقدا دروست کراوە. ئێستا دەریاچەیەکی مەزن لە سەرووی بەنداوەکەدا هەیە و ئاودێرییەکی باش و وزەوی کارەبا بۆ ئەو ناوچانە مسۆگەر دەکا. سەیری (بەنداوی دووکان و ئاو)یش بکە.

**بەیانی ئادار (۱۹۷۰):** مەلا مستەفا بارزانی دانوستانی بەیانی ئاداری ۱۹۷۰ی لەگەڵ حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیدا کرد کە حکومڕانی عێراق بوو، گەورە دانوستانکاری بەعسییەکان سەدام حوسێن بوو. سەدام حوسێن بە پێی بەیانی ۱۱ی ئادار، پەیمانی دا کە ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینە بە گەلی کورد لە عێراقدا بدا و کێشەی کورد بە یەکجارەکی لە عێراقدا بنبڕ بکا. بەیانی ۱۱ی ئادار لە ۱۵ بەندی

گرینگ پێکهاتبوو. لەو چوار ساڵەی کە بڕیار بوو بەیانی ئاداری تێدا پیادە بکرێ، حکوومەتی بەغداد سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکووک و دەوروبەری پیادە کرد، هەردوو گوندی قودس و حەیفای لە باشووری کەرکووک دروست کرد و عەرەبی بەدەوی هێنا لەوێ نیشتەجێی کردن و زەویی کوردانی پێ دان و پرۆژەی بەنداوی حەمرینی بۆ کردن تا بە چاکی زەوییەکان ئاودێر بکەن و لەوێ بمێننەوە و جێگیر بن. لە بەرانبەریشدا گوندەکانی کوردنشینی دەوروبەری کۆمپانیا و چاڵەکانی نەوتی نزیک کەرکووک لە دانیشتوانە کوردەکانی چۆڵکردن. لە ١٩٧١، جیهازی موخابەراتی بەعسییان، ژمارەیەک مەلای بۆمبڕێژ کرد و ڕەوانی کردن تا پێشەوا بارزانی تیرۆر بکەن. مەلایەکان تەقینەوە، بەڵام بە شێوەیەکی دوور لە عەقڵ، بارزانی تەنیا بە سووکی بریندار بوو. لە ئەنجامی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە ناپەسندەی بەغداد دژی کورد ئەنجامی دا، سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد متمانەی بە دەسەڵاتدارانی بەعسی نەماو دڵنیا بوو کە بەیانەکە جێبەجێ ناکا. بۆیە لە ١٩٧٤، مەلا مستەفا بارزانی قایل نەبوو لە بەرانبەر بەعسییەکاندا چۆک دابدا و لە کۆتاییی ئادار و سەرەتای نیسانی ١٩٧٤، شەڕی بەرگری بەرپابووەوە.

هەرچەندە بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، بەهیچ شێوەیەک لەلایەن میری عێراقەوە پیادە نەکرا، بەڵام بنەمایەکی سەرەکی و بەهێزی بۆ خواستەکانی کورد سەپاند کە نابێ هیچ ڕێککەوتنێک لەگەڵ میری بەغداد لە دەستکەوتی نێو ئەو بەیانە کەمتر وەدەست بێنێ. تەنانەت دانوستانی دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١یش کە سەرۆک مەسعوود بارزانی و سەرۆک جەلال تاڵەبانی ئەو کات لەگەڵ خودی سەدام حوسێنیان کرد، لە سەر بنەماکانی بەیانی ١١ی ئادار ئەنجام دران.

**بوجاک.** سەیری (فایق بوجاک بکە) بکە.

**بوجاکەکان.** هۆزێکی لایەنگری حکوومەتە و لە دەوروبەری سیڤەرەکی لە تورکیا نیشتەجێیە. پارتی کرێکارانی کوردستان بە نموونەیەکی زەقی چینی دەرەبەگە گلاوەکانی دەناسێ. «پ. ک. ک» بۆ ئەوەی لە ١٩٧٨ دامەزراندنی خۆی ڕابگەیەنێ، هەوڵی کوشتنی محەمەد جەلال بوجاکی سەرۆکی خێڵەکەی دا، بەڵام سەرنەکەوت. سیداد بوجاک، ئێستا سەرۆکی ئەو هۆزەیە و لەسەر لیستی پارتی ڕێگەی ڕاست،

ئەندامی پەرلەمانی تورکیایە. ئەم سیداد بوجاکە یەکێک لەو کەسایەتییە سەرەکییانە بوو کە لەگەڵ باڵاترین دەسەڵات، هاوبەشیی ئەو ڕووداوە بەدناوەی سوسورلوکی کرد کە بە پیلانی هاوبەشی نێوان هەواڵگری تورکی و تاوانی ڕێکخراوorganized crime ئەنجام درا. سیداد بوجاک سەرۆکایەتیی پتر لە ۲۰۰۰ میلیشیای بەهێزی دەکرد، هەموویان پاسەوانی گوندبوون و مانگانە پتر لە ۱ ملیۆن دۆلاریان وەردەگرت، بۆ ئەوەی بەگژ جوداخوازە کوردەکاندا بچن. سەیری عەشیرەت بکە.

**بورقای.** سەیری **(کەمال بورقای)** بکە.

**بووش.** سەیری **(جۆرج هـ.و. بوش)** بکە.

بوەیهییەکان. بە گشتی بە بنەماڵەیەکی فارسی دەناسرێن و بەوە بەناوبانگن کە لە ۹٤٥ی زاینیدا، بەغدادی پایەتەختی خەلیفەکانی عەبباسییانیان داگیرکرد و تا ۱۰۵٥ دەسەڵاتیان لەدەست ماوە. بەڵام گەلێ لە زانایانی کورد مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەوانە بە ڕەگەز کوردن و لە نەوەی ئەو کوردە دەیلەمی یان دیلەمییانە بوون کە چەند شانشینێکیان دامەزراند. هەندێ بنەماڵەی تری بوەیهییەکان چەندین ناوچەی دیکەی عێراق و ئێرانیان حوکم کردووە.

ناوی بوەیهی لە بوەی یان بویە داڕێژراوە و ئەویش ناوی باوکی ئەو سێ برایە بووە کە بنەماڵەکەیان دامەزراندووە. بوەیهییەکان سەر بە دوازدە ئیمامەکەی شیعەکان بوون و بەرانبەری بە ڕێبازەکانی دیکەی ئیسلام نەرمڕۆ بوون. بنەماڵەی بوەیهییەکان لە کۆتایی چەرخی نەوەی حوکمڕانە عەرەبەکانەوە تا سەدەی ۱۱ حوکمیان کردووە؛ کە تورکەکان هاتن و ناوچەکەیان داگیرکرد. هەندێک لە ئێرانییەکان ئەم کاتە بە سەردەمێکی جودا کردنەوە دەناسن.

**بۆ پێشکەوتنی وڵات (ئیلەری یورت).** گۆڤارێکی لایەنگری کورد بوو، مووسا عەنتەر و هاوەڵەکانی لە سەرەتای ۱۹٥۸، لە دیاربەکر، لە تورکیا، بڵاویان کردەوە. لە چەند لایەنێکەوە ئەم گۆڤارە سەرەتای دەیەیەک لەو بڵاوکراوە کوردییانە بوو کە لە سەردەمی مەیلەو لیبراڵی دۆگوجولوکی ۱۹٦۰ـەکان دەرچوون. گۆڤارەکە لە ۱۹٥۹، لە دوای دەستگیرکردنی ژمارەیەک لە ڕۆشبیرانی کورد، ڕاگیرا.

**بۆتان.** میرنشینێکی کوردییە و ئێستا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیایە. بۆ ماوەی چەند سەدەیەک ئەو میرنشینە لەلایەنی بنەماڵەیەک فەرمانداریی دەکرا کە دەیانگوت لە ڕەچەڵەکی خالیدی کوڕی وەلیدن. خالید کوڕی وەلید، یەکێک لە جەنگاوەرە هەرە ناودارەکانی محەمەد پێغەمبەر بووە. پایەتەختی لە جزیرە بووە. ئەو میرنشینە لە سەردەمی بەدرخان بەگ تا ئەوپەڕ بەرفراوان بووە و پاشتریش هەر لە سەردەمی بەدرخان بەگ، لە ١٨٤٧، لەناو چووە. کوردە نەتەوەپەروەرەکان ئێستا کە باسی هەموو باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەکەن، فرە جار بە میرنشینی بۆتان ناوزەدی دەکەن.

**بیقاع.** سەیری (دۆڵی بیقاع) بکە.

**بێشکچی.** سەیری (ئیسماعیل بێشکچی) بکە.

**بێکەس.** سەیری (شێرکۆ بێکەس) بکە.

## ج

جاش. واتە بێچووە کەر، زاراوەیەکی گاڵتەجارییە، کوردە وڵاتپارێزەکانی عێراق لە سەرەتای ١٩٦٠ـەکاندا، بۆ ناولێنانی ئەو میلیشیایانە بەکاریان هێنا کە پشتیوانیی حکوومەتی عێراقیان دەکرد. حکوومەتی عێراقیش لەلای خۆیەوە ناوی لێ نابوون "فرسان صلاح الدین" (سوارەکانی سەلاحەدین). هەموو جاشەکان نا، بەڵام زۆربەیان هۆزەکانیان دوژمنی مەلا مستەفا بارزانی بوون. پاش چەند ساڵێک ئەم زاراوەیە پەرەی سەند تا وای لێ هات هەر کوردێکی لایەنگری حکوومەت با، بۆ لە قیمەت کەمکردنەوەی، مۆری جاشایەتیی پێوە دەنووسا. بەهۆی ئاڵۆزی و ناسکیی هەڵوێستەکانی مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی، گەلێ جاران دوژمنەکانیان بە جاش ناویان دەبردن.

تا ١٩٨٦، لە نێوان ١٥,٠٠٠ تا ٢٥,٠٠٠ جاش لە کوردستانی عێراقدا هەبوون. ئەوانە باش مەشق نەدرابوون، چەکی باشیان نەبوو کە بتوانن چالاکی گەورەی پێ بکەن، تەنیا دەیانتوانی ڕێگەکان بگرن تا سوپای عێراق بتوانی بە ئازادی دژی ئێران شەڕ بکا. هەندێ جار ئەو جاشانە شەڕی قورسیان دژی کوردە نیشتمانپەروەرەکان دەکرد، بەڵام زۆرجاران لە نێوان خۆیاندا ڕێک دەکەوتن و بەرەنگاری یەکتری نەدەهاتن. لە کاتی ڕاپەڕینەکەی کوردان لە١٩٩١، زۆربەی جاشەکان وازیان لە حکوومەت هێنا و لای شۆڕشگێڕەکانیان گرت و ئەمە بووە هۆی سەرەکی کە کوردە وڵاتپارێزەکان ئاوا بە ئاسانی بتوانن لە سەرەتای ڕاپەڕینەکەیان ئەو هەموو ناوچە فراوانانەی کوردستان ئازاد بکەن و سوپای لێ وەدەرنێن. لەوەتی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردستان لە سەرەتای ١٩٩٠ـەکاندا دروست بووە، تا ئێستا هیچ ڕێکخراوێکی جاشان وەک میلیشیای سەر بە حکوومەت لە کوردستانی عێراقدا کاری نەکردووە. ئەم زاراوەیە تا ئێستاش لە ناو کوردان بۆ حەیابردن بەکار دێ.

**جاف.** عەشیرەتێکی گەورەی بەهێزی کوردە. لە دێرزەمانەوە لەسەر سنووری نێوان دوو ئیمپراتۆری عوسمانی و فارسیدا نیشتەجێنە، کە ئێستا باشووری

کوردستانی عێراق و بەشێک لە دوو ئوستانی کوردستان کرماشانی کوردستانی ئێران دەگرێتەوە. دەڵێن عەشیرەتی جاف لە نەوەی سەلاحەدین. لە ١٩٢٠کان، جاف بەرهەڵستی شێخ مەحموودیان کرد و دژی بەریتانییەکانیش بوون؛ چونکە ئۆتۆنۆمییان بۆ کورد لە عێراق مسۆگەر نەکرد. ئەو نوێ کردنەوە و بەچڕی دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتی و دامەزرانی حکوومەتی کاریگەر، لە گرینگێتیی جافی کەم کردووەتەوە. جاف شاعیری کورد پەروەری هەبووە؛ ئەحمەد موختار جاف (١٨٩٧ – ١٩٣٥) دەڵێ:-

دێتە گوێم دەنگێ بە سۆز و شێوەن و گریانەوە
ناڵەیی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە
لانەواز و بێکەس و مەزلوومن ئێستا قەومی کورد
گاه بەدەستی تورکەکان و گا بەدەست ئێرانەوە

سەیری (عەشیرەت) بکە.

**جزرە. (جەزیرەی بن عومەر)یشی پێ دەڵێن.** شارێکی سنووری باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیایە و لە مەرزی هەردوو وڵاتی سووریا و عێراقەوە نزیکە. هەرچەندە پێشتریش ئاوەدانی لەو شارەدا هەبووە، بەڵام دەڵێن بە ناوی حەسەنی کوڕی عومەرەوە کراوە کە لە ٨٦٥دا مردووە. ناوی جزرە، لەوەدا هاتووە کاتێک کە ئەو کەناڵەی هەردوو لقی ڕووباری دیجلە بەیەک دەگەیەنێ، لەوێ هەڵکەندراوە. پاشان ڕووبارە سرووشتییەکە وشک کراوە و لە دامێنی شاری جزرە و لە ناو ڕووباری دەیجلە، پاشماوەی پردێکی قەشەنگ، هێشتا هەر هەیە و یەک کەوانەی ٢٨ مەتریی لێ بە پێوە ماوە و چەند وێنەیەکی بازنەیی ئەستێرەوانیی لەسەر تاشراوە.

لە چەرخەکانی ناڤیندا، جزرە بەندەرێکی گەشەکردووی سەر ڕووبارەکە بووە. بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش، میرە کوردەکان فەرمانڕەوایی ئەو شارەیان کردووە. لە سەدەی ١٢دا، جزرە ناوبانگی بە زانا و نووسەر و ئیمامەکانییەوە دەرکردووە. لە سەرەتای سەدەی ١٩دا، جزرە پایەتەختی میر بەدرخان بەگی میری بۆتان، بووە. دوای بەزینی بەدرخان، بەدەستی عوسمانییەکان، ئاشی جزیرە کەوتووەتە لێژییەوە.

**جزیری.** سەیری (مەلای جزیری) بکە.

**جگەرخوێن.** سەیری (شێخ مووس حەسەن) بکە.

**جەتم.** یان دەزگای هەواڵگریی جەندرمە و دژە تیرۆر. هەرچەندە کە بە فەرمی نکووڵی لێ دەکەن، بەڵام ئەمە دەزگایەکی هەواڵگریی جەندرمەی تورکییە. لەمیانی شەڕی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان، جەتم بە شێوەیەکی نایاسایی بە قاچاغ بازرگانی بە چەک و بە درەگ (کەرستە بێهۆشکەرەکان)ـەوە دەکرد. بە هۆی چالاکییەکانی دژی گەریلاش، ترسێکی زۆری لە دڵی هاووڵاتییان نابووەوە.

**جەرمەنستان.** نیشتمانی زۆرترین کوردی تاراوگەیە لە ئەوروپا. ڕەنگە ئێستا پتر لە ٥٠٠,٠٠٠ کورد لە جەرمەنستاندا بژین. هەر لەبەرئەمەشە، کە کورد لە ماوەی سالانی ڕابردوودا، زۆر لە تایبەتمەندییەکانی خەباتی خۆیانیان لەو وڵاتەدا جێ کردووەتەوە. ئەڵمانیا لە ١٩٩٣، پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک)ی قەدەغە کرد، بەڵام هێشتا کاری خۆی لەوێ هەر ڕادەپەڕێنێ.

**جەزیرە (جزیرە).** گەورەترین و پڕ حەشیمەتترینی ئەو سێ پارێزگایە کوردییەیە کە لە سووریایەو لەگەڵ دووەکەی تر سنووریان بەیەکەوە نەنووساوە. جەزیرە کە دەکاتە –دوورگە– ئامارە بۆ هەمان باری ئەو شوێنە جیۆگرافییەی هەیە کە میسۆپۆتامیای یۆنانییەکان هەیەتی؛ مانای زمانەوانیشی (وڵاتی نێوان دوو ڕووبار) دەبەخشێ، کە (دەیجلە و فورات)ن. ناوی مێسۆپۆتامیای ژووری بوو بە جەزیرە و مێسۆپۆتامیای ژێریش بوو بەعێراق . هەندێک دەڵێن (عێراق یان ئێراق) واتای فرەڕەگ دەبەخشێ، بەڵام ڕەنگە هەر ناوێکی کۆن بێ. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە، بەشێکی جەزیرەی کەوتووەتە ناو تورکیا و بەشێکی سووریایە و بەشێکیشی لە عێراقییە.

زۆربەی ئەو کوردانەی کە ئێستا لە جزیرەدا دەژین، حکوومەتی سووریا بە بیانییان دەناسێ و مافی هاووڵاتێتی لێ وەرگرتوونەتەوە. هۆی ئەوەش ئەوەیە کە زۆربەی ئەوکوردانەی لە جەزیرەدا دەژین، لە دوای هەرەسهێنانی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥ و ڕاپەڕینەکانی دوای ئەویش، لە تورکیا ڕایان کردووە و

هاتوونه لەوێ جێگیر بووینه. سووریا بە فەرمی بە ناوچەی جەزیرە دەڵێ حەسەکە.

ئەم هێڵە سنوورەی ئێستای نێوان سووریا و تورکیا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، فرەنسییەکان و تورکەکان کێشایان. ئەم نیشانکردنە ناوچەیەکی بۆ سوورییەکان دیار کرد کە فرەنسییەکان پێی دەڵێن: (دەندووکی مراوی le Bec de Ca-nard). ئەمەش ڕووبەرێکی زۆری ئەو خاکە دەگرێتەوە کە بەرەو عێراق درێژ دەبێتەوە و تا جەرگەی کوردستان دەچێ.

**جەلال تاڵەبانی (١٩٣٣ –       )**. لە حوزیرانی ١٩٧٥، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی دامەزراند و لەو کاتەوە تا ٢٠٠٧، هەر لە پۆستی سکرتێری گشتیی ئەو حزبە ماوە. جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لەمێژە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی لە عێراقدا دەکەن. جەلال تاڵەبانی لەسەر ئاستی جیهان بە مام جەلال ناسراوە. هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد هاوسەریەتی. هێرۆ شوێنی خۆی لە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا کردووەتەوە.

جەلال تاڵەبانی لە گوندی خەلەکان، لە نزیک دەریاچەی دۆکان بووە. خانەوادەی تاڵەبانی بە لانیکەم ٣٠٠ ساڵێک دەبێ هەیە. شێخەکانی تاڵەبان پەیڕەوی ڕێبازی قادری دەکەن و ڕۆڵێکی ئایینی و سیاسیی فرە گرینگیان لەناو کوردەواریدا گێڕاوەو ئەمەش لە سەرەتادا یارمەتیی جەلال تاڵەبانیی داوە بۆ ئەوەی بناسرێ.

مام جەلال بە درێژاییی ژیانی لە بواری سیاسیدا چالاک بووە. لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا کۆمەڵەی قوتابییانی کوردی بە نهێنی دامەزراندووە. ساڵی پاشتر پێوەندیی بە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە. کە تەمەنی گەیشتە ١٨ ساڵان، بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا. کە لە کۆلێژی یاسای زانکۆی بەغداد دەرچوو، لە ١٩٥٩، فەرماندەی هێزێکی زرێپۆشی سوپای عێراق بووە و کاری ڕۆژنامەگەریشی کردووە.

هاوڕێ لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەدی خەزووری وێکڕا ئەندامی پۆلیتبیرۆی «پ. د. ک» بووینەو ناوە ناوە نێوانیان لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی ئاڵۆزیی تێ کەوتووە. لە کاتێکدا بارزانی بە تاڵەبانی دەگوت: (سیخوڕی هەموو کەسێکە،) واتە بۆ هەموو

کەسێک ئیش دەکا، بەڵام تاڵەبانی لە دوا ساڵەکانی ژیانی بارزانیدا چالاکیی زۆر کەمی هەبووە. لە دوای پیلانەکەی جەزایر و هەرسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول لە ۱۹۷٥، جەلال تاڵەبانی «ی. ن. ک»ی دامەزراند و لە ۱۹۷۷ بۆ باشووری کوردستان هاتەوە.

لەوکاتەوە ئیتر ژیانی تاڵەبانی لەگەڵ خەباتی کوردایەتی لە کوردستانی عێراق و لەگەڵ سیاسەتی «ی. ن. ک» ئاوێتە بووە. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، هاوڕێ لەگەڵ سەرۆکی «پ. د. ک» مەسعوود بارزانی بە دوو قوڵی سەرکردەی سەرەکیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی کوردستانی باشوور بووینە. پێوەندیی نێوان مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی هەمیشە پابەند بووە بە کۆششی «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بۆ ئەوەی دەسەڵاتی پتر لە نێو کوردەکانی عێراقدا بەدەست بێنن و ئەمەش وای کردووە کە هاوکاریی پتری یەکتری بکەن بۆ ئەوەی کێشەی گەلی کورد پتر بۆ پێشەوە ببەن. هەرچەندە کێشەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە بەم چەند وشەیە چارەسەر بکرێ، بەڵام هەنە دەڵێن کە تاڵەبانی لە بارزانی پێشکەوتنخوازترە.

ئەگەر لەگەڵ بارزانی بەراوردی بکەن، دەبینین کە تاڵەبانی لەو گەڕیدەترە و لە ئاستی جیهانیشدا، پتر دانوستانی کردووە. لە دوای دۆڕاندنی ڕژێمی عێراقی لە شەڕی ۱۹۹۱، تاڵەبانی بە سەر کۆنە تەگەرەکاندا زاڵ بوو و سەردانی ئەنکارای کرد و لەوێ لەگەڵ تۆرگوت ئۆزالی سەرۆکی تورکیا کۆبووەوە. لەمیانی دانوستانە دوورودرێژەکەی لەگەڵ حکوومەتی عێراق لە ۱۹۹۱، سەدام حوسێن بە مونافیقاتی ماچێکی لە کوڵمی جەلال تاڵەبانی کرد و ئەویش ماچی کردەوە. جەلال تاڵەبانی ئینگلیزییەکی باش دەزانێ و چەندین جار سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و تورکیا و سووریا و ئێران و فرە شوێنی دیکەشی کردووە. زۆر لە ئەندامانی خانەوادەکەی لە بەریاتانیادا دەژین.

هەرچەندە تاڵەبانی بەوە بەناوبانگە کە وەک جیوەیە و بۆ حاڵی خۆی زۆر زیرەکە بەڵام هێشتا لە پێشەنگی کوردایەتی و مافەکانی مرۆڤ و پێشکەوتنخوازی و ئەو ئەزموونەی ئەو هەیەتی؛ لە نێو سەرکردە هاوچەرخەکانی کورد، پارسەنگی نییە.

لە دوای ڕووخانی سەدام حوسێن، جەلال تاڵەبانی وەک ئەندامێکی ئەنجوومەنی

حوکم دەستنیشان کراو پاشان لە دوای هەڵبژاردنە گشتییەکانی ٢٠٠٥، بە تێکڕای دەنگی پەرلەمانی عێراقی، بە سەرۆک کۆمار هەڵبژاردرا و بەمەش لەوەتی عێراق لە ١٩٢٣دا دامەزراوە تا ئێستا، مام جەلال بووە یەکەم کورد سەرۆکایەتیی عێراق بکا و گەورە مەلای شیعەکان عەلی سیستانی بە کلیلی ئاسایشی عێراقی ناوزەد کرد. مام جەلال لە سەرەتای ٢٠٠٧، تووشی ماندووبوونێکی لە ڕادەبەدەر هات و ناچار بوو بۆ دکتۆر ماوەیەک لە عەممانی پایتەختی ئۆردن بمێنێتەوە و پاشان بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی ڕووی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد.

**جمیل بایک (جومعە).** یەک لە دامەزرێنەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان «پ. ک. ک» بووە و تاکە کەسێکە لەوان کە هێشتا هەر ماوە و ئازادانە دەژی. بۆ ماوەیەکی زۆر، لە دوای عەبدوڵڵا ئۆجەلان، بە کەسایەتیی دووەمی ناو «پ. ک. ک» دەناسرا. بایک بۆ ماوەیەکی زۆریش سەرۆکی سوپای ئازادیی گەلی کوردستان بوو، کە سوپایەکی پیشەوەری «پ. ک. ک» یە. دوای گیرانی ئۆجەلان لە ١٩٩١، بایک بووە ئەندامێک لە ناو ٨-١٠ ئەندامەکانی سەرۆکایەتیی «پ. ک. ک»، ئەوانە لەجێی ئۆجەلان سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردی باکوری کوردستان دەکەن.

**جەنبولاتییەکان.** بنەماڵەیەکی ناوداری دورزییەکانە لە لبنان دەژی. جەنبولاتییەکان بە ڕەگەز کوردن، ناوەکەیان بە کوردی دەکاتە (جان پۆلا). وا باوە کە جانبولاتەکان بە ڕەچەڵەک لە نەوەی بنەماڵەی ئەو ئەیوبییانەن کە لە ١١٧١، سەلاحەدین دای مەزراند. لەم سەردەمەشدا، کەمال جەنبولات و پاشی ئەویش وەلید جەنبولاتی کوڕی ڕۆڵێکی سەرەکی لە سیاسەتی لبنانی دەگێڕن. ژمارەی دانیشتوانی کورد لە لبنان لە نێوان ٧٥,٠٠٠ بۆ ١٠٠,٠٠٠ کەس خەملاوە.

**جۆرج هـ. و. بووش ( ١٩٢٤ - )** لە ڕۆژانی شەڕی یەکەمی کەنداو لە ١٩٩١، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە. دوای بەزینی عێراق، بووش لە کورد و لە شیعەی خواست دا ڕاپەڕن. کە ڕاپەڕین، وڵاتە یەکگرتووەکان شتێکی نەکرد کە ڕێ لە سەدام حوسێن بگرێ و نەهێڵێ ئەو هێزانەی کە مابوو بۆ سەرکوتکردنیان بەکار بێنێ. ئەو کۆڕەوەی کورد لە ئەنجامی هەرەسهێنانی ڕاپەڕینەکەیان بەرەو ناوچە شاخاوییەکان کردیان، وای کرد بووش چاو بە بڕیاری

بەرهەڵستی کردنی یارمەتیدانی کورداندا بخشێنێتەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کومفورتی پیادە کرد بۆ ئەوەی ناوچەیەکی ئارام و هەرێمێکی دژە فرینیش بۆ پاراستنی کوردان دابمەزرێنێ تا وایان لێ بکا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان و دەوڵەتێکی دیفاکتۆی کوردی دابمەزرێنن. بەمجۆرە بووش یارمەتییەکی کەمی بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی سەدام حوسێنی دا. لە یەنایری ١٩٩٣، نەیتوانی هەڵبژاردن لە بیل کلنتن بباتەوەو ماوەی سەرۆکایەتییەکەی کۆتایی هات. پاشتر جۆرج و. بووشی کوڕی هەڵبژێردراو لە ٢٠٠١ بووە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان.

**جۆرج و. بووش ( ١٩٤٦ –      )**. کوڕی سەرۆک جۆرج هـ.و. بووشە و لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی پڕ لە مشتومڕدا لە ١١ی نۆڤێمبەری ٢٠٠١ بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان هەڵبژێردرا. لە سەرەتادا، بووشی گەنج پێ دەچوو لە سەرۆکایەتیی پشتیوانییەکەی نەختێک کەم بێ، بەڵام پاشتر، کە بە توندی وەڵامی کردەوە تێرۆریستییەکەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ی ئەلقاعیدەی داوە؛ ئیتر خێرا لە سەرتاسەری ناوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکان پشتیوانییەکی بێ پایان کرا.

**جوروکایە (تیلکی)**. سەیری (سەلیم جوروکایە) بکە.

**جوندولئیسلام**. سەیری (ئەنسارولئیسلام) بکە.

**جووە کوردەکان**. کۆمەڵگەی کوردە جوولەکەکان لە دێرزەمانێکی نادیارڕا تا ١٩٤٨، کە کۆچیان بۆ ئیسرائیل کرد، هەر هەبووە. بە گوێرەی مێژوو، ئەو کۆمەڵگە و کۆمەڵی گەورەتری جوولەکە دەچنەوە سەر ئەو ١٠ هۆزە جوولەکەیەی کە بزربوون. لە ئنجیل باس دەکا کە ئاشوورییەکان لە ٧٢٢ی پ.ز. ئیسرائیلی کۆنیان داگیر کردو ئەو دە هۆزە جوولەکەیان بۆ ئاشوور بانش کرد. هەندێ سەرچاوەی تری مێژوویی دەڵێن کە بابلییەکان لە ٥٨٦ی پ.ز. ئۆرۆشەلیمیان گرت، ئەو جوولەکانەیان بە دیلی هێنا.

قسەی وا هەیە کە ڕۆژانی پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ١٩٤٨، ١٨٧ کۆمەڵە جوولەکەی کورد هەبووە: ١٤٦یان لە عێراق و ١٩یان لە ئێران و ١١یان لە تورکیاو ١١ی دیکەشی لە سووریا و لە شوێنەکانی تر بووە. ئەو خەملاندنە باسی

ئەوەش دەکا کە ڕەنگە ۲٥,۰۰۰-۳۰,۰۰۰ کوردی جوولەکە هەبووە، لەوانە ۲۲۰۰۰، یان لە کوردستانی عێراق ژیاون. کۆمەڵەی گەورەی جوولەکان لە عێراق ۱۲٥,۰۰۰ کەس بووە.

وا پێ دەچێ کە کوردە جوولەکەکان لەگەڵ کوردەکانی دیکە بە ئاشنایی پێکەوە ژیابن. کوردە موسڵمانەکان لە ئاهەنگ و بۆنە ئایینییەکانی کوردە جوولەکەکان ئامادە دەبوون و زۆر جاریش هەر بەشدارییان لەگەڵدا دەکردن. جاری ئاوهاش بووە کوردە موسڵمانەکان دەستدرێژی نامووسییان کردووەتە سەر کوردە جوولەکە خزمەکانی خۆیان و ماڵ و سامانیان زەوت کردوون و واش بووە تەنانەت کوشتووشیانن، بەڵام هەمیشە کوردە جوولەکەکان توانیویانە خۆیان دەرباز بکەن و بکەونەوە سەر ڕێ.

توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە کوردە جوولەکەکانیش وەک برا کوردە موسڵمانەکانیان دڕ بووینە و پەنایان بردووەتە بەر توندی و تیژی و ڕێگریشیان کردووە. کوردە جوولەکەکانیش ئازا و نەترس و بەهێز بووینە. نوکتەیان بەزۆری دەربارەی مێبازی و پیس بووە. زۆربەی هەڵسوکەوتیان وەک هی موسڵمانەکان بووە. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە کوردە جوولەکەکان وەک کوردە موسڵمانەکان نەخوێندەوار نەبووینە، بەڵکو کۆمەڵێکی بە سەوادیان هەبووە. کوردە جوولەکەکان زمانی ئارامیی نوێ (تارگوم)یان بەکارهێناوە.

دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی ئیسرائیل، ئەو کۆمەڵە ۲,٥۰۰ ساڵ کۆنانەی لەناودا کۆبووتەوە. لە سەرەتای ۱۹٥۰کان، جوولەکەکانی عێراق بە کۆمەڵ لە عێراقوە بە فڕۆکە ڕەوانی ئیسرائیل کران و لەوێ زوو لەناو کۆمەڵگە نوێیەکەیان توانەوە. لە ۱۹۹٤، دانەری ئەم کتێبە لەگەڵ چەند کوردێکی موسڵمانی عێراقی سەردانی دامەزراوێکی کوردی جوولەکەیان لە نزیکی ئۆرۆشەلیم کرد. هەردوو کۆمەڵە کوردەکە زۆر بە سۆزی برایەتییەوە سڵاویان لە یەکتری کرد. لە کۆتاییی ۱۹۹۰ـەکان، ئیسحاق مۆردەخای کە کوردێکی جوولەکەیە، لە یەکێک لەو کابینانەی لیکود، پلەی وەزیری بەرگریی ئیسرائیلی وەرگرت.

**جینۆساید.** سەیری (کۆمەڵکوژی) بکە.

## چ

**چاڵدێران.** سەیری (شەڕی چاڵدێران) بکە.

**چواردە خاڵەکان:** هەرچەندە ئەم چواردە خاڵانەی لە یەنایری ١٩١٨دا بە مەبەستی کۆتاییهێنانی شەڕی یەکەمی جیهانی، سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ودرۆ ویلسن، ڕێکی خستن، فرە ئەندێشەبەخش بوون، بەڵام هێشتا ئەوپەڕ کاریگەرییان هەبوو. جگە لەمەش مەبەستێکی پرۆپاگەندەی بۆ هاوپەیمانان تێدا هەبوو.

خاڵی ١٢یەمی ویلسن، جاڕی ئەوەی دا کە مافی (خۆ بەڕێوەبردن و گەشەکردن autonomous and self- development) بۆ کەمینە نا-تورکەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەبێ مسۆگەر ببێ. ئەمە، بێگومان، بەرنامەیەک بوو بۆ ئەوەی کورد بتوانێ خۆی بەڕێوە ببا و تەنانەت سەربەخۆییشی ببێ. ڕێککەوتنەکەی سایکس - پیکۆ، لە نێوان بەریتانیای مەزن و فرەنسا هەندێ مەرجی دیکەی بۆ کەمینەکان دانا و ئیتر ئۆتۆنۆمییەکەی کورد نەیتوانی گەشە بکا.

**چەکی کیمیایی.** لەمیانی شەڕی ئێران - عێراق (١٩٨٠- ١٩٨٨)، عێراقییەکان چەکی کیمیاییان دژی ئێران بەکارهێنا. بەکارهێنانی ئەم چەکە بەپێی یاسای نێونەتەوەیی بە ڕاشکاوی قەدەغە بوو. لە کۆتایی شەڕەکەدا، عێراق ڕووی چەکە کیمیاییەکانی خۆی لە کوردی عێراق کرد، چونکە لە شەڕەکە پشتیوانیی ئێرانێیان کردبوو. ژەنڕاڵ عەلی حەسەن مەجیدی پسمامی سەدام حوسێن، کە فەرمانداری باکوری عێراق بوو، لە ناو شاڵاوە سەربازییەکانی ئەنفال بێبەزەییانە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێنا و لە ١٦ ئاداری ١٩٨٨، هێرشە دژوار و بەدناوە کیمیاییەکەی بۆ سەر هەڵەبجە ئەنجام داو ٥٠٠٠ کوردی کوشت.

ئەو چەکە کیمیاییانەی کە حکوومەتی عێراق بەکار بردن، لە گازی خەردەل و گازی دەمارو گازی ساینایدو هەندێ گازی دیکەش پێک هاتبوون. لە ئاستی جیهانیدا، کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی کاردانەوەیەکی زۆر کەمی دژی ئەو پێشێلکردنە

ڕاشکاوانەی یاسای نێونەتەوەیی، نیشان دا. ئەم شێوە بەکارهێنانەی چەکی کیمیایی، لەو کاتەی کە یاسای نێونەتەوەیی پشتگوێیان دەخا، ڕوونی کردەوە کە کورد چەند ناسکن و دەکرێ چەند بە ئاسانی زیانی لێ بدرێ و چەندیش بە ئاسانی دەشێ جینۆساید بکرێن.

## ح

**حاجی تەوفیق.** سەیری (پیرەمێرد) بکە.

**حاجی قادری کۆیی (١٨١٧– ١٨٩٧).** ئەو هۆزانە بوو کە هەموو ژیانی خۆی بۆ پشتگیریکردنی هزری کوردایەتی تەرخان کرد و یەکێک لە یەکەم کەسایەتییە چالاکەکانی بواری کوردپەرەوەری بوو. هەرچەندە حاجی قادر بەخۆی مەلا بوو، بەڵام هێشتا لە ڕووی سەرکردە خێڵەکی و ئاینییەکان وەستا و باوەڕی وابوو کە کورد تەنیا ئەو کات دەتوانێ دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێ، ئەگەر قەڵەم و هێز پێکەوە بەکار بێنێ؛ واتە نووسین و خوێندەنەوەی هەبێ و بە هێزیش پشتیوانییان لێ بکا. بۆیە داوای لە کورد کرد بایەخ بە نووسین بدەن و بڵاوی بکەنەوە. شیعرە نیشتمانییەکانی هێشتا هەستی نەتەوەیی هەر گڕ دەدا. سەیری (ئەدەب) بکە.

**حکوومەتی هەرێمی کوردستان (KRG):** ئەو دەزگا یاساییەیە کە لە دوای کشانەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی بەعسی بەغداد لە کوردستان و لە پاش ئەو هەڵبژاردنە گشتییەی ١٩ی ئایاری ١٩٩٢ کرا، دامەزرا و لەو کاتەوە ئەو دەوڵەتە دیفاکتۆیە بەڕێوە دەبا کە لە هەرێمی کوردستان دروست بووە.

لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١ و سەرکوتکردنەوەی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی ئاداری ١٩٩١ی گەلی کوردستان و کۆڕەوی گەورەی پەنابەرانی کورد کە هانایان بۆ شاخەکانی کوردستان و وڵاتانی دراوسێ (ئێران و تورکیا و سووریا) برد، وڵاتە یەکگرتووەکان، بە پشتیوانیی بەریتانیا و فەرەنسا، ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفۆرتی بۆ ئارامکردنەوەی ناوچەکە دەست پێ کرد. ئەم ئۆپەراسیۆنە ناوچەیەکی ئارام و ئاسمانی دژە فڕینی دامەزراند. ئۆپەراسیۆنەکە ناوچەکەی پاراست و نەیهێشت حکوومەتی عێراق چیتر پەلاماری دانیشتوانە کوردەکەی بدا و توانیی پەناهەندەکان هان بدا و بیانگەڕێنێتەوە بۆ سەر ماڵەکانی خۆیان. ئەوەی پێشبینی نەدەکرا، بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ژمارە ٦٨٨ی ڕۆژی ٥ی نیسانی ١٩٩١ بوو. ئەو بڕیارە (سەرکوتکردنی دانیشتوانە سیڤیلەکانی عێراقی...لە

ناوچە کوردنشینەکاندا) ڕیسوا کرد و داواشی کرد (عێراق...دەمودەست هەموو سەرکوتکارییەک بوەستێنێ.)

هەڵبژاردنەکەی ١٩ی ئایاری ١٩٩٢، کە لە ناوچە پارێزراوەکەی هەرێمی کوردستان ئەنجام درا، ڕکابەرکێی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان، بە سەرۆکایەتیی مەسعوود بارزانی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە جەلال تاڵەبانی، سکرتێری گشتیی بوو، گەرم کرد. هەردووکیان دەیانویست پۆستی سەرۆک وەربگرن و زۆرینەی پەرلەمانیان هەبێ. ژمارەیەک پارتی دیکەش لەو هەڵبژاردنەدا پشکداربوون؛ بەڵام تەنیا یەک لەو گرووپانەش نەیتوانی سەکۆی ٧ لەسەدی بەر دەمی بشکێنێ و دەرگای پەرلەمان بکاتەوە. «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بڕیاریان دا، هەڵبژاردنی سەرۆک دووبارە نەکەنەوە؛ هەرچەندە پارتی دێمۆکراتی کوردستان ٥١ لە سەد و یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش ٤٩ لە سەدی دەنگەکانی هێنابوو، بەڵام پارتی قایل بوو کە لەگەڵ یەکێتی پەنجا پەنجا دەسەڵات نیوە بکات. لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٩٢، بۆ یەکەم جار پەرلەمانی کوردستان لە هەولێر کۆبووەوە وە ئەنجوومەنێکی وەزیرانی بە سەرۆکایەتیی فواد مەعسووم لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٩٢، پێک هێنا.

هەر لە سەرەتاوەڕا، تورکیا و ئێران و سووریا کۆسپیان لەسەر ڕێی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دانا، بۆ ئەوەی نەهێڵن هیچ جۆرە بیرۆکەیەکی بەڕێوەبەرایەتیی کوردی یان دەوڵەتێکی کوردی جووڵە بکا. لێرەدا وا باشە باسی ڕژێمی سەدام حوسێن هەر نەکەین؛ چونکە ئەو خراپییانەی ئەو کردی ناگەڕێنەوە. هەر یەکێک لەو دەوڵەتە دراوسێیانە ترسی ئەوەیان هەبوو ئەم دەزگا کوردییە نوێیە، کوردەکانی ئەو وڵاتانە بجووڵێنێتەوە. جگە لە تەگەرەکانی ئەو وڵاتانە، حکوومەتی هەرێمی کوردستان دووچاری تەگەرەی ئابووری هات و بڕیارەکانیشی لەبەر کەم دەسەڵاتی نیوە بەنیوەوە، جێبەجێ نەدەکرا و دووچاری مەیلەو ئیفلیجییەک هاتبوو. هاوبەشی نەکردنی بارزانی و تاڵەبانی لە پۆستی حکوومەت بارەکەی هێشتا گرانتر کرد.

لە دیسێمبەری ١٩٩٣، شەڕ لە نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان بەرپا بوو. پاشان لە ١ی ئایاری ١٩٩٤، پارتی

دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان شەڕێکی دژواری خۆکوژییان دەست پێ کرد. شەڕەکە تاوێ دەوەستا و دەمێک هەڵدەگیرسایەوە. پتر لە ۳,۰۰۰ کوردی تێدا کوژرا. ناخۆشی زۆری لێ کەوتەوە. وێرانکاری لێ بەجێما. تەنانەت بوونی حکوومەتی هەرێمی کوردستانیشی لە مەترسی دانا. شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دوو حکوومەتی لاوەکی بێ دەسەلاتی لێ هاتە کایەوە: «پ. د. ک» کەوتە هەولێر و «ی. ن. ک»یش لە سلێمانی جێی خۆی کردەوە. تەنیا پەرلەمان بە یەکگرتوویی ماوە و لە بارەگای فەرمی لە هەولێر کۆدەبووەوە. ولاتە یەکگرتووەکان بەبەردەوامی و ناوە ناوەش بەریتانیا و ئێران و سووریا و تورکیاش هەوڵی ناوبژیوانییان دەدا. لە دوا قۆناغدا ولاتە یەکگرتووەکان توانیی لە سێپتێمبەری ۱۹۹۸، ئاگربەستێک لە نێوانیان ڕێک بخاو شەڕەکە ببڕێنێتەوە.

ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان ۳,٤ ملیۆن کەسە. لەوانە لە نێوان ۱۰۰,۰۰۰ بۆ ۲۰۰,۰۰۰ تورکمانن و ۵۰,۰۰۰ ئاشوورینە. ئێستا نزیکەی ۷۵ لە سەدی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە شارەکاندا دەژین و نزیکەی ۲۵ لە سەدیان لە گوند ژیان بەسەر دەبەن. هەولێر لە هەوراز ۱ ملیۆن کەسی تێدا دەژی و ژمارەی دانیشتوانی سلێمانییش کەمێک ژێرترە. حکوومەتی هەرێمی کوردستان، ئیدارەی هەولێر هەردوو پارێزگای هەولێر و دهۆکی بەڕێوە دەبرد و ژمارەی دانیشتووانیان ۲،۲ ملیۆن کەس دەبوو و حکوومەتی هەرێمی کوردستانی ئیدارەی سلێمانییش هەر سلێمانیی بەڕێوە دەبرد و دانیشتوانەکەی ۱,۲ ملیۆن دەبوو. نزیکەی ۹۰۰,۰۰۰ هاوولاتی لە ناوەوە بە هۆی شەڕەکە ناچار بووبوون بار بکەن و ڕێژەی ۲۰۰ کەسیش مانگانە بە هۆی تەقینەوەی ئەو مینانە دەکوژرێن کە دەیان ساڵە حکوومەتەکانی بەغداد لە کوردستانیان ناشتوونە. هەرچەندە هەوڵی زۆر بۆ لەناوبردنیان دراوە، بەلام ئابڕووکوژی ژن هێشتا وەک گرفتێکی کۆمەلایەتی هەر باوە.

لە دوای ڕاپەڕاندنی بڕیاری ۹۸٦ی ١٤ی نیسانی ۱۹۹۵ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ناسراو بە نەوت بە خۆراک، باری ئابووریی کوردستان بە

شێوەیەکی زەق بەرەو پێشەوە چووە؛ چونکە بە پێی ئەم بڕیارە ١٣ لە سەدی داهاتی نەفتەکە بۆ کوردستان هاتەوە. هەر لە ١٩٩٧ەوەڕا تا ٢٠٠١، پرۆگرامی نەوت بەخۆراکی نەتەوە یەکگرتووەکان ٤,٦ بلیۆن دۆلاری بۆ حکوومەتی هەرێمی کوردستان هێنابوو. هەرچەندە بەرنامەکانی FAO و WHO نەتەوە یەکگرتووەکان هەندێ نەنگی تێدا هەبوو، بەڵام هێشتا باری ژیان و تەندروستی و ئابووریی کورد لە هەرێمی کوردستان، لە باری گوزەرانی سەرجەم دانیشتوانی عێراق ئەوانەی لە بن فەرمانی سەدام دەژیان، باشتر بوو. بازرگانیی نێوان کوردستان و تورکیا سوودی زۆری بۆ دانیشتوان و حکوومەتی هەرێم هەبوو.

ڕێگاوبانی نوێ دروست دەکراو قیرتاو دەبوون. خۆراک بایی هەمووان هەبوو. ئاوی خواردنەوە هەبوو، کارەبا کەم بوو، بەڵام ڕۆژانە چەند سەعاتێک هەر هەبوو. بازاڕەکان زرمەیان دەهات و پڕی کەلوپەل بوون. سابوون لە سووریا و لە تورکیاوەڕا دەهات. بۆ یەکەمجار چپسی پەتاتەی ئەورووپی لە بازاڕەکانی کوردستاندا هەبوو. ڕێکخراوە ناحکوومییەکان نزیکەی ٢٩ ملیۆن دۆلاریان لە پرۆژەکانی پەروەردە و دروستکردنەوەی کۆمەڵگە و ئەو شوێنانەی دەستی نەتەوەیەکگرتووەکانی نەدەگەیشتێ، خەرج کرد.

دەستپێکی چالاکییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وەدەر کەوت. دەیان ڕۆژنامە لە بازاڕەکاندا دەردەچن. چەندین وێستگەی تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ پەخش دەکەن و هەر یەکە و بە ئاوازێک دەژەنێ. جۆرە ئازادییەک لە کوردستان هەبوو کە هەرگیز بە خەیاڵی هاووڵاتییانی تری عێراقدا نەدەهات. جگە لە «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» ژمارەیەکی دیکەی پارتی سیاسی قەوارە بچووک لە ناو خەڵکدا چالاکانە کاریان دەکرد و ڕەخنەی پیاوانەیان لە هەردوو پارتە دەسەڵاتدارەکان دەگرت، بێ ئەوەی کەس فشاریان بۆ بێنێ. ئیسلامییەکان بۆ ماوەیەک هەڵەبجەیان کۆنترۆڵ کردبوو. پتر لە ٢٠ لە سەدی سەرجەم کورسی سەرۆکایەتی یەکێتیی قوتابیان و خوێندکاران هی ئیسلامییەکان بوو. لە سێپتێمبەری ٢٠٠١یش شەڕی نێوان ئیسلامییە توندڕەوەکان و «ی. ن. ک» لە نزیکی هەڵەبجە دەستی پێ کرد. لە ٢٠٠٠ بوو شەڕ لە نێوان «پ. ک. ک»و«ی. ن. ک» قەوما.«پ. ک. ک» بنکەیان لە هەرێمی کوردستان بوو.

هەموو هەرێمی بەر ئیدارەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ١٠ نەخۆشخانەی تێدا هەبوو. بەڵام دکتۆرەکانیان پێویستی پتریان بە مەشقکردن هەبوو. دکتۆری پسپۆر زۆر پێویست بوون. پسپۆری نیورۆلۆجست neurologistو پسپۆری نەشتەرگەریی جوانکاری plastic surgeon، زۆر کەم هەبوون. کارەبا زۆر دەکوژاوە، بەڵام نەخۆشخانەکان جێنێرێیتەری کارەبایان هەبوو. نەخۆشیی شێرپەنجە زۆر بوو، ڕەنگە ئەمەش لە ئەنجامی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بووبێ. چارەسەری کیمیایی chemotherapy لە هەرێمدا نەدەکرا. بە کەمترین پارە زۆربەی ڕاژەگوزارییەکان جێبەجێ دەبوون.

سێ زانکۆ هەبوون. زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر و زانکۆی سلێمانی لە سلێمانی و زانکۆی دهۆک لە دهۆک بوو. کۆلێژی پزیشکی لە هەر سێ زانکۆیەکاندا هەبوو. لە زانکۆی سەلاحەدین ١٢ کۆلێژ هەبوو. نزیکەی ٥,٠٠٠ قوتابی بە خۆڕایی تێیدا دەیانخوێند. کۆلێژی پەروەردەو کشتوکاڵ و ئاداب و زانیاری و ئابووری و یاساو دەرمانسازیی و ددانسازی هەبوون. زانکۆیەکان تێلیفۆنی مۆبایل و تەنانەت ئینتەرنێتیشیان هەبوو. چەند کۆمپیوتەرێکی کەم لە زانکۆدا هەبوو. زانکۆی پزیشکیی هەولێر لە ٢٠٠٦ کراوەو تایبەتە بە نوژداری و برینپێچی و ئومێدی پێشکەوتنی زۆری لە بواری پزیشکیدا لێ دەکرێ.

تا ڕووخانی ڕژێمی سەدام حوسێن لە بەغدا، ئایندەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەر لە مەترسیدا بوو، بەڵام لە دوای ئۆپەراسیۆنی ئازادیی عێراقOperation Iraqi Freedom ئەو مەترسییە نەما و حکوومەتی هەرێمی کوردستان بە پێی دەستووری هەمیشەیی عێراق، دەسەڵاتێکی فەرمیی یاساییە.

لە دوای ڕووخانی سەدام حوسێن، باری ئابووریی کوردستان بازێکی بەرینی بۆ پێشەوە هاوێشت و دەیان کۆمپانیای جیهانی ڕژانە ناو هەرێم و دەستیان بە ئاوەدانکردنەوە و دامەزراندنی پرۆژەی ستراتیژی کرد. ڕەنگە کوردستان لە دوای ئاساییکردنەوەی بارودۆخی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان وەک کەرکووک، ڕێفراندۆمی چاوەڕوانکراو گەڕانەوەی کەرکووک بۆ ناو هەرێمی کوردستان، هێشتا پتر ئابووریی خۆی بەهێزتر بکا و باری گوزەرانی هاووڵاتییانی بەرەو باشتر بگۆڕێ

و کوردستان پاش ماوەیەکی کورت لە زۆر لە ولاتانی دراوسێ پتر گەشە بکات.

تا ٢٠٠٧، پێنج جار ئەنجوومەنی وەزیران گۆڕاوە. یەکەم سەرۆک وەزیران فواد مەعسووم بوو. کابینەی دووەم کۆسرەت ڕەسووڵ سەرۆکی بوو. کابینەی سێیەم سامی عەبدولڕەحمان سەرۆکی بوو، کابینەی چوارەم و پێنجەم لە ١٩٩٩ تا ٢٠٠٧، نێچیرڤان بارزانی سەرۆک وەزیران بوو.

**حەسەن کێف.** شارێکی دێرینە و شوورەکەی کەوتووەتە سەر ڕووباری دیجلە. لە تورکیا، لە نێوان دیاربەکر و جزیرە دایە. فەرمانداری حەسەن کێف، نازناوی مەلیک (شا)ی لە خۆی نابوو. بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە نەوەکانی سەلاحەدین بوون، بۆیە دانیشتوانی حەسەن کێف لە نەوەکانی بنەماڵەی ئەیووبی بوون. شەرەفنامە باسی ئەوە دەکا کە ئەم خانەوادەیە یەکێک لەو پێنج بنەماڵەیە بووە کە بێی ئەوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی ڕاستەقینەی ببێ، پارەی دارشتووە و خوتبەش بە ناوی ئەوەوە خوێندراوەتەوە. لە درەنگی ١٩٩٠ـەکاندا، حەسەن کێف کێشەیەکی گەورەی ناوە، چونکە بەنداوە پێشنیازکراوەکەی ئیلسو (بەشێکە لە پرۆژەی گاپ)، شارەکە وەبن ئاو دەخاو تێکی دەدا و شوێنەوارە کوردییەکانیشی ناهێڵێ.

**حەسەن وەحیدی.** ئەو بنەماڵە کوردییەیە کە لە سەردەمی لاوازبوونی دەسەلاتی عەبباسییەکان، هەر لە ٩٥٩وەرا تا ١٠١٤ی زاینی، فەرمانداریی چیاکانی زاگرۆسی نێوان شارەزوور و خووزستانی ڕۆژهەلاتی (شط العرب)ی کردووە. حەسەن وەحیدی کوڕی حوسێن ئەو بنەماڵەیەی لێ کەوتووەتەوە و بەخۆیشی لە ڕەچەڵەکی خێڵی بەرزیکانی کوردی بووە. هەندێ لە هێزی وەحیدی، دژی سامانییەکان، بە هاواری بووەیهییەکانەوە هاتبوون.

حەسەن وەحیدی لە ٩٧٩ کۆچی دوایی کرد و ئەبوونەجمە کوڕی لە شوێنەکەی دانیشت. ئەبوونەجمە پاشتر ناوی بووە ناسرودەولە. ناسرودەولە زۆر سەرکەوتوو بوو؛ توانیی ولات سەقامگیر بکا؛ بەڕێوەبەرایەتییەکی بەهێزی دارایی دامەزراند؛ ڕێگەی بە ناو شاخەکاندا برد و بازاڕێکی زۆری کردەوە؛ توانیی ئەو حاجییانە بپارێزێ کە بە ولاتی ئەودا ڕەت دەبوون و بۆ حەج دەچوون؛ تەنانەت پارەی تایبەتی بەناوی خۆی دارشت، ئەمەش هێمای سەروەری بوو. لە ڕاستیدا، شەرەفخانی

بتلیسی ناوی حەسەن وەحیدییەکان لە ناو ئەو پێنج بنەماڵانەدا دێنێ کە دەسەڵاتی شاهانەیان هەبووە. دوا سەرداری بنەماڵەی وەحیدی لە ١٠٤٧، لەگەڵ هاتنی سەلجووقییەکان بە سەرکردایەتیی ئیبراهیم ئینال بۆ ناوچەکەیان، لە قەڵای سەرمەد، مرد.

حەمە ڕەزا شا ( ١٩١٩-١٩٧٩). لە ١٩٤١، ڕەزا شا بە هاوسۆزی لەگەڵ نازییەکانی ئەڵمانیا تاوانبار کرا و ناچار کرا واز لە عەرشی تاوس بێنێ و حەمەڕەزای کوڕی لە جێی ئەو لەسەر تەختی شای ئێران دانیشت. حەمە ڕەزاش وەک باوکی، بە توندی دەستی بە دەسەڵاتەوە گرت و هەوڵی دا تا ئەوپەڕ لە دەسەڵاتی هۆزە کوردەکان کەم بکاتەوە.

حەمە ڕەزا شا لە دیسێمبەری ١٩٤٦، کۆماری کوردستانی لە مەهاباد لە ناو بردو پاشان لە ئاداری ١٩٤٧، پێشەوا قازی محەمەدی لە سێدارە دا. لە ئاداری ١٩٧٥یش، خیانەتێکی دیکەی لە کورد کرد و، لە جەزایر پەیمانێکی لەگەڵ سەدام حوسێنی، بریکاری سەرۆک کۆماری عێراقدا مۆر کرد و بە پێی ئەو پەیمانە بەدناوەی جەزایر پیلانە هاوبەشە نگریسەکەی دژی کورد جێبەجێ کرد و توانیی لەگەڵ سەرانی حزبی بەعس لە عێراقدا کورد دووچاری نسکۆ بکا و شۆڕشی ئەیلوولیش دامرکێنێتەوە.

لە دوای پیلانەکەی جەزایر، پێشەوا مەلا مستەفا بارزانی ناچار بوو ڕوو لە پانشگە بکا و لە ئاداری ١٩٧٩ بوو بەخۆی سەری ناوە و خەمی گەورەی بۆ گەلەکەی بەجێ هێشت. ئەو ڕۆیشت، بەڵام ئاکامی خەباتی، ئەوپەڕ ئاواتی بەگەلی کورد داوە.

دەوڵەتی حەمە ڕەزا لە ١٩٧٩ ڕووخا، هیچ وڵاتێکی دنیا مافی پەنابەریشی پێ نەدا، تەنیا وڵاتی میسر، بە خێرا خۆی، حەواندییەوە. ڕووخانی حەمە ڕەزا شۆڕشێکی دیکەی لە کوردستان لێ کەوتەوە، بەڵام جێگرەکانی لە خۆی باشتر نەبوون؛ ئەوەبوو ئایەتوڵڵا خومەینی قەسابی بۆ کورد، ڕەوانی کوردستان کرد و سادق خلخالی بە مەحکەمە قەرەقوشییەکەیەوە ناردە کوردستان و لەوێ دەستە با دەستە گەنجی کوردی گوللەبارانکردن.

**حەمیدییە.** لە ١٨٩١، سوڵتانی عوسمانی عەبدولحەمیدی دووەم، لەشکر سوارێکی نائاسایی کوردی لە شێوەی قۆزاقە ڕوسییەکان دامەزراند و ناوی خۆی لێ نان. ئامانجی دامەزراندنی سوارانی حەمیدییە ئەوە بوو سیاسەتی (پەرتکە و زاڵبە)ی پەیڕەو کرد بۆ ئەوەی بتوانێ دەست بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا بگرێ و پاداشتی ئەو هۆزانەش بداتەوە کە لایەنگری حکوومەت دەکەن و بەمجۆرەش بواری هەڵگیرسانی شۆڕشێکی دژی دەوڵەت ئەستەمتر دەکا.

سوارانی حەمیدییە زۆر بە خراپی دژی ئەرمەنییەکان بەکار هێندران. ڕەنگە تا کۆتایی سەدەی ١٩، پتر لە ٥٠,٠٠٠ لەو سوارە نائاساییانە هەبووبن. هەندێ لەو حەمیدیانە هێزەکانی خۆیانیان بە شێوەیەکی نایاسایی دژی خێڵە کوردییە دوژمنەکانیان بەکار هێنا. کە کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتن لە ١٩٠٨، سوڵتانی لە سەر تەخت لادا، لەشکری حەمیدیەشی ڕەواندەوە. بەڵام پاش کاتێکی کەم، دووبارە لە بن باڵی هێزە سوارە سووکەکانی خێڵەکان یەکیان گرتەوە و لە گشت شەڕەکانی سەربەخۆیی تورکیا کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسان، بە کار هێندران. ئێستاش (پاسەوانانی گوند)ی تورکیا و (جاشەکان)ی عێراق هەمان ڕۆڵی سوارانی حەمیدییە دەگێڕن.

**حەنەفی.** یەک لە چوار ڕێبازە گەورە یاساییە ناسراوە سوننییەکەی ئیسلامە. قوتابخانەی فەلسەفەی یاسازی (Jurisprudence)ی حەنەفی لە سەردەمی عەبباسییەکان لە عێراق دامەزرا و فرە جەختی لە سەر بۆچوونە کۆکەکان و هزری یاسایی و قورئان و سوننەدا کرد. لەوەتی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی ١٦، لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و میسۆپۆتامیادا، دامەزرا، زۆرینەی تورکەکان پەیڕەوی ڕێباز حەنەفییان کردووە، بەڵام کوردی موسڵمانی سوننە، هەر پەیڕەوی مەزهەبی شافیعییان کرد؛ ئەو ڕێبازە پێشتر لە هەرێمەکەدا باو بووە.

قوتابخانەی شافیعی، وەک هەردوو مەدرەسەی حەنەفی و مالکی، لە سەدەی نۆیەمین لە میسر دامەزرا، بەڵام ئەم مەزهەبە پتر جەخت لەسەر پێوەری وێکچوون "قیاس تمثیلی" دەکا. لە کوردستان، ڕێبازی شافیعی لە ڕێبازی حەنەفی کەمتر ڕێز لە دەسەڵاتی میری دەگرێ. دەربارەی ڕەچاوکردن و تێگەیشتنی کێشەی کورد،

زۆربەی چاودێران لەو باوەڕەدان کە هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی جیاوازییەکی گرینگیان لە نێواندا نییە، بەڵام کورد هەر بۆیە ڕێبازی شافیعی پەیڕەو دەکەن تا لە دراوسێیە تورک و عەرەبەکان خۆیان جودا بکەنەوە.

**حوجرەی فەقێیان:** سەیری (مەدرەسە) بکە.

**حوسێن یڵدرم:** پارێزەرێکی کوردە لە سوێد دەژی و لە ۱۹۸۰کاندا، چەند ساڵێک لە ئەوروپا، ژێدەری پارتی کرێکارانی کوردستان بووە. لە کۆتاییی ۱۹۸۰کان، لەسەر کوشتنی هاووڵاتییانی سیڤیل کە دەوڵەتی تورکی دەی کرد، لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆجەلابی سەرۆکی «پ. ک. ک» نێوانیان تێک چوو. حوسێن یڵدرم هاریکاری لە پێکهێنانی بزووتنەوەیەکی لەبری «پ. ک. ک» کرد و ناوی «پ. ک. ک»ـڤەژین بوو، بەڵام ئەم ڕێکخراوە تازەیە نەیتوانی بەسەر پێ بکەوێ.

**حزبوڵڵا**، یان کۆنتراکانی حزبوڵڵا: تیپێکی باڵی ڕاست بوو، لە ۱۹۹۰ـەکاندا حکوومەتی تورکیا دژی پارتی کرێکارانی کوردستان بەکاری هێنا. پتر لە ۱,۰۰۰ کەس لە لایەنگرانی کێشەی کوردی بە دەستی چەکدارانی ئەو تاقمە کوژران. قوربانییە ناودارەکانی ئەو گرووپە، ڕووناکبیر مووسا عەنتەر و ئەندامی پەرلەمان لە لیستی پارتی دیمۆکرات محەمەد سنجار بوو.

هەرچەندە حکوومەت نکووڵیی لەم کارانە دەکرد، بەڵام دیار بوو کە تانسۆ چیلەری سەرۆک وەزیران ڕۆڵێکی خراپی لەو کردەوانەدا هەبوو. بەڵگەکانی لە ۱۹۹٦، لە ڕیسواکارییەکەی سوسورلوک دەرکەوتن، ئاشکرایان کرد کە دەوڵەت دژی دوژمنە ڕەچاوکراوەکانی، پشتیوانیی ئەو چەتە تاوانکارە باڵڕاستانەی دەکرد. لە سەرەتای ۲۰۰۰یش، هێشتا بەڵگەی فرەتر دەرکەوتن، ئەوە بوو پۆلیس تەرمی چەندەها کەسی پێشتر بێ سەروشوێنی لەبن خاک دەرهێنا کە لە بارەگایەکی نهێنیی ئەو حزبە دوای ئەشکەنجەدانیان و کوشتنیان، ژێرخاک کرابوون.

چەند گرووپێکی جودا لەو کارانەدا بەشدارییان هەبوو. حزبوڵڵا (پارتی خودا) ئاماژەی بەوەدا کە چۆن حزبەکە هەوڵی داوە بۆ ئەوەی یەکێتیی خاکی دەوڵەتی تورکی ئیسلامی بپارێزێ، کاتێک کە «پ. ک. ک» هەڕەشەی لێ دەکرد. (کۆنترا) لە

بنەڕەتدا بە فەرمی بە ناوی کۆنتراکانی دژی حکوومەتی ساندینیستا کرابوو کە لە ١٩٨٠کان، لە وڵاتی نیکاراگوا هەبوون. کۆنتراکانی حزبوڵڵای تورکی پێوەندییان بەو گرووپانەی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین نییە کە ئەوانیش ناویان حزبوڵڵا یەو (لە وانە ئیسلامییە کوردەکانی باکوری عێراقیش دەگرێتەوە.)

**حزبی بەعس (بەعسییەکان)**. حزبێکە لە ڕادەی نەتەوەپەرستیش ڕەتی داوە؛ ("البعث" بە کوردی دەکاتە ژیانەوە)، میشیل عەفلەق کە فەلەیەکی سووریایی ئۆرتۆدۆکسی تێگەیشتوو بوو؛ لەگەڵ صەلاح بیتار، ئەویش موسڵمانێکی سوننەی سووریی زیرەک بوو، وێکڕا، لە ١٩٤٠، ئەم حزبەیان پێک هێنا. ئامانجی دیرۆکیی ئەم حزبە، ئەوەبوو کە هەموو عەرەبان لە سایەی حوکمێکی سێکولاری سۆشیالیستی یەک بکا. باڵە، بە ناو، نەتەوەپەرستەکانی ئەو حزبە، عێراق و سووریایان حوکم کرد، تا لە ٢٠٠٣، وڵاتە یەکگرتووەکان سەدام حوسێنی لە دەسەڵات لادا؛ بەڵام هەردوو باڵە حزبەکە دوژمنی باوەکوشتەی یەکتری بوون. حزبی بەعس، لە ١٩٦٣، یارمەتی کودەتاچییەکانی دژی عەبدولکەریم قاسمی دا، بۆ ماوەی نۆ مانگ دەسەڵاتی لە عێراق وەرگرت. لە تەممووزی ١٩٦٨یش بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی وەرگرتەوە و تا ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ بۆ خۆی پاوانی کرد.

هەتا دەهات سەدام حوسێن پتر دەسەڵاتەکەی بۆ خودی خۆی پاوان دەکرد، تا لە ١٩٧٩ بووە تاقە سەرکردەی ئەو حزبە. چارەنووسی حزبەکە بە توندی بە چارەنووسی عێراق و هی خودی سەدامەوە بەستراوە. بەعسییەکان بە سەرکردایەتیی سەدام حوسێنی عێراقیان کردە دەوڵەتێکی سەربازیی بەهێز و توانیی لە ١٩٧٥ کوردە شۆڕشڤانەکان سەرکوت بکا. سەدام حوسێن بە سەختی تاکتیکی تۆقاندن و کوشتنی بەکار هێنا و جینۆسایدیشی دژی کوردان کرد و بە شێوەیەکی کاریگەر عێراقی کردە دەوڵەتێکی پۆلیسی. بەعسییەکان لە بواری سەربازیدا پێیان لە بەڕەی خۆیان پتر درێژ کرد و شەڕی دژی ئێرانیان لە ١٩٨٠کاندا کرد و پاشان لە ١٩٩١ لە دوای داگیرکردنی کوێت، شەڕێکی بێپارسەنگیان دژی وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانان کرد و دۆڕاندیان.

**حزبی شیوعیی عێراقی (حشع)**. حزبەکە لە ١٩٣٥ دامەزرا و بۆ ماوەیەکی زۆر

سەرکەوتووترین حزبی شیوعیی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بووە. چونکە حزبێکی شیوعیی کوردستانی نەبووە، بۆیە زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد یان پێوەندییان بە حزبی شیووعی عێراقەوە کردووە و یانیش تەنیا هەر هاریکارییان لەگەڵدا کردووە ئەو حزبەش هەڵوێستی لایەنگریی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بووە. جاری واش بووە کە ژمارەیەکی گەورە ئەندامانی حزبەکە کورد بووینە.

عەزیز محەمەد کوردە، هەر لە ١٩٦٣وەڕا تا دەستپێکی ١٩٩٠ـەکان سەرکردەی حزبی شیوعیی عێراق بووە. حزبی شیوعیی عێراق لقێکی کوردستانیشی هەبوو، ئەو لقە لە ١٩٨٠کاندا هاتە ناو بەرەی کوردستانی. لە ١٩٤٣، گرووپێکی بچووکی کوردی حزبی شیوعی کوردستانیان بە ناوی شۆڕش دامەزراند. بەڵام لە ١٩٤٦ پێوەندیی بە حزبی شیوعی عێراقەوە کرد.

لە ١٩٤٠ـەکانەوەڕا تا دەگاتە ١٩٦٠ـەکان، ڕۆژانی گەشەکردنی حزبی شیوعیی عێراق بوو. حشع پشتیوانیی جووتیارانی کرد و دژی ئاغەکان وەستا. هەروەها لایەنگری کرێکارانی نەفتی لە هەولێر و کەرکووک و سلێمانیدا کرد. لە ناوەڕاستی ١٩٥٠کان، حشع هاریکاریی «پ. د. ک»ی کرد کە لایەنگرانی ئیبراهیم ئەحمەد بەڕێوەیان دەبرد. تەنانەت «پ. د. ک»یش دانی بەم یەکبوونە داناو ناوی پارتی دیموکراتی کوردستانی یەکگرتووی لێ نا.

لە ١٩٧٠کاندا حشع، لەگەڵ حزبی بەعس لە جەبهەی قەومی – ئیشتراکی، کە بەعسییەکان سەرۆکی بوون، بەشداریی کرد و هەر ئەو هەنگاوە هەڵەیە بوو کە وای کرد پاشان هەنگاو بە هەنگاو حزبی شیوعیی عێراق لە هەردوو مەیدانی سیاسیی عێراق و کوردستانیشدا، پەراوێز ببێ. هەرچەندە حشع هێشتا هەر ماوە بەڵام ڕۆڵێکی یەکجار لاوەکیی هەیە و ماڵپەڕێکی ئینتەرنێتیشی هەیە کە ئەمەیە: www.iraqcp. org.

# خ

**خابوور.** دەروازەی سنووری نێوان تورکیا و حکوومەتی دیفاکتۆی کوردستانە لە باکوری عێراق و تاکە دەروازەی یاساییە کە بۆ بازرگانی و داهاتی گومرگ لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا بە کراوەیی ماوە لە کاتێکدا دەروازەکانی دیکە بە هۆی سزا ئابوورییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان سەپاندییە سەر عێراق، داخرابوون. هەر لەبەر ئەم هۆیەبوو کە خابوور وەک دەروازەیەکی گرینگ ماوە.

تا ئەو کاتەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان یەکی گرتەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان ئەو دەروازەیەی بەڕێوە دەبرد. داهاتی ڕۆژانەی ئەم دەروازەیە ۱۵۰,۰۰۰ دۆلارە (هەندێک دەڵێن ۱ ملیۆن دۆلارە). داهاتی گومرگی ئەم دەروازەیە یەکێک لەو هۆیە سەرەکییانە بوو کە ناکۆکیی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا دروست کرد. دەروازەی خابوور کەوتووەتە سەر زێیەکی بچووک و لەلای عێراقدا لە باکوری زاخۆیە و لەلای تورکیاشەوە، لە باشووری سیلۆپییە. هەندێ جاریش پێی دەڵێن دەروازەی ئیبراهیم خەلیل، ئەمەش لەبەرئەوەیە چونکە شارێکی بچووک بەهەمان ناو لە باشووری زاخۆ هەیە.

**خالید بەگی جبران (؟-۱۹۲۵).** لە هۆزی جبرانە و سەرکردەیەکی گەورەی ڕێکخراوی ئازادی بوو. ئازادی ئەو ڕێکخراوە نهێنییە کوردییە بوو کە لە تورکیا دامەزراو پلانی بۆ ڕاپەڕینەکەی ۱۹۲۵ی شێخ سەعید دانا. هەرچەندە خالید بەگ کوڕە سەرۆک هۆز بوو، بەڵام کورد پەروەر و خەباتگێڕ بوو. ڕەنگە ئەو کوردایەتییەشی لەبەرئەوە بووبێ چونکە لە شار و لە قوتابخانەیەکی سەربازی حەمیدییە پەروەردە بووبوو. لە سوپای ئاسایشدا پلەی کۆلۆنێلی هەبوو، زۆربەی سەرانی میلیشیای هۆزەکانیش ڕیزیان لێی دەگرت. لە سەرەتای ڕاپەڕینەکەدا گیرا و هاوڕێ لەگەڵ یوسف زیا بەگی هەڤاڵیدا وێکڕا لە سێدارە دران.

**خانەقا.** واتە تەکیە. ئەو شوێنەیە سۆفی دەروێشی تێدا کودەبنەوە و زیکری تێدا دەکەن. لە ناوەوەڕا خانەقا لە مزگەوت دەکاو میحرابی هەیە، بەڵام هەرچی تەکیەیە

وەک مزگەوت میحرابی نییە. لە تەکیەکان وێنەی شێخ و پەرچەم و زنجیر و شمشێر و زەرگیان تێدا بەدی دەکرێ و ئەو کەرستانە لە کاتی زیکرکردندا بەکار دێن و بەو کەرستانەشە کە خانەقا لە مزگەوت جودا دەکرێتەوە. شێخ بە خۆی یان یەکێک لە خەلیفەکانی سەری ئەڵقەی زیکر دەگرێ. لە کاتی زیکرکردندا دەروێشەکان حەیەڵڵا دەکەن و سەدان جار شادە دێنن و سەربادەدەن تا حاڵ دەیانگرێ و زەرگ و شیر لە خۆیان دەدەن. سەیری (نەقشبەندی؛ قادری؛ سۆفی) بکە.

**خانی.** سەیری (ئەحمەدی خانی) بکە.

**خەلیل ئاتاج (ئەبوبەکر).** بۆ ماوەی چەند ساڵ سەرکردەیەکی باڵادەستی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو. لە ١٩٩٠کاندا ئەندامی پۆلیتبیرۆی پارتەکە بوو، دوای دەستگیرکردنی سەرۆکی «پ. ک. ک» عەبدوڵڵا ئۆجەلان، لە ١٩٩٩دا، ئاتاج بووە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی و لە هەردوو ناوچەی باتمان و بەتلیس سەرکردەی سوپای ڕزگاری گەلی کوردستانیش بووە و لە ناو کوردان بە کارزاز ناسراوە.

**خوتبە.** ئەو گوتارە ئاینییەیە کە بەر لە نیوەڕۆی ڕۆژانی هەینی، خەتیب واتا مەلای گوتارخوێن دەیخوێنێتەوە. خوتبە بریتییە لە نزاکردن و لە خوا پاڕانەوە و سەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەری مەزن و ستایشی چوار خەلیفەکانی ڕاشدین. فەرمانداری ئێستای وڵاتیش لە خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا نزای بۆ دەکرێ؛ چونکە لە ئیسلامەتیدا بە وەلی ئەمر واتا خودان دەسەڵات دەناسرێ. بۆیە ئەو کەسەی کە لە خوتبەدا ناوی دەهات بە سەرکردەیەکی سەربەخۆ دەژمێردرا؛ چونکە ناوهێنان لە خوتبە خۆی لە خۆیدا سەربەخۆیی بوو. شەرەفنامە، بۆ نموونە، ناوی چەند فەرمانڕەوایەکی کورد دێنێ کە ناوەکانیان لە گوتاری هەینیدا دەهات و بەمەش بە خاوەن سەروەری و سەربەخۆ دەناسران.

**خومەینی (ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا) (١٩٠٠– ١٩٨٩).** ئاخوندێکی ناسراوی ئێرانی بوو؛ سەرۆکایەتی بزووتنەوەی ئیسلامییە شیعەکانی کرد و لە ١٩٧٩ شای ئێرانی ناچار کرد کە وڵات بەجێبێڵێ و پاشان کۆمارێکی ئیسلامی دامەزراند. لە سەرەتادا، کوردە ئێرانییەکان پێشوازییان لە خومەینی کرد چونکە ڕژێمی شای لەناو برد. بەڵام دواتر

هەر زوو شەڕێکی کوشندە لە نێوان کوردەکانی ئێران و حکوومەتە ئیسلامییە تازەکەی ئێرانی بەرپا بوو، چونکە خومەینی خواستی کوردی بۆ ئۆتۆنۆمی بە تەگەرەیەکی گەورە لەپێش پاراستنی یەکێتی ئیسلام زانی. هەرچەندە پێشمەرگە کوردە ئێرانییەکان لە سەرەتادا دەسکەوتی گەورەیان بەدەست هێنا، بەڵام لە کۆتاییدا و لە ١٩٨٣، هێزی پێشمەرگە تووشی هەرەسێکی گەورە هات و ناچار بوو گۆڕەپانی خەبات بەجێبێڵێ سەیری (عبداالرحمن قاسملو؛ سادق خلخالی؛ پارتی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران) بکە.

**خۆیبوون.** واتا سەربەخۆیی. پارتێکی کوردی سەرتاسەری بوو. ئەو ڕووناکبیرە کوردە ئەریستۆکراتانەی کە لە بانشگەدا دەژین، لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٧، لە بحەمدون، لە لبنان ئەم پارتە سیاسییەیان دامەزراند. خۆیبوون و پارتی داشماکی ئەرمێنی لە نزیکەوە هاریکارییان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد و فرەنسا و بەریتانیای مەزنیش جۆرە پشتیوانییەکی سەرەتاییان کرد. جەلادەت بەدرخان یەکەم سەرۆکی خۆیبوون بوو. پاش ئەو حاجۆی سەرۆکی کۆنفێدراسیۆنە گەورەکەی هەڤەرکان سەرکردایەتییەکەی وەرگرت. بارەگای هەمیشەی خۆیبوون لە حەلەب، لە سووریا بوو. سووریا ئەوکات لە بن دەستی فرەنسییەکاندا بوو.

خۆیبوون دەیویست بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی بەتوانا پێک بێنێ و هێزێکی جەنگاوەری پسپۆڕی وای هەبێ کە چیتر پشت بە سەرۆک هۆزەکان نەبەستێ. خۆیبوون ڕاپەڕینەکەی ئاراراتی کوردی لە ١٩٢٧–١٩٣٠ لە کوردستانی باکور بەرپا کرد.

لە ١٩٢٨، فرەنسا ملکەچی فشارەکانی تورکیا بوو و چالاکییەکانی خۆیبوونی لە حەلەب قەدەغە کرد. هەرچەندە پارتەکە بە تەنیا بۆ خۆی نەیتوانی جێ پێی خۆی لە کوردستانی باشوور، لە باکوری عێراقێ بکاتەوە؛ بەڵام هێشتا تا چەند ساڵێک کەم و زۆرێک هەر کاری کرد، هەر لەبەرئەمەشە کە زۆر کەس خۆیبوون بە یەکێک لە سەرکەوتووترین ڕێکخراوی سەرتاسەری کوردی سەدەی ٢٠ـەم دەناسن.

**خێڵ.** زاراوەیێکە لە سەرتاسەری کوردستان بۆ ناولێنانی تیرە و هۆز و عەشیرەت بەکار دێ. خێڵ پێکهاتەی چەند بنەماڵەیێکە. عەشیرەت مانای خێڵەکایەتیش

دەگەیێنێ و کە پێچەوانەی مانای نا-خێڵەکایەتی دەبەخشێ. لەم ساڵانەی دواییدا، ژمارەی خێڵەکانی کورد، لەبەر فشاری هاوچەرخسازی modernization، بە شێوەیەکی دیار کەم بووەتەوە. لە کوردستانی عێراق، بۆ نموونە، تا ١٩٦٠ـەکانیش، لە سەدی ٦٠ دانیشتوانەکەی پێوەندییان بە تیرە و هۆزەکانیانەوە هەبوو. کەچی لە ١٩٨٠کاندا، ئەم ڕێژەیە دابەزی و تەنیا لە دەوروبەری ٢٠ لە سەدی دانیشتوانەکە پێوەندییان بە خێڵەکانیانەوە مابوو. ئەم نموونەیە لە شوێنانی دیکەش هەیە؛ بە تایبەتیش لە تورکیا زۆر زۆرە. لەگەڵ ئەمەشدا؛ حکوومەت فرە کەڕەت پشتیوانی عەشرەتەکان دەکا بۆ ئەوەی تاکتیکی (جودا بکەوە و حوکم بکە) (divide- and- rule) پەیڕەو بکا. (بوجاک) نموونەیەکی نایابی ئەم بوارەن کە لایەنگری میری دەکەن، بەڵام خۆ هەر تاکە نموونەش نینە.

بە ئاسانی ناکرێ هۆز و تیرە و بنەماڵە کوردییەکان پێناسە بکرێن، چونکە کات و شوێن و قەوارە و پێکهاتە و ڕێکخراوە ناوخۆییەکانیان فرە چەشنە. بۆ نموونە، لە سەدەی ١٩مین، ناوی (کورد) بەو چینە خێڵانە دەگوترا کە بە زمانی کوردی دەئاخاوتن. ئەم زاراوە تایبەت بە هۆزە؛ بەڵام بە شێوەی ناڕاست لەبری ناوی بنەماڵە، لە زۆر ڕستەی کوردیدا بەکاردێ: عێل/عەشیرەت، قەبیلە، تایفە، تیرە، هۆبە، هۆز و چەندین زاراوەی تری لەم جۆرەش هەنە. ئەم زاراوانە بەگشتی هەر لەبری کۆنفیدراسیۆنە خێڵەکانەوەڕا تا دەگاتە تیرە و بەرەباب و خانەوادەش، هەمووی دەگرێتەوە. خێلەکایەتی خزمایەتییە، جا راست بێ یان هەر بە قسە بێ. زۆربەی هۆزەکانی کورد ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ پاڵەوانێکی سەردەمی زووی ئیسلامەتی دەگێڕنەوە. سەیری (برادۆست و بارزانی و هەرکی و جاف و جابی و موکری و شوانکارە و شکاک و شیلەت و سنجابی و سوورچی و زێباری) بکە.

## د

**دادگاکانی سەربەخۆیی:** لە سالانی سەرەتای دامەزرانی کۆماری تورکیا، مستەفا کەمال ئەتاتورک، مەحکەمەکانی سەربەخۆیی دامەزراندن، بۆ ئەوەی بە پەلەو بەتوندی لەگەڵ نەیارەکانی هەڵسوکەوت بکەن. لە ١٩٢٥دا، دوو لەو دادگایانەی سەربەخۆیی دامەزراند، بۆ ئەوەی یەکێکیان هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید بکات، لە ویلایەتەکانی هەرێمە کوردییەکە و ئەوی تریشیان بۆ هەموو ناوچەکانی تری تورکیا بوو. شێخ سەعید بەخۆی و بەگەورە جەنگاوەکانی فەرمانی لە سێدارەدانیان درا.

تا ئەو کاتی کە دادگایەکە لە دوای دوو ساڵ هەڵوەشایەوە، پتر لە ٧٤٠٠ کورد گیران، ٦٦٠ کەسیان ئیعدام و سەدان گوندیش خاپوور کران و هەزاران کوردی تریش یان کوژران یان بانش کران. ئەو دادگایانەی ئاسایشی دەوڵەت کە ئێستا لە تورکیا هەنە، نموونەی ئەو دادگایانەی سەربەخۆیی زەمانی پێشانن. سەیری (عیسمەت ئینۆنۆ) بکە.

**دادگای ئاسایشی دەوڵەت (تورکیا):** دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە تورکیا، درێژەکراوەی مەحکەمەی سەربەحۆیی بوو، کە لە دوای دامەزراندنی تورکیا لە ١٩٢٠ دامەزرابوو. ئەو حوکمانەی دادگای ئاسایشی دەوڵەت دەری کردن، لە حوکمەکانی مەحکەمەی سەربەخۆیی سووکتر بوون. لە تورکیا هەشت لەو دەزگایە دەوڵەتییانە هەنە و ئەو دەزگایانە دەسەڵاتی یاساییان بەسەر ئەو کێشە سڤیلیانەدا هەیە کە پێوەندییان بەیاسای دژە تیرۆری ساڵی ١٩٩١ـەوە هەیە. بەندی ٨ی یاسای دژە تیرۆر، بەندێکی زۆر بەدناوە و بوونە ئەندام لە هەموو ڕێکخراوێکی بەپێی یاسا ڕێگەپێ نەدراو و ڕادەربڕین دەگرێتە خۆ و قەدەغەیان دەکا. ئەم بەندە وەک لەکەیەکە بە نێوچەوانی دەوڵەتی تورکیاوە نووساوە. هەر یەک لەو مەحکەمانە پێنج دادوەری هەیە: دوو دادوەری سڤیل؛ یەکێکی عەسکەری و دوو داواکاری گشتی. تێکڕا ١٨ مەحکەمەی لەو جۆرە لە تورکیادا هەیە.

ئەم مەحکەمانە توندترین دەزگابوون و فرە هەوڵی بێ وچانیان بۆ ئەوەی هەموو کوردێک سزا بدەن و بەهیچ شێوەیەک ئەوەیان ڕەچاو نەکرد کە ئەو کوردەی وا سزای دەدەن کەسێکە کاری توندوتیژی کردووە یان مرۆڤێکی ئاشتی پەروەرە، ئەو فەرمانە یاساییەی ئەو مەحکەمانە دژی کوردان دەریانکردن، پەردەیەکی شەرعییان خستە سەر ئەو هەموو شالاوانەی کە سوپا و حکوومەتی تورک بۆ سەر کوردستانیان دێنا و کوردیان دەکوشت و گوندەکانی کوردانیان خاپوور و وێران دەکرد. بەم پێیە ئەو مەحکەمانەی ڕۆژنامەکانیان داخست و ڕێگەی مافی ڕادەربڕینیان لە هاووڵاتییانی کورد، گرت. نوورسەت دیمیرێل، سەرۆکی پێشووی مەحکەمەی ئاسایشی دەوڵەت لە ئەنکارا، بوو بەهێمایەک و ڕاستییەکی ئەو گرفتانە کە ئەو مەحکەمانە بۆ ئازادییە دیمۆکراسییەکانیان دروست کرد. بۆ نموونە: نوورسەت دیمیرێل داوای لە سێدارەدانی لەیلا زانا و ئەندامانی دیکەی دیموکراسی پارتیسی کرد، بەڵام پاشان لە ١٩٩٤ هەر یەک بە ١٥ ساڵ زیندان حوکم درا. پاشتر نوورسەت پێوەندیی بەپارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کرد کە پارتێکی ئەوپەڕ ڕاستڕەوی ڕەگەزپەرستی تورکە و ئاڵپ ئەسلان تورک، سەرۆکی بوو.

لە کۆتاییدا تورکیا ناچار کرا ئەو مەحکەمەی ئاسایشی دەوڵەت هەڵوەشێنێتەوە، چونکە لەگەڵ ئەو بەندانە یەکی نەدەگرتەوە کە دەبوو هەر وڵاتێک پەیڕەوییان بکا تا لە یەکێتیی ئەورووپا بە ئەندام وەربگیرێ و کە تورکیاش لە هەوڵی بەئەندامبوون لەو یەکێتییەدایە.

**داود خان (؟-١٩١٢)**. کوردێکی ئێرانیی دڵڕەق بوو؛ لە بنەماڵەیەکی خانەدان نەبوو. لە دەوروبەری ١٩٠٠، بە ئازایەتی و دەست و بازووی خۆی توانیی سەرکردایەتیی هۆزی کەڵهوڕی ناوچەی کرماشان زەوت بکا. داود خان، بۆ ماوەی دەیەیەک، ڕۆڵێکی گرینگی گێڕا تا بە ئەسپایی، توانیی گەلێک هۆزی کوردی و حکوومەتیش پەراوێز بکا و تەنیا خۆی لە مەیدان ماوە. داودخان لە کاتی ڕێپێوانێکدا لە تاران زۆر بە نامەردی کوژرا.

**دژەگەریلا**. یەکێک لەو تاکتیکانەی تورکیابوو؛ لە ١٩٩٠ـەکاندا بەکاری هێنا و توانی بە هۆیەوە بەسەر «پ. ک. ک»دا زاڵ ببێ؛ تاکتیکی بەکارهێنانی هێزە

تایبەتییەکانی جەندرمە (ئوزاڵ تیمی)و هێزە تایبەتەکانی پۆلیس (ئوزاڵ حەرەکەت تیمی) بوو. ئەمانە یەکەی سەربازی بوون، بۆ ئەوە مەشق درابوون کە بە شێوەیەکی کوشندە خۆیان بشارنەوە و تاکتیکی دژی گەریلا بەکار بێنن بۆ ئەوەی «پ. ک. ک» تێک بشکێنن و بیبەزێنن و گوندی هاوولاتییانیش خاپوور بکەن تا «پ. ک. ک» چیتر سەرچاوەی یارمەتیشی نەمێنی. جگە لەمە چەندین تاکتیکی تریشیان بەکار هێنا. بەکارهێنانی ئەم تاکتیکە دژەگەریلایە بۆ سالانی ١٩٦٠ـەکان و سالانی پێشتریش دەگەڕێتەوە؛ ئەو دەمی تورکیا گرووپەکانی باڵە ڕاسترەوەکانی بەکار دێنا بۆ ئەوەی دوژمنەکانی ناوەوەی دەوڵەت لەناو ببا. سەیری (ژیتەم) بکە.

**دکتۆر باران.** ناوی نهێنیی موسلێم دورغونی سەرۆکی سوپای ئازادیی گەلی کوردستانی سەر بە پارتی کرێکارانی کوردستانە. چالاکیی لە ناوچەی دەرسیم لە تورکیا ئەنجام دەدا. وا پێ دەچێ لە ١٩٩٣ یان ١٩٩٤، دکتۆر باران بە گومانی (نەرێنی passivism) یان بەهۆی ئەوەی کە نەیتوانیبێ پەلاماری ئامانجە تورکییەکان بدا، «پ. ک. ک» ئیعدامی کردبێ. «پ. ک. ک» خۆی ڕای گەیاند کە دکتۆر باران خۆی کوشتووە، بەلام ئەم قسەیە جێی متمانە نییە.

**دکتۆر شڤان.** ناوە ڕاستەقینەکەی سەعید قرمزتۆپراخ بووە. دکتۆر شڤان، کوردێکی چەپڕەوی دەرسیمی کوردستانی باکور بووە. لە ١٩٦٠ـەکان کە زیندانی بووە لەگەڵ سەعید ئاڵچیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، ئاشنایی پەیدا کردووە. دکتۆر شڤان لە ١٩٦٩ لە زیندان ئازادکرا و پاشان بۆ کوردستانی باشوور چوو. لەوێ لە ناوچەی زاخۆ بارەگای باڵی چەپی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیای ڕێک خست. لە ١٩٧١، سعید ئاڵچیش لە سنوور دەرباز بوو و خۆی گەیاندە باشووری کوردستان، بەلام دکتۆر شڤان دەستگیری کرد و پاشان ئیعدامی کرد. بەم کردەوەیەی مەلامستەفا بارزانی ناچار کرد کە دکتۆر شڤان بگرێ و زیندانی بکا. پاشان گرووپەکەی دکتۆر شڤان بە ناوی پارتی پێشەنگی کرێکارانی کوردستان، کە گرووپێکی بچووک بوو، وەدەرکەوتنەوە.

**دمدم.** لە مێژوو و لە فۆلکلۆری کوردی ئەو شوێنەیە کە کورد جۆرە شانازییەکی تایبەتی پێ دەکەن. لەو قەلا شاخاوییە ٢٠٠٠ مەتر بەرزەی نزیکی لێوارەکانی

دەریاچەی ورمێ بوو کە حاتەم بەگی گەورە وەزیری شا عەبباسی گەورەی سەفەوی هەر لە نۆڤێمبەری ١٦٠٩وەڕا تا هاوینی ١٦١٠، خانی یەکدەستی میری برادۆستەکانی گەمارۆ دا. کە دمدم داگیر کرا، فارسەکان هەموو ئەوانەیان کوشت کە بەرگرییان لە قەڵایەکە کردبوو. پاشماوەی دیوار و کۆمەڵە بەردی تەلارەکانی سەر قەڵاتەکە تا ئەمڕۆش دەبیندرێن.

"بەیتی دمدم" سەربردەی گەمارۆیەکەی دمدم بە شێوەی خەباتی کورد دژی باڵادەستی بیانی دەگێڕێتەوە. زۆران ئەو بەیتە بە لاوکێکی نەتەوەیی دەزانن و لە دوای مەم و زینی ئەحمەدی خانی پلەی دووەمی بۆ دادەنێن. ژمارەیەکی زۆری هۆزان و مێژوونووسە تازەکان شتیان دەربارەی ئەم شۆڕشە نووسیوەتەوە. تۆماری لاوکی بەیتی دمدم، ئێستا لە ئەرکایڤی ئیتنۆ-میوزیکۆلۆجیکاڵ ethno- musicological لە زانکۆی ئێلینۆی لە یوربانا لە وڵاتە یەکگرتووەکان هەڵگیراوە.

**دوران کاڵکان (عەباس).** سەرکردەیەکی دیاری پارتی کرێکارانی کوردستانە. لە ناوەڕاستی ١٩٨٠کاندا، سەرۆکی هێزێن ڕزگارییا کوردستانێ بوو، کە پیش سوپای ڕزگاریی نەتەوەیی کوردستان کاری دەکرد. بە قسان لە ١٩٨٨، کاڵکان و عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرکردەی پارتی کرێکارانی کوردستان، لەسەر ئەو توندوتیژییەی دژی گوندنشینەکان بەکار دەهات، نێوانیان تێک چوو. کاڵکان لەو باوەڕەدا بوو توندوتیژییەکە ڕێی لێ دەگرت و نەیدەهێشت خەڵکی پتر بێنێتە نێو ڕێزی گەریلاوە. دوای دەستگیرکردنی لە ١٩٨٩، لە ئەڵمانیا، دووبارە پێوەندیی بە «پ. ک. ک» کردەوە. لە ناوەڕاستی ١٩٩٠ـەکان، کاڵکان بووە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی «پ. ک. ک»؛ پاش گرتنی ئۆجەلانیش لە ١٩٩٩، کاڵکان پۆستێکی ئەندامی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی وەرگرت.

**دۆغوجولوک: (ڕۆژهەڵاتگری Eastism) دەگەیەنێ.** تورکیا ئەم ناوە سازگارەی ڕۆژهەڵاتیزمی لە ١٩٦٠کاندا، کە ساڵانێکی مەیلەو لیبراڵ بوو، بۆ ئەو هەڵمەتەی بەکار هێنا کە بۆ گەشەکردنی هەرێمە کوردنشینەکانی ڕۆژهەڵات دەستی پێ کرد، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناوە قەدەغەکراوەکانی کورد و کوردستانی نەهێنا. هەڵمەتەکە نزیکەی دەیەیەک بەڕێوە چوو؛ ئەم هەڵمەتە بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی کاریگەر لە

دوای شۆڕشی دەرسیم لە کۆتاییی ١٩٣٠یەکاندا، ڕێگەی دا کە کورد بیر و بۆچوونی خۆی دەرببڕێ. بڵاوکراوەکانی مووسا عەنتەر ڕۆڵێکی گرینگیان هەبوو. تەنانەت بەڵگەی ئەوە هەیە کە دۆغوجولوک کاریگەریی هێندە گەورە بووە تا ڕادەی ئەوەی پەیدابوونی پارتی کرێکارانی کوردستانیش بە یەکێک لە دەرئەنجامەکانی ئەو دادەندرێ.

**دۆڵی بیقاع "وادی البقاع"**. دۆڵێکە لە لبنان (بەڵام لەبن دەستی سووریایە) ساڵانێکی زۆر بوو چەندین گرووپی تێرۆرستیی جیاواز لەو دۆڵەدا بارەگای مەشقکردنیان هەبوو. بنکەی مەزلووم (مەحسوون) قورمزی پارتی کرێکارانی کوردستان لەم دۆڵە بوو تا لە ١٩٩٢ وەک هبوودییەک بۆ ئەوەی تورکیای پێ قایل بێ، داخرا. پاشان کە تورکیا لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨، بۆ دوا جار سووریای ئاگادار کردەوە، سووریا عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی «پ. ک. ک»ی لە سەرجەم بنکەکانی لەم دۆڵە وەدەر نا.

**دەپ**. سەیری (پارتی دیموکراسی) بکە.

**دیجلەـفورات**. مانگانەیەکی گرینگی دووزارە بوو، لەو ماوە کورتە لیبراڵەی سەرەتای ١٩٦٠ـەکان، هەشت ژمارەی لێ دەرچوو. بەر لەوەی بە هۆی جوداخوازییەوە دابخرێ، ئەو گۆڤارە یارمەتیی بە ئاگا هێنانەوەی کوردی دا و باسی سەرکوتکاریی لەمێژینەی کوردی کرد.

**دەرسیم**. ناوی کوردیی پێشانی ئەو ناوچە شاخاوییە لاچەپەیە کە ئێستا حکوومەتی تورک ناوی کردووەتە ویلایەتی تونجەلی. دەرسیم کەوتووەتە ئەوپەڕ ڕۆژئاواوە و لە هەموو هەرێمە کوردییەکانی تری ناو تورکیا لە سەنتەری ئەنادۆڵ نزیکترە. زۆرینەی دانیشتوانی هەرێمەکە ئەو کوردە عەلەوی و زازایانەن کە لە ڕابردوودا بە ڕاستی پشتیوانییان لە شۆڕشە کوردییە سوننییانەی وەک شۆڕشەکەی ١٩٢٥ی شێخ سەعید نەکردووە.

دەرسیم، بەهۆی ئەو سێ ڕاپەڕینە کوردییە مەزنانەی کە لە پاش شەڕی دووەمی جیهانیدا دژی کۆماری تورکیا کردی، ناپەسند بوو. ئەو شۆڕشەی دەرسیم کە سەید

ڕەزای عـەلەوی سـەرکـردایەتیی کـرد لە ١٩٣٦ڕا تا ١٩٣٨ بەردەوام بوو. تەنیـا تاکتیکی سووتاندنی زەوی بوو هەرەسی بە شۆڕشەکە هێنا. ئینجا ناوی دەرسیم گۆڕاو بووە تونجـەلی، بۆ ئەوەی یادەوەری ئەم شـۆڕشـە لە بیـری دانیشـتـوانەکـە بسڕنەوە.

بەڵام هێشتا لە ١٩٨٠کان و ١٩٩٠ـەکاندا، دیسان دەرسیم ڕۆڵێکی سەرەکیی لە ڕاپەڕینی پارتی کـرێکارانی کـوردسـتـان «پ. ک. ک»دا گـێـڕا. د. باران (مـوسلیم دورغـون) تا ١٩٩٤ کـە سـۆراغی خـۆکـوشـتنی بڵاو بووەوە، لە هەرێمی دەرسـیـم سـەرکـردایـەتیی «پ. ک. ک»ی کـرد. هـەندێک باوەڕیان وایە کـە ئاپۆ د. بارانـی بە گومانی نەرێنی ئیعدام کردووە؛ چونکە نەیتوانیوە پەلاماری نیشانەکانی تورک بدا. لە دوای ئەو شەمدین ساکیک (پارماکسز زەکی) سەرکردایەتیی هەرێمی دەرسیمی وەرگـرتووە و پاشـان ئەویش لە ١٩٩٨ لە ئۆجـەلان جـودا بووەوە و پەنای بۆ کوردستانی عێراق برد و لەوێش هێزێکی کۆماندۆزی تورکیا بە فڕۆکە لەسەر ڕێی نێوان دهۆک و هەولێر گرتیان و بۆ تورکیایان بردەوە.

**دەفریمجی ئیشجی سەندیکەلاری کۆنفێدراسیۆنی (DISK)**. یان کۆنفیدراسیۆنی یەکێتییەکانی کرێکارە شۆڕشگێڕەکان. ئەمەیان یەکێتییەکی ڕادیکاڵی کرێکاران بوو؛ ئەو چەپڕەوانەی کە لە دامەزراوی (تورک ئیش)ی سەر بە میری، جودا بوونەوە، لە ١٩٦٧، لە تورکیـا، دایان مـەزراند. ئەم کـۆنفـێدراسـیـۆنە ڕۆڵێکی سـەرەکـیی لە بەرپاکـردنی گێـرەشـێـوێنی و هاندانی ڕووناکـبیـران و گـڕدانی تیـرۆریزمـدا گـێڕاو یارمـەتیی دروستبوونی پارتی کـرێکارانی کوردسـتـان و جێبەجێکردنـی کودەتایە سـەربازییـەکـەی سـێـپـتـێـمـبـەری ١٩٨٠شی دا. بۆ نموونە، کـۆنفـێـدراسـیـۆنی یەکێتییەکانی کرێکارە شۆڕشگێڕەکان بوو لە ١٩٧٧ ڕێپێوانە ترسناکەکەی یەکی ئایاری لە گۆڕەپانی تەقسیم، لە ئەستەمبۆڵ ڕێک خست و ٣٧ کەسی تێدا کوژرا؛ چونکە کەسانێکی نەناسراو تەققەیان لە ئاپۆڕەی جەماوەرە ئامادەبووەکە کرد. پاش ئەو ڕووداوە بوو حکوومەتە سەربازییـەکەی ژەنراڵ کەنعان ئێڤرین لە ١٩٨٠ هاتە سەر حوکم و کۆنفێدراسیۆنی یەکێتییەکانی کرێکارانی شۆڕشگێڕی داخست.

**دەفریمجی دۆغو کولتور ئوجاغلەری (DDKO)** یان ماڵانی کولتووری ڕۆژهەڵاتییە

شۆڕشگێڕەکان. ئەمە بریتی بوو لە تۆڕێکی گرینگی یانە کولتوورییەکان کە لە ١٩٦٩ لە سەرتاسەری کوردستانی تورکیادا دامەزران. ئەم مالآنە خۆیان بۆ پشتیوانیکردنی مافە سیاسی و شارستانی و ئابوورییەکانی گەلی ڕۆژهەلآت (کوردستانی تورکیا) تەیار کردبوو. بێگومان ئەمە ئەوەی دەگەیاند کە گەشەکردنێکی شاردراوە و ناسینی بزووتنەوەی نەتەوەپەروەریی کوردی لە تورکیادا، بەڕێوەبوو. دەوڵەت بە جۆرێکی سەربازی هێندە توند پەلاماری ئەوانەی دا کە ئەو هێرشە تیژانەی هێنانەوە یاد؛ کە پێش شەڕی دووەمی جیهانی، تورکیا بۆ سەر دانیشتوانە کوردەکەی بردبووی.

لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٠، گەلێک سەرانی ئەو مالآنە دەستگیر کران و دادگا لە ئەستەمبۆڵ و لە دیاربەکر لە دژیان وەکارکەوت. مووسا عەنتەر و سەعید ئەڵچی و ئیسماعیل بێشکچی لەو کەسانەبوون کە بەند کران. مالآنی کولتووره ڕۆژهەلآتییە شۆڕشگێڕەکان داخران، بەلآم داخستنەکانیان درەنگ بوو؛ چونکە ئەوان کاری خۆیان کردبوو و بزووتنەوەی هاوچەرخی کوردیان لە تورکیا بووژاندبووەوە.

**دەڤریمجی دێمۆکراتیک کولتوور دەرنەکلەری (DDKD).** یان کۆمەڵەی کولتووره دیموکراتیکە شۆڕشگێڕەکان. لە ١٩٧٥ لە تورکیا دامەزرا. د.د.ک.د. یەکێک لەو زنجیرە گرووپە کوردییە چەپڕەوە هێرۆهوڕانە بوو کە لە سەردەمی بووژانەوەی ١٩٦٠ـەکان و ١٩٧٠کاندا دامەزران و لە ئەنجامدا پارتی کرێکارانی کوردستانیان لێ دروست بوو. لە سەرەتای دامەزراندنی، «پ. ک. ک» دژایەتی د.د.ک.د. کرد و ئەندامەکانی بە ناتۆرەی (شۆڤێنیستەکانی کۆمەڵ)و (چاکسازە نەتەوەییەکان) ناو دەبرد.

**دەڤسۆڵ.** یان چەپی شۆڕشگێڕ: لە ئەنجامی چەندین چەندوچوونی ناو دەڤ گەنج و پارچەبوونییەوە، دەڤ سۆڵ، لە شێوەی بزووتنەوەیەکی چەپڕەوی توندوتیژ، لە ١٩٧٨، لە تورکیا، پەیدابوو. تیرۆریستەکانی دەڤ سۆڵ، نیهاد ئەریمی سەرۆک وەزیرانی تورکیایان لە تەممووزی ١٩٨٠، تیرۆر کرد. کەرتێکی دەڤ سۆڵ، هێشتا وەک گرووپێکی تیرۆریستی توندوتیژ لە تورکیا کار دەکەن و بە ناوی بەرەو پارتی ڕزگاریخوازی گەلە شۆڕشگێڕەکان (دەڤریمجی هەڵک کورتولوس پارتیسی-

جەبەسی) ئاماژەی بۆ دەکەن. لەم چەند ساڵەدا ئەم ڕێکخراوە چالاکی لە ناوچ
شارستانییەکان ئەنجام داوە و هەنگاویشی هاوێشتووە تا هاریکاریی پارتی
کرێکارانی کوردستان بکا.

**دەڤ گەنج.** یان گەنجی شۆڕشگێڕ، ڕێکخراوێکی ڕادیکاڵی گرینگی چەکداریی
قوتابیان بوو لە ١٩٦٩ لە تورکیا دامەزرا. زۆربەی ئەندامەکانی تورک بوون، بەڵا
هەندێ ئەندامی کوردیشیان هەبوو. چەند بزووتنەوەیەکی چەپڕەوی گرینگی
ڕادیکاڵی دیکە سەرچاوەی لەو ڕێکخراوەوە گرت. پارتی کرێکارانی کوردستان
یەکێک لەو ڕێکخروانە بوو کە لە دەڤ گەنج دروست بوو. لە دوای کودەتایەکی
سەربازی، دەوڵەت لە ئاداری ١٩٧١ بە پێی یادداشتێک، بە فەرمی دەڤ گەنجی
داخست.

**دەڤ یۆل.** یان ڕێی شۆڕشگێڕ. بزووتنەوەیەکی چەپڕەوی ڕادیکاڵییە لە ١٩٧٦ ل
تورکیا دامەزرا. ئەمەشیان لە ئەنجامی مشتومڕ و پارچەبوونی ناو دەڤ گەنج پەید
بوو. لە دوای کودەتایە سەربازییەکەی سێپتێمبەری ١٩٨٠، حکوومەت توانیی ئە
بزووتنەوەیەش لە گۆڕێ نەهێڵێ.

**دەنگ.** گۆڤارێکی جووتزار billingualی گرینگ بوو؛ لە سەردەمی لیبراڵی تورکیا ل
سەرەتای ١٩٦٠ـەکاندا، یەشار قایەو مەدەد سەرهەد بۆ ماوەیەکی کورد دەریار
چوواند. گۆڤارەکە تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچوو بوو کە داخراو سەرهەدیش تاوانی
جوداخوازی درا پاڵ. ئەمەش تۆمەتێکی ئامادەیە دەخرا پاڵ ئەو کەسانەی دەیانگو
کورد لە تورکیادا دەژین.

**دەنیز گەزمز (؟-١٩٧٢).** کوردێکی ڕادیکاڵی تورکیایی بوو؛ سەرکردەی سوپای
ڕزگاریخوازی گەلی تورکیا (تورکیا خەڵک کورتولوس ئۆردوسو) بوو. لە ١٩٧٢ ب
تاوانی کوشتن لە سێدارە درا. گەزمزو ماهر جایان ئەو دوو کەسایەتییەبوون ک
کاریگەریان لە عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان کرد
نموونەی بالای ئەو بوون.

**دەوڵەتی عوسمانی.** لە کۆتاییی سەدەی ١٣ دامەزراو بە یەکێک لە گەورەترین

دەوڵەتی ئیسلامی لە مێژوودا دەژمێردرێ، لە ١٤٥٣، عوسمانییەکان قوستەنتەنییەی پایەتەختی بێزەنتییەکانیان گرت، بەم سەرکەوتنە مێژووییەشیان ئیمپراتۆری بێزەنتییان لەناو برد. لە سەدەی پاشتر دەوڵەتی عوسمانی گەشەی کرد و بەرفرەوانتر بوو تا توانیی هەندێ بەشی هەر سێ وڵاتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا (ڕۆژهەڵاتی ناڤین) و باکوری ئەفریکا بگرێ. لەمیانی پەرەسەندنیدا، ئیپراتۆری عوسمانی بەرەنگاری کریستیانەکانی ڕۆژئاوا بووەوە و بە ناوی بڵاوکردنەوەی ئیسلامەتی دەستی بەسەر وڵاتەکانیان داگرت. پاشتر کە زانست لە ئەوروپا گەشەی کرد، ئیتر عوسمانییەکان هێدی هێدی لە بەرانبەریان شکستیان خوارد و تا لە سەدەی ١٩ ناوی (پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا Sick Man Europe)ی لێ نرا. بەڵام هێشتا ئەو پیاوە نەخۆشە توانیی تا سەدەی ٢٠ـەمیش خۆی ڕابگرێ؛ تا لە شەڕی یەکەمی جیهانی بەزی، ئینجا پارچە پارچە بوو و نەما. مستەفا کەمال لە ١٩٢٣، کۆماری تورکیای ئێستای لە شوێنی دامەزراند.

عوسمانییەکان لە سەرەتادا لەگەڵ کورد یەکیان گرت؛ چونکە کورد لە ١٥١٤، لە شەڕی چاڵدیرانی باکوری ڕۆژهەڵاتی ڤان، یارمەتیی سەرەکیی عوسمانییەکانیان داو وایان کرد سەفەویەکان ببەزێنن. لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا بوو کە سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی کێشراو ئەو سنوورە تا سەدەی ٢٠ـەمیش هەر وەک ئەو سەردەمی مابووەوە. زۆرینەی کورد بەژێر دەستی عوسمانییەکان کەوت، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆییان هەبوو. تا لە سەدەی ١٩ دەوڵەتی عوسمانی، سیاسەتی خۆی بۆ حوکمێکی ناوەندی گۆڕی و هەموو میرنشینە سەربەخۆیەکانی کوردی لەناو بردن. ئەو کوردانەی مانەوە فارسەکان کۆنترۆڵیان کردن. چونکە کورد کەوتبووە سەر سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە هەمیشە ڕۆڵی سەرەکیی لە شەڕەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتدا هەبووە و هەمیشە زیانی هەرە گەورەی ئەو شەڕانەش هەر لە کورد کەوتووە.

لە ئەنجامی بێ هێزی و کزیی دەوڵەتی عوسمانی هەستی کوردایەتی گەشەی کرد، بەڵام سەرکردەکانی کورد نەیانتوانی گەلەکەیان یەک بخەن و سوود لەو هەلە

وەربگرن کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بۆیان ڕەخسابوو. تا ئێستاش هەندێ لە مێژوونووسان مشتومڕی ئەوەیانە ئایا شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بزووتنەوەیەکی کوردایەتی بوو، یان ڕاپەڕینێک بوو داوای گەڕانەوەی سیستەمی خەلیفایەتیی دەکرد. ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە زۆر لەوانەی هەستی کوردایەتییان هەبوو، بۆ ئەوەی نەهێڵن شێخ سەعیدی پیران سیستەمی ئیسلامی بگەڕێنێتەوە، نەیانهێشت خێڵەکان پێوەندی بە شۆڕشەکەیەوە بکەن.

ئەورووپا ئێستا هەوڵی زۆر دەدا بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری تورکیا وەربدا و وابکا کە حکوومەتی ئەنکارا ملکەچی هەندێ لە داخوازییەکانی گەلی کورد بێ و دان بە بوونی ئەو گەلە لەو وڵاتەدا بنێ. هەندێ لە چاودێران وای بۆ دەچن کە ئەو فشارەی ئەورووپا دەیکا، بۆ ئەوەیە هێدی هێدی تورکیا لاواز بکەن و لە کۆتاییدا ڕێگا بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی خۆش بکەن. تورک نکووڵی لە بوونی گەلی کورد لەو وڵاتەدا دەکا، ئەم نکووڵی لێکردنەش بەپێی ئەو بنەمایە ئیسلامییەیا کە عوسمانییەکان پەیڕەویان دەکرد و دەیانگوت ئیسلام هەمووی یەک میللەتە بنەمای سێکولاریزمی دەوڵەتی کەمالیی تورکیا بە ڕاستی لەگەڵ ئەم قسەلۆکەد ناگونجێ، بەڵام چونکە لە بەرژەوەندییاندایە، بۆیە بەرانبەر بە کورد پەیڕەوی دەکەن لە بەرانبەر ئەوەشدا تورک جۆرە مافێکی کەمینە ناموسڵمانەکانی وڵاتەکە دەپارێزن ئەمەش بەتەواوەتی لەگەڵ دەقی پەیمانی لۆزان (١٩٢٣)دا دەگونجێ. ئەو پەیمانە هیچ بەندێکی سەبارەت بە کورد تێدا نییە و هیچ ئاماژەشی بۆ بوونی کورد لە تورکیاد نەکردووە، کەچی پەیمانەکەی سیڤەر (١٩٢٠) ویستی ئۆتۆنۆی یا سەربەخۆیی بۆ گەلی کورد مسۆگەر بکا.

دەوڵەتی عوسمانی چۆن بە توندی هەڵسوکەوتی لەگەڵ گەلی کورد دەکرد، پاشی ئەویش هەردوو دەوڵەتی سووریا و عێراق کە میراتگری دەوڵەتی عوسمانینە، بە هەمان شێوەی توند گەلی کورد سەرکوت دەکەن و لە هەمان کاتیشدا ترسیان لە دەوڵەتی نوێی تورکیا هەیە. عوسمانییەکان لە ڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا تەنیا بە گومانی هاریکاریکردنی لەگەڵ ڕووسییان لە براگەورەی مەلا مستەفا بارزانی لەڕک ڕاچوون و لە سێدارەیان دا؛ ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە هەمیشە

دوژمنانی گەلی کورد تۆمەتی ئاوها بێبەها وەپاڵ سەرکردەکانی کورد دەنێن؛ بۆ ئەوەی بە دڵی خۆیان چ حوکمێکیان گەرەک بێ بەسەریاندا بسەپێنن و لەناویان ببەن.

**دەیلەمییەکان.** گەلێکن وا مەزەندە دەکرێ لە کۆنەوەڕا لە ناو شاخەکانی ئەلبورزی باشووری دەریاچەی قەزویندا ژیابن و لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلام، ئەوانە چەند هێرشێکی سەربازیی گرینگیان کردبێ.

وا دیارە کە دەیلەمییەکان پێشەنگی هەندێ لە دانیشتوانە کوردەکانی ئەمڕۆی وەک گۆران بووبن. گۆران جووتیاری دەکەن، خێڵەکی نینە و لە ناوچەی سلێمانی ئێستای عێراقدا دەژین. وا پێ دەچێش کە دەیلەمییەکان لە سەرووی ڕووباری دیجلە لە ئەنادۆڵدا جێگیر بووبن و ئێستاش دیمیل یان زازا کوردەکان نەوەی ئەوان بن و هەر لەو ناوچەیەدا بژین. هەرچەندە دەیلەمییەکان جۆرێک کاریگەری شیعەیان لە سەردا هەیە، بەڵام هێشتا زۆربەیان پەیڕەوی ئاینەکانی فریشتان دەکەن. ڕەنگە ئەمە هۆی ئەوە بووبێ کە دەیلەمییەکان زۆر بە نەرمی ڕەوشتیان لەگەڵ ئەو نەتەوانەدا کردووە کە لەگەڵیاندا ژیاون.

بنەماڵە مێژووییەکانی دەیلەمییان ئەمانەن: باڤاندی (باوەندی) لە باشووری دەریای قەزوین ٦٦٥-١٣٤٩؛ زیارییانی لە تەبەرستان؛ گورگانی ٩٢٧-١٠٩٠؛ کانگاری(موسافیری)(سالاری) لە ئازەربایجان ٩١٠-١٠٩٠؛ جاستانی لە گەیلان؛ ڕویان و تالیشان لە سەدەی ٦ـەم-١٢ـەم؛ شوانکارە لە فارس و کرمان؛ کاکۆیی لە ناوەند و لە باشووری ئێران ١٠٠٨- ١١١٩ بنەماڵەی بووەیهییەکانی لە ٩٤٥دا بەغدادیان گرت و خەلافەتی عەبباسییان تێک شکاند، لە ڕەچەڵەکی دەیلەمییەکان بوون. قەڵا ناودارەکەی "ئەلەموت" بنکەی دەیلەمانی شاخەکانی ئالبورز بووە. ئەو شاخانە نیشتمانی پیرەمێردە ئەفسووناوییەکەی چیایە. ئەلەمووت بە زاراوەی کوردی دەیلمی، واتای (هێلانەی هەڵۆ) دەبەخشێ.

**دهۆک.** شارێکی نزیکەی ٥٠,٠٠٠ کەسییە و کەوتووەتە باکوری ڕۆژئاوای ئەو ناوچانەی بارزانی لە کوردستانی عێراق کۆنترۆڵیان دەکا و نزیکەی ٥٠ کیلۆمەتر لە باشووری خاڵی دەربازبوونی سنووری تورکیاوە دوورە. ئەم خاڵە سنوورییە لە دوای

١٩٩١ـەوە بۆ بازرگانیی نێوان تورکیا و دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردستان لە باکوری عێراق بەکار دێ. یەک لەو سێ زانکۆ و کۆلێژەکانی پزیشکیی کوردستانی عێراق لەو شارەدانە. پارێزگایەکەش هەر بە ناوی دهۆکەوەیە و یەکێکە لەو سێ پارێزگایانەی کە هەرێمی کوردستان پێک دێنن.

**دیاربەکر.** زۆرجاران بە پایەتەختی نافەرمیی کوردستانی باکور دەزاندرێ. لە شارەکەدا دیوارێکی کۆنی بێزەنتی هەیە کە ئیمپراتۆری بێزەنتی کۆنستانتیۆس لە ٣٤٩، لە بەردی باسەڵتی ڕەش(مەڕمەڕی ڕەش) دروستی کردووە و تا ئێستاش ئەم دیوارە باش پارێزراوە. لە یەنایری ٢٠٠٠، مەسعوود یەڵمازی سەرۆک وەزیرانی پێشوو و ئەندامی ئەوکاتی حکوومەتە هاوپەیمانەکەی تورک، بە ڕاشکاوی ڕای گەیاند کە "ڕێگەی چوونە ناو یەکێتیی ئەوروپا بە دیاربەکردا ڕەت دەبێ." یەڵماز لەم قسەیە مەبەستی ئەوە بوو کە تورکیا تەنیا ئەوکات دەتوانێ لە یەکێتیی ئەوروپادا ببێتە ئەندام، ئەگەر سەرکەوتووانە کێشەی کورد بە شێوەیەکی دیموکراتییانە چارەسەر بکا. لە ئەنجامی ئەو ڕاگوێزانەی لەم سالانەی دواییدا لە ئەنجامی شەڕی دژی پارتی کرێکارانی کوردستان دووچاری هاولاتییان هاتووە، ژمارەی دانیشتوانی دیاربەکری لە ١ ملیۆنی تێ پەڕاندووە.

**دیانەکان.** سەیری (فەلەکان) بکە.

**دیمیرێل.** سەیری (سلێمان دیمیرێل) بکە.

**دیمیلی.** زاراوەیەکە لە زاراوەی زازا نەرمترە و شێوەزارێکی کوردییە؛ (هەندێک دەڵێن ئەوە بۆ خۆی زمانێکی تایبەتییە). هەرچەندە زاراوەی زازا پتر لە دیمیلی بەکار دێ، بەلام زازا زاراوەیەکی ڕیسواکارە؛ چونکە لە ئاستی وێژەییەوە تەتەڵەی زمانە و لە کاتی قسەکردندا دەنگی (ز) تێدا دووبارە دەبێتەوە. هەرێمەکانی باکوری ڕۆژئاوای تورکیا (بەتایبەتی لە دەرسیم) بە شێوەزاری دیمیلی دەدوێن. کوردە عەلەوی و سوننە و تورکە عەلەوییەکانیش ئەم شێوەزمانە بەکار دەبەن. دیمیلی پێوەندی بە شێوەزمانی کوردیی گۆرانەوە هەیە (هەندێک پێی دەڵێن بۆ خۆی زمانێکی تایبەتە)و لە هەندێ ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ناوچە کوردییەکانی ئێران و ناوچە دراوسێیەکانی ناو عێراق بەکار دێ. ڕەنگە دیمیلی و گۆران دوو

کۆنترین شێوەزاری کوردی بن، بەڵام زۆرینەی کورد یان بە شێوەزاری کرمانجی یان بە سۆرانی دەدوێن. ڕەنگە زاراوەی دیمیلی پێوەندیی بە دەیلەمییەکانەوە هەبێ؛ کە خەڵکی چیایەکانی ئەلبورزی باشووری دەریای قەزوین بوون و ڕەنگە باپیرە گەورەی هەندێ لە کوردەکانی ئەمڕۆش بووبن.

هەندێک دیمیلی بە گرووپێکی ئیتنیی جیاواز لە کورد دەناسن. دەسەڵاتدارە تورکەکان وەک تاکتیکی "پەرت کە و زاڵ بە"، بێگومان ئەم بۆچوونە هاندەدەن. دیمیلییەکان لە زۆربەی کوردەکانی دیکە پتر بە جووتیاری تەوەزەل دەناسرێن. ڕەنگە ئێستا لە نێوان ٣ تا ٤ ملیۆن دیمیلی هەبن.

**دین.** هەرچەندە زۆربەی کورد موسڵمانی سوننەنە، بەڵام وەک دیاردەیەکی گشتی زۆر دیندار نینە و ئایینەکەی خۆیان بە پێی قورئان کە دەفەرمێ "إنا جعلناكم أمه وسطا" وەرگرتووە. لە ڕاستیدا، بۆ پێناسەکردنی ئاینداریی کورد، پەندێکی نەیارانی کورد هەیە دەڵێ؛ ئەگەر کوردێک لەگەڵ کافرێک بەراورد بکەین، دەبینین کوردەکە موسڵمانێکی چاکە.

دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین کە چەندین ئاین و ڕێبازی ئاینی جودا دەناو کوردەواریدا هەیە و ئیسلام تاکە ئاین نییە کە لە کۆمەڵی کوردەواریدا هەبێ. چەند ئاینێکی بەر لە ئیسلامەتی و هەندێکی داهێندراو (هێترۆدۆکسی) و چەند باوەڕێکی ڕێکخەریش لەو کۆمەڵەدا تێبینی دەکرێ. لەوەش تێ دەپەڕێ و دەبینین هێشتا لە لادێییەکان، شێخەکان جگە لەوەی کە ڕۆڵێکی ئاینیی گرینگیان هەیە، دەشبینین کە لە بواری سیاسیشدا هەمان بایەخە دینییەکەیان هەیە. لە ناو کوردەواریش وەک هەموو دنیای ئیسلام، دیارە لەم چەند ساڵەی دواییدا ئیسلامییەکان خەریکن لە ناو کەمینە هەژارە کوردەکاندا ڕەگی بەهێز دادەکوتن. لە هەرێمی کوردستان و لە سایەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە دوای هێزی پارتی دیموکراتی کورستان و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، ئیسلامییەکان هێزی سێیەم پێک دێنن. کوردە موسڵمانە سوننەکان، لە موسڵمانە تورکەکان و لە عەرەبەکانی دراوسێیان جیاوازن؛ کوردەکان هەموو پەیڕەوی مەزهەبی شافعی دەکەن، ڕەنگە ئەمەشیان هەر لەبەرئەوە بووبێ تا لەو دوو گەلە دراوسێیەیان خۆیان جودا ڕابگرن، ئەمەش نیشانەی

زیرەکایەتییانە. تورک و عەرەبە سوننەکان هەموو پەیڕەوی ڕێبازی حەنەفی دەکەن. جگە لەمە، بەلای کەم ٥ لە سەدی کورد شیعەنە. ژمارەی کوردە شیعەکان لە کوردستانی ڕۆژهەلات لە ژمارەی کوردە هاوڕێبازەکانیان لە عێراق پترە، ئێرانییەکان کاریان تێیان کردووە.

لە عێراق هێشتا چەند گرووپێکی ئاینیی جیاواز هەنە کە فریشتە دەپەرستن. لەوانە عەلەوییە قزلباشەکان و ئەهلی هەق و ئێزیدی، ئەمانە هەموو ئاینی پێش ئیسلامەتینە و چونکە ئاینی ڕێکخەرن و پێچەوانەی هزری ئیسلامی سیاسی و تۆندرۆیەکانن؛ بۆیە هەندێ گرووپی کوردی بە شانازییەوە پاراستوویانن. هەرچەندە هەندێک دەلێن:- هێشتا یەک لەسەر سێی نەتەوەی کورد، پەیڕەوی ئەم ئاینانە دەکا، بەلام ڕەنگە ئەوانە کەمێک لەسەربکەن. لە کوردستانی باکور، ژمارەیەکی زۆری کوردەکان عەلەوینە و لە براکوردە سوننەکانیان جودانە. هەردوو تەریقەتی نەقشبەندی و قادرییش هێشتا ڕۆلی گرینگییان لە ژیانی کوردەواریدا هەیە. بەردەوامیی شۆڕشی کورد و بالادەستیی پارتە سێکولارە نائاینییەکان لە باشووری کوردستان؛ وایان کردووە کە ئەم ڕێبازە نەسەلمێندراوانە، لە بەشەکانی دیکەی کوردستان کەمتر کاریگەرییان لە ناو کۆمەلدا هەبێ. بۆ نموونە ڕاستە لە باکوری کوردستان، دەسەلاتدارانی تورک، ناوی کوردیان قەدەغە کردووە، بەلام هێشتا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بنەمالە هەیە ناوی کوردی لە مندالەکانیان نانێ، چونکە وا فێرکراون کە لە ڕۆژی قیامەت، خوا تەنیا ئەو کەسانە دەدوێنێ کە ناوەکانیان عەرەبییە و ئەوانی تریش بە توندی سزا دەدا.

شایانی باسە کە پێشتر زۆرینەی کورد زەردەشتی بووە و پاشان وەرگەڕاونەتە سەر دینی مووسا و بوونەتە جوولەکە و پاشان زۆرینەی کورد دیان بووە و ئینجا کە ئیسلامەتی هات، هەندێ لە ترسان و هەندێ لە برسان و هەندێکیش بە متمانەوە وەرگەڕان و ئیسلامەتییان هەلبژارد. ئاشوورییە کریستیانەکان کەمینەیەکی بەرچاوی کوردستان پێک دێنن.

**دیوان.** (کۆچک یان دیوەخان) مالی میوانانە. ژوورێک یان خانوویەکی تایبەتییە کە ئاغە یان خودان زەوی بۆ حەسانەوەی میوانان و گەڕیدان سازی دەدا، تا لەوێ

بحەسێنەوە و بحەوێنەوە و خواردن و خواردنەوەی بەخۆڕاییشیان پێ بدرێ و شەویش تێیدا بمێننەوە. تا ئێستاش هەموو لادێییە نێرینەکان ئێواران دێنە دیوان و لەوێ کاروباری ڕۆژانەی خۆیان تاووتوێ دەکەن. لەوێ ئاغە چارەسەری کێشە بچووکەکانی خەڵکەکەی خۆی دەکا و بڕیاری ئاواش دەردەکا کە ڕاستەوخۆ کار لە ژیانی هاوگوندییەکانی خۆی دەکا. لەو کۆچکانەدا لاوەکان کەینوبەین و نەریتی پیاوەتی لە پیرەکانیان وەردەگرن. بەم پێیە دیوان میکانیزمێکی بەهێزی پێوەندی کۆمەڵایەتی دەسەپێنێ. لەم چەرخەدا، بە هۆی گۆڕانی خێرای پێوەندیی ئابووریی نێوان ئاغە و کرمانج، کاریگەری دیوان لە جاران کەمتر بووەتەوە.

دیوان مانای ئەو کتێبەش دەگەیەنێ کە سەرجەم هۆنراوەکانی هۆزانڤانێکی تێدا کۆ دەکرێتەوە. پێوەندیی نێوان ئەم دوو واتە جیاوازە لەوەوە دێ کە دادوەرێک یان بەڕێوەبەرێک هاوڕێ لەگەڵ دەستەی کارمەندەکانی خۆی دێت لە دیوان دادەنیشێ و سیاسەتەکانی خۆی ڕاڤە دەکا و دەیاننووسنەوە. ئەم هاوواتایەی دیوان لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکیشدا هەر وایە.

## ڕ

**ڕاپۆرتی تۆب.** لە ئابی ١٩٩٥ بوو کە هۆبەی بازرگانیَ و ئاڵوگۆڕی کاڵاکان (تۆب) کە گەورەترین فیدراسیۆنی پیشەوەرییە - ڕاپۆرتێکی ١٦٨ لاپەڕەیی دەربارەی کێشەی کورد لە تورکیا دەرکرد. لەویَ بە فەرمی پێی یێژن؛ کێشەی باشووری خۆرهەلات: دۆزینەوە و سەرنجدان. ڕاپۆرتەکەی تۆب خێرا مقۆمقۆ و چ بوو چ بووی لە سەرتاسەری تورکیادا پەیدا کرد؛ چونکە ئەو ڕاپۆرتە پەنجەی لەسەر دوو برینی گەورەی تورکیا دانا و ئاشکرای کرد کە کێشەی کورد تا چ ڕادەیەک بۆ ئایندەی تورکیا گرینگە و مەترسیش بۆ گۆڕینی ناسنامەی دەوڵەتی تورکیا پەیدا دەکا. سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنکارا، دۆگو ئەرگیل، گەورە توێژەری بابەتەکە بوو. یالیم ئەرەزیش کە کوردە و سەرۆکی (تۆب)یشە و، ئەوکاتیش ڕاوێژکارێکی نزیکی سەرۆک وەزیرانی ئەوسای تورکیا، تانسۆ چیلەر بوو، ڕێی بە لێکۆڵینەوەکە دابوو.

ڕاپۆرتەکەی تۆب لە ئەنجامی تەتەڵەکردنی دیمانەی ١,٢٦٧ کەس دارِشترا بوو. ٣,٦ لە سەدی ئەو ژمارەیە نەبیَ، ئەوانی دیکەی هەموو کوردی ژێر دەستی تورکیا بوون. کەمێک لە ٩٠ لە سەدی کەمتریان نێرینە بوون. هەموو ئەوانەی دیمانەیان لەگەڵدا کرابوو، یان خەڵکی باشووری ڕۆژهەلات؛ لە ناوچەی دیاربەکر و باتمان و ماردین بوون یان تازە لەوێوەڕا کۆچیان کردبوو و هاتبوون لە ناوچەکانی باشوور لە ئەدەنە و مێرسین و ئەنتاڵیادا نیشتەجیَ بووبوون.

ڕاپۆرتەکە باری دیمۆگرافی و ئابووری و ئاینی و زمانەوانی و ئیتنی و سیاسیی ئەوانەی شیتەڵ کردبووەوە کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کرابوو. دەرکەوتە هەرە سەرەکییەکانی توێژینەوەکە ئەوە بوو کە زمانی دایکی ٩٦ لە سەدیان کوردی بوو، ٧٥ لە سەدیان باوەڕیان وا نەبوو کە دەوڵەت دەتوانیَ پارتی کرێکارانی کوردستان ببەزێنیَ و ٤٣ لە سەدیان پشتیوانی جۆرە فێدرالییەتێکیان کردبوو؛ ٨٥ لە سەدیان داوای دەوڵەتێکی کوردی جودایان نەکردبوو. لە ئەنجامی ئەو دەستکەوتانەی کە لە

ڕاپۆرتەکەدا دیار کەوتبوون، پرۆفیسۆر ئارگیل گەیشتە ئەو ئەنجامە کە زۆربەی هاوولاتییە کوردەکانی کوردستانی باکور، ڕەنگە بە مسۆگەرکردنی یاسایی و دەستووری جۆرێک لە ناسنامەی کەلتووریيان قایل بن. ڕاپۆرتەکە پەنجەی لەسەر ئەوەش دانا کە «پ. ک. ک» لە دوا قۆناغدا خەباتی خۆی لە چەکدارییەوە دەگۆڕێ و دەست بە کۆششێکی سیاسی دەکات. ڕەنگە ئەم سیاسەت گۆڕینەش تەگەرەی گەورە بۆ تورکیا دروست بکا؛ چونکە دەوڵەتی تورک تەنیا لە ستراتیژی زمانی چەک تێ دەگا. ئێستا وا پێ دەچێ کە ڕەنگە ئەم پێشبینی کردنە لە ماوەی چەند ساڵێکدا لە تورکیا بێتە دی.

هەرچەندە دەرەنجامەکانی توێژینەوەکە نەک هەر خراپ نەبوون، بەڵکو ئومێدبەخشیش بوون، بەلام زۆربەی دامەزراوە تورکییەکان بە تووڕەییەوە ڕاپۆرتەکەیان وەرگرتەوەو ئەرگیلیان بە هەلپەرست و چەپڕەوێکی توندڕەو و نوێنەری سی ئای ئێی و هەواداری «پ. ک. ک» ناوزەد کرد. ئەو خۆ لەگێلیدانەو بە شێواوی خوێندنەوەی ئەو ڕاپۆرتە و ئەو هەموو هێرشە ناپەسندەی بۆ سەر توێژەرەکە کرا، هەمووی ئەوە ئاشکرا دەکەن کە تورکیا ناتوانێ کێشەی کورد خاو بکاتەوە.

ڕاپۆرتی کۆمیتەی پایک. لە ناوەڕاستی ١٩٧٠کان، نوێنەری ولاتە یەککگرتووەکان، ئۆوتس پایک سەرۆکایەتیی کۆمیتەیەکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرد کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی CIAدا کرد. هەرچەندە بەدیار کەوت کە کۆمیتەی پایک هێندەی کۆمیتەی کەنیسای سەر بە سینەتی ولاتە یەککگرتووەکان کە هاوکات لەگەڵ کۆمیتەی پایک لێکۆڵینەوەی دەکرد، گرینگ نەبوو، بەلام کۆمیتەی پایک هەموو ئەو نهێنییانەی ئاشکرا کرد کە چۆن ئێران و ولاتە یەککگرتووەکان، لە ١٩٧٠کاندا، یارمەتیی شۆڕشی ئەیلوولیان دابوو. دەنگی گوند VillageVoice بێ ئەوەی دەسەلاتی فەرمیی پێ بدرێ، درێژەی ڕاپۆرتەکەی لە ١٦ شوباتی ١٩٧٦دا بلاوکردەوە.

دۆکیومێنتەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە ئایاری ١٩٧٢، لە کاتێکدا کە سەرۆکی ئەوکاتی ولاتە یەککگرتووەکان ڕیچەرد نیکسن، بە یاوەریی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەودەم، هێنری کیسنجەر لە سەردانێکی یەکێتیی سۆڤیەت دەگەڕانەوە و

به تارانێدا هاتن، شای ئێران، حەمە ڕەزا پەهلەوی داوای لە سەرۆک نیکسن کرد پشتیوانیی لێ بکا بۆ ئەوەی یارمەتیی پتر پێشکەشی مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی شۆڕشی ئەیلوول بکا. ئەو کات، گرژییەکی زۆر لە نێوان عێراق و ئێراندا هەبوو. دوای ئەو ڕووداوە زۆری نەبرد کیسنجەر پۆستی وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی وەرگرت. هەرچەندە ئەو یارمەتییەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان پێشکێشی کرد تەنیا پشتگرتنێکی کەم بوو، بەڵام هێمایەک بوو بۆ ئەوەی نەکا شای ئێران لە نەکاو دەستبەرداری شۆڕشەکە بێ و پشتی تێ بکا. ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک ئەوە ڕاڤە دەکا کە؛ (چەند جار سەرۆکی گرووپە ئیتنییەکە، بارزانی ئاماژەی کردووە کە متمانەی بە نیازی هاوپەیمانەکەی ئێمە ئێران نەبووە.) بەڵام متمانەی بە وڵاتە یەکگرتووەکان هەبووە؛ ئەمەشی لە نیازپاکیی خۆی بووە.

لە کۆتاییی ڕاپۆرتەکەدا هاتووە کە؛ (پرۆژەی یارمەتییەکە لە سەرەتادا بۆ بەرژەوەندی هاوپەیمانەکەی خۆمان، ئێران دەستی پێ کردووە، چونکە لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان هاریکاریی کردووە و پاشان هەستی بەوە کردووە کە دراوسێیەکەی عێراق هەڕەشەی لی دەکرد.) هۆیەکانی دیکە کە هانی وڵاتە یەکگرتووەکانیان دا، شەڕی سارد بوو؛ لەو شەڕدا عێراق، هاوپەیمانی یەکێتیی سۆڤیەت بوو؛ سۆڤیەتەکانیش لە هەر شەڕێکی نێوان عەرب و ئیسرائیل یارمەتیی عێراقیان دەدا بۆ ئەوەی پەلاماری ئیسرائیل بدا؛ هۆی دواییی ئەو یارمەتییەش ئەوە بوو ئەگەر کورد دەوڵەتێکی سەربەخۆی ببێ، ڕێگەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەدا تا بە ئاسانی نەوتی بەدەست بکەوێ.

بەختڕەشیی کورد لەوە دیار بوو کە ئەو یارمەتییە یەک لەو هۆیانە بوو کە هەرەسی بە بەیانی ئاداری ١٩٧٠ هێنا. بێجگە لەمەش، ئەو یارمەتییەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران پێشکێشی کوردیان دەکرد، هێندە نەبوو کە سەرکەوتنێک بۆیان بەدەست بێنێ، چونکە ئەگەر بارزانی سەرکەوتبا، ئیتر کورد نەیدەتوانی چیتر عێراق لاواز بکا؛ نە ئێران و نە وڵاتە یەکگرتووەکانیش ئەمەیان نەدەویست.

جا ڕاستییەکە ئەوە بوو وەک لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە نە وڵاتە یەکگرتووەکان و نە ئێرانیش؛ (نەیاندەویست هاریکارەکەمان (کورد) سەرکەوێ. بەڵکو تەنیا دەیانویست

یاخیبوونێک هەر بەڕێوە بچێ و هەر لەو ڕادەیەشدا بمێنێتەوە، کە بتوانێ سەرچاوەکانی دراوسێیەکەی (عێراق) هاوپەیمانەکەمان (ئێران) چک بکا.) بێگومان؛ (ئەم سیاسەتە لە کن هاریکارەکەمان ئاشکرا نەکرابوو، بەڵکو تەنیا هانی ئەوە دەدران کە شەڕەکە ڕانەگرن. تەنانەت لە دەقی کردارە نهێنییەکەشماندا، ئێمە کردەوەیەکی سەیروسەمەرەی بێ بەهامان ڕاپەڕاندووە.)

لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥، ئێران و عێراق ڕێککەوتنی جەزایریان مۆر کرد. بە پێی ڕێککەوتنەکە، عێراق تا ناوەڕاستی ڕووباری شەتولعەرەب "شط العرب" بە ئێرانییەکان دا. ئێرانیش هەموو جۆرە یارمەتییەکی لەپێشەوا بارزانی بڕی. ڕاپۆرتەکە دەڵێ؛ (وەستاندنی یارمەتی بەو شێوە کتوپڕە...سەرکردایەتیی کوردی تووشی شۆک کرد)و هەرەسی بە شۆڕشی کورد هێنا. بارزانی بە ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندیی گوت کە؛ "گەل و هێز تووشی سەرلێشێوان و نائومێدی هاتوونە. چارەنووسی گەلەکەمان لە مەترسییەکی گەورەدایە. دووچاری نسکۆیەک دێین... تکاتان لێ دەکەین... بە پێی پەیمانەکانی دابووتان یارمەتیمان بدەن."

هەرچەندە بارزانی لێشیان پاڕاوە، بەڵام؛ (وڵاتە یەکگرتووەکان نکوڵی کرد و قایل نەبوو تەنانەت یارمەتییە مرۆییەکانیش بۆ ئەو هەزار خەڵکە بنێرێ کە لە ئەنجامی ڕاگرتنی یارمەتیی سەربازیدا پەرگەندە بووبوون.) ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک ئەوەش ڕوون دەکاتەوە و بێژێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان؛ (هێندە خۆی خستبووە ژێر دەستی شای) کە (هیچ ڕێگەیەکی لەبەردا نەمابوو جگە لەوەی کە ملکەچ بکا)و هەموو یارمەتییەکان لە بارزانی ڕابگرێ. کیسنجەر ئابڕووی چوو، بۆ بەرگری لە خۆکردن نووسی: "کردەیەکی نهێنی نابێ لەگەڵ ڕاپەڕاندنی ئەرکدا، تێکەڵوپێکەڵی یەکتری بکرێن."

**ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا.** لە پاش شەڕی کەنداوی ١٩٩١، کۆنگرەی نەتەوەیی کورد لە باکوری ئەمەریکا، هەوڵێکی زۆری دا تا توانیی لە ٢٥ی نیسانی ١٩٩٢، لە کۆششەکەی بالابێ؛ بەشی کوردیی ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا دامەزرا. د. نەجمەدین کەریم و پرۆفسیۆر ئەسعەد خەیلانی و باڵیۆز پیتەر گالبرێث کە ڕاوێژکاری سیناتۆر "پیل" ی سەرۆکی کۆمیتەی پێوەندییەکانی دەرەوەی سیناتی ئەمەریکا بوو،

پشتیوانیی هەڵمەتی دامەزراندنی ڕادیۆیەکەیان کرد.

لە سەرەتادا، بەشی کوردیی ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا تەنیا (٥) کارمەندی هەبوو. لە ١٩٩٢/٤/٢٥ هەتاوەکو کۆتاییی مانگی شەشەمی ساڵی ١٩٩٢، بەرنامەکانی بەشی کوردی تەنیا پانزدە (١٥) خولەک بوو. پاش ئەوەش، بەرنامەکان بوون بە نیو کاتژمێر و ژمارەی کارمەندەکان بوون بە ٩ کەس. پاش مانگی ١٩٩٢/١١، بەرنامەکان بوون بە یەک کاتی تەواو و ژمارەی کارمەندەکانیشی ١١ کەس بوو.

بەرنامەکان لە مانگی نۆڤێمبەری ١٩٩٢، هەتاوەکو مانگی یەنایری ٢٠٠٣ هەر بە یەک نەماوە. لە دواییدا، ماوەی بەرنامەکان بۆ چوار کاتی تەواو درێژکرانەوە و ژمارەی کارمەندەکانیشی خۆی لە ٢٠- ٢٢ کەس دا. لە مانگی نیسانی ٢٠٠٧ دا، ژمارەی کارمەندەکان ٢٧ کەس بوون.

* لە ساڵی ٢٠٠٧، بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا پەیامنێری لە:

هەولێر، سلێمانی، کەرکووک، بەغدا، مووسڵ، دهۆک، بەرلین- ئەڵمانیا، ستۆکهۆڵم- سویددا هەبووە و بۆ ماوەیەکیش پەیامنێری لە دیاربەکر و تاران و بەریتانیاش هەبووە.

* بەشی کوردی، بەشێکە لە کەرتی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ئاسیای ناوەڕاست لە دەنگی ئەمەریکا لە سەرەتای دامەزراندنیدا، بەشی کوردی بۆ ماوەیەک بەشێک بوو لە بەشی عەرەبی و لە پاشدا کرایە بەشێک لە کەرتی ئاسیای خواروو.

ئەرکایفی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا: بە دوو شێوە هەڵگیراوە؛ نووسراوەکان و سیدی و تەیپەکان لە لای سەرۆکی بەشەکە هەڵدەگیرێن و خشتەی بەرنامەکانیش بە شێوەی دیجیتال هەڵدەگیرێن

* بەشی ئینتەرنێت: ئەم بەشە لە لایەن بەشی کوردی خۆیەوە ئامادە دەکرێت. بەشی کوردی دوو ماڵپەڕی هەیە و هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خوێنەرانی کورد بە هەردوو نووسینی لاتینی و ڕاست بۆ چەپ بابەتەکانیان بخوێننەوە. هەردوو ماڵپەڕەکەش دوو سەرنووسەرییان هەیە و بە یارمەتیی هەندێ هاوکاری تر ماڵپەڕەکان بەڕێوە دەبەن.

به هۆی هۆکاری سیاسی و ستراتیژی و به تایبەتی قورسایی ژمارە و فەرهەنگ و کارتێکردنی سیاسیی کورد، لەسەر چەندین وڵاتی گەورە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەنگی ئەمەریکا گرینگییەکی تایبەت بە زاراوە و زمانی کوردی داوە و لە ڕۆژی یەکەمەوە زاراوە گرینگەکانی کوردی لە بەرنامەکانیدا بەکار هێناوە بۆ ئەوەی بەشی زۆری گەلی کورد لە بەرنامەکان تێ بگەن و بە ڕادیۆی خۆیانی بزانن و هەموو زاراوەکانی زمانی کوردی لە پاش یەک لە هەمان بەرنامەدا بەکاردەهێنرێن تا فەرهەنگی کوردی دەوڵەمەندتر بکەن.

**ڕەوادییەکان.** بنەماڵەیەکی بچووکی باکوری ڕۆژئاوای وڵاتی فارس بوو. بەڵام کە لە دەوروبەری ٧٥٨ زایندا حاکمی ئازەربایجان پاراستنی ئاسایشی ناوچەکەی بە ڕەوادی کوڕی موسەننای سپارد، ئیتر بنەماڵەکە گەشەی کرد و تا ئەوکاتی سەلجووقییەکان لە ١٠٧١ دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت، ئەو بنەماڵەیە هەر دەسەڵاتدار بوون. ڕاوادییەکان بە ڕەچەڵەک عەرەب بوون، بەڵام پاشان بەهۆی هاموشۆکردنیان لەگەڵ کورد، ئەوانیش بوونە کوردو دەستیان پێ کرد ناوی کوردیان لە منداڵەکانیان ناو محەمەدیان کردە ماملان و أحمدیان کردە ئەحمەدیل و بەم شێوە پێداچوون و دەستووری کوردیان پۆشی. ئێستا ژمارەیەکی کەم لە نەوەی ئەم خانەوادەیە ماونەتەوە.

**ڕایات.** ئەم وشەیە ڕەنگە لە بنەڕەتدا عەرەبی بووبێ. بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەکان پەرەی سەند و لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا بەکار هاتووە و ماناکەشی بە ڕانەمەڕ یان مێگەل دێ. لە کوردستانیش، ڕایات بۆ ئەوانە بەکار دەهات کە سەر بە هیچ خێڵێک نەبوون و سەرکار و ڕەنجبەربوون و بەشداریی شەڕیان نەدەکرد. لە هەندێ شوێنی تری کوردستان لە بری ڕایات، وشەی مسکێن یان گۆران بەکار دێ.

**ڕایەخ.** سەیری (مافوور) بکە.

**ڕزگاری.** پارتێکی کوردیی مارکسی بچووکی کوردستانی باکور بوو لە ١٩٧٦ لە دەوری دەزگای بڵاوکردنەوەی کۆمەڵ کۆبووەوە و گۆڤاری (ڕزگاری) دەکرد و پاشان پارتەکە بۆ خۆیشی بە ناوی ڕزگارییەوە ناسرا. گۆڤارەکە تەنیا دوو ژمارەی لێ

دەرچوو کە تورکەکان ڕایان گرت. ڕزگاری لەو باوەڕەدا بوو کە کورد نابێ شتێکی گەورە لەو تورکانە چاوەڕێ بکا؛ چونکە ئەوان داگیرکەرن و داگیرکەریش مەحاڵە بە هانای گەلێکی بندەستی خۆیەوە بێ؛ بۆیە بە باوەڕی ئەو پارتە دەبێ، پرۆلیتاریای کورد بە خۆی شۆڕشێکی گەورە بەرپا بکا تا لە چنگی داگیرکەر ڕزگاری ببێ.

ناکۆکیی ئایدیۆلۆژی و ململانێی نێوان ئەندامانی ڕزگاری لە ١٩٧٩دا پارتەکەی تواندەوە و لە شوێنی ئەوان "ئاڵای ڕزگاری" لە شێوەی پارتێکی سیاسی هێشتا لەوەکەی پێشان بێهێزتر هاتە کایەوە. بەڵام لە پاش کودەتایە سەربازییەکەی ١٩٨٠، سوپای تورک ئەم هەردوو پارتەشیان خنکاند. ئینجا پارتی کرێکارانی کوردستان لە ١٩٧٨، وەک گەورە پارتێکی سیاسی شۆڕشڤانی کوردی، سەری هەڵدا.

لە ١٩٤٥، پارتی ڕزگاری لە باشووری کوردستانیشدا هەبوو، لە ١٩٤٦، ڕزگاری خۆی تواندەوە و پێوەندی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد.

**ڕزگاریخوازە نەتەوەییەکانی کوردستان (KUK).** کوردستان، ئولوساڵ کورتولوسکولاری، پارتێکی چەپڕەوی کوردییە لە ١٩٧٩ لە تورکیا دامەزراوە. ئەم پارتە گەلێ جار مەیدانی لە پارتی کرێکارانی کوردستان گرتووە. هەرچەندە ڕزگاریخوازە نەتەوەییەکانی کوردستان، لە نیسانی ١٩٨٨، نوێنەری خۆی نارد لە کۆنفرانسی «پ. ک. ک» لە لازیقییەی سووریا ئامادە بوو، بەڵام لە کۆتاییدا هەر پەراوێز کران.

**ڕەزا ئاڵتون.** ئەندامێکی بنەڕەتیی پارتی کرێکارانی کوردستان «پ. ک. ک» و ماوەیەکی زۆریش جێی متمانەی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتەکە بوو. ئاڵتون نۆ ساڵی سەختی لە زیندانی دیاربەکرد بەسەر برد. لە دوای گرتنی ئۆجەلان لە ١٩٩٩، ئاڵتون بووە یەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی «پ. ک. ک» بۆ ئەوەی شوێنی ئۆجەلان بگرێتەوە.

**ڕەزا شا پەهلەوی (١٨٧٧– ١٩٤٤).** لە سەرەتادا بە ڕەزا خان ناسرا. کە ڕەزا شا لەسەر عەرشی شاهانەی ئێران دانیشت، نەخوێندەوار بوو، بەڵام ئەفسەرێکی چاکی سوپای قەزاق بوو. بەر لە هەموو شتێک حوکمی بنەماڵەی قاجاریەکانی لەناو برد؛ چونکە خەریک بوو هێدی هێدی خۆی توند دەکرد؛ پاش ئەوان و لە ١٩٢٥، خۆی بە

سەرۆکی تازەی بنەماڵەی نوێی پەهلەوی ڕاگەیاند.

ڕەزاشا ناوی وڵاتەکەی لە وڵاتی فارسەوە گۆڕی و ناوی ئێرانی لێ ناو سوپا و حکوومەت و دارایی ڕێک خستەوە و سەربەخۆیی ئێرانی مسۆگەر کرد. تا سەربەخۆیی ئێران سەقامگیر بکا، ڕەزاشا سیاسەتێکی فارسیی کۆنی پەیڕەو کردو بۆ ئەوەی ئامانجەکانی خۆی بپێکێ سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکەی لە نێوان دەوڵەتە گەورەکانی وەک بەریتانیا و ڕووسیای لەگەڵ ئەڵمانیا پارسەنگ کرد. ڕەزاشا فرە حەزی لە جەرمەنستان دەکرد. ئەم سیاسەتەکەی لە کۆتاییدا سەرنەکەوت ؛ چونکە هەر لە سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانییەوە، بەریتانیا و ڕووسیا ئێرانیان داگیر کرد و ڕەزاشایان ناچار کرد بۆ کوڕەکەی واز لە عەرش بێنێ و حەمەڕەزای پەهلەوی لەسەر عەرشی شای ئێران دانیشت.

ڕەزاشا سیاسەتێکی ناوخۆی یەکجار توندوتیژی دژی کورد پەیڕەو کرد و کوردی سەرکوت کرد. سیخوڕەکانی بە شێوەیەکی فرە ناجوامێرانە لە ١٩٣٠، شۆڕشگێڕی ناوداری کوردی ڕۆژهەلات؛ سمایل ئاغای سمکۆیان تیرۆر کرد و ئەو شێوە تاکتیکە دژە کوردە تا ئێستاش ئێران دژی سەرکردەکانی کورد بەچڕی پەیڕەوی دەکا. سیاسەتەکانی دیکەی ڕەزاشا خۆی لەوە دەنووانڎ کە لە سەرتاسەری ئێران دەبوو، تەنیا زمانی فارسی بخوێندرێ؛ ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستییە کوردیشی لێ دەرباز نەبوو. یەک لە ئامانجە نهێنییەکانی، پەیمانی سعد ئابادی ١٩٣٧، ئەوەبوو کە لەبری ئەوەی هەر یەکە لە تورکیا و سوریا و ئێران تاک تاکە کوردەکانی بندەستی خۆیان دژی یەکتری بەکار بێنن، سیاسەتەکانی خۆیان دژی کورد یەک بکەن و وێکڕا دژی خواستە ڕەواکانی گەلی کورد ڕابوەستن.

**ڕەسووڵ مامەند (؟-١٩٩٤).** سەرکردەیەکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوو. ناوبانگی لەوە دەرکرد کە ئەندامێکی بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان بوو. عەلی عەسکەری سەرۆکی ئەو پارتە بوو. ڕەسووڵ مامەند ئەندامێکی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانییە. دوای کوژرانی عەلی عەسکەری لە ١٩٨٧، ڕەسووڵ مامەند لەگەڵ ئەندامانی پارتەکەی پێوەندییان بە دکتۆر مەحموود عوسمانەوەکردو چوونە ڕیزی

پارتی دیموکراتی کوردستان/ کۆمیتەی ئامادەکاری و وێکڕا پارتی سۆشیالیستی کوردستانی عێراقیان دروست کرد.

پارتی سۆشیالیستی کوردستانی عێراق پارتێکی بچووک بوو، ئەندامی بەرەی کوردستانی عێراق بوو. بەرەی کوردستانی لە ئایاری ١٩٨٨ دامەزرا. پاش ئەوەی پارتی سۆشیالیستی کوردستانی عێراق، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩ی ئایاری ١٩٩٢، ئەنجامێکی باشی دەنگەکانی بەدەست نەهێنا، ڕەسووڵ مامەند چوو لە سەرەتادا پێوەندی بە پارتی دیموکراتی گەلی کوردستانی سامی عەبدولڕەحمان کرد. کە ئەو گرووپەش هەرەسی هێنا، ڕەسووڵ مامەند هەستا دووبارە خۆی گەیاندەوە ڕیزی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بووە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی. لە کاتێکدا کە ڕەسووڵ مامەند لە بەریتانیا بوو، لە ناکاو دڵی وەستاو لە ئینگلزتاندا مرد.

**ڕەفا**. ڕەفا حزبێکی ئیسلامیی تورکی بوو؛ نەجمەدین ئەربەکان سەرۆکی ئەو حزبە ئیسلامییە بوو. لە ١٩٩٦، یەکەم حزبی ئیسلامی بوو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، کە لەڕێگەی سندووقەکانی دەنگدانەوە توانیی دەسەڵات وەربگرێ. زۆر لە دەنگدەران بۆیە دەنگی خۆیانیان بەو حزبە دا، چونکە لەو باوەڕەدابوون کە ئەگەر بەراوردی لەگەڵ حزبەکانی دیکەدا بکەن، دەبینن ئەمە حزبێکی کارامە و ڕاستە.

چونکە ڕەگی حزبی ڕەفا، ئیسلامی بوو، بۆیە وەک حزبە عیلمانییەکانی دیکە بە ڕووی کورد ڕانەوەستا نامۆیی لە بوونی لە تورکیادا نەکرد. لەڕاستیدا ڕەفا ئومێدێکی پەیدا کرد کە ڕەنگ بوو لەسەر بنەماکانی ئیسلامەتی بتوانێ کێشەی کورد لە تورکیادا چارەسەر بکا. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئەوە لە بیر نەکەن کە حزبی ڕەفا و پارتی کرێکارانی کوردستان لە دوژمنداریکردنی یەکتری نەکەوتن و وەکوو پارت و گرووپە کوردییەکانی دیکە نەبوون، کە نێوانیان لەگەڵ ڕەفا باش بوو.

ڕەفا هەوڵی دا باری نائاسایی لە کوردستانی باکور لادا و بەلای لادانی ئەو بەربەستانەشدا چوو کە لەپێش بەکارهێنانی زمانی کوردیدا کەڵەکە کرابوون و جەختی لەسەر چارەسەرێکی ئاشتییانەی کێشەکە کرد. چونکە پارتی گەلی دیموکراسی، کە پارتێکی کوردی بوو، لە کاتی هەڵبژاردنە گشتییەکانی ١٩٩٥ لە تورکیا یاساغ کرابوو، بۆیە حزبی ڕەفا زۆرینەی دەنگی دەنگدەرانی کوردی لە

کوردستانی باکور وەرگرت.

ئەو کۆششەی ڕەفا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد کردی، تووشی نسکۆ هات و بە هۆی بەرهەڵستیکردنی توندی سوپای تورکیا، حزبی ڕەفا زوو لە حوکم دەرکرا. لە حوزەیرانی ١٩٩٧، ئەربەکان ناچار کرا دەست لەکار بکشێتەوە و پاشان دادگای دەستووریی تورک، لە یەنایری ١٩٩٨، حزبەکەشی قەدەغە کرد. ئەوەی بە ڕەفا کرا، پێشتر گەلێ جار دژی پارتە کوردییەکان ئەنجام دەدرا. سەیری (ئاق پارتیسی) بکە.

**ڕەفسەنجانی.** سەیری (عەلی ئەکبەر هاشمیی ڕەفسەنجانی) بکە.

**ڕووسیا.** لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕووسی (ڕووسییسکایا ئیمپێریا) ١٧٢١-١٩١٧، ڕووسیا گەلێ جار ویستی کوردەکان هان بدا بۆ ئەوەی گرفت بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست بکەن. یەک لەو هۆیانەی وای لە عوسمانییەکان کرد کە لە ١٨٩٠، جاشەکانی حەمیدییە لە کورد ڕێک بخەن بۆ ئەوە بوو تا بەرەنگاری ئەم فشارانەی ڕووس ببنەوە. هەرچەندە ڕووسەکان ئەم هەموو هەوڵ و کۆششەیان دا، بەڵام هەرگیز بۆیان نەکرا بە چاکی پشتگیریکردنی کورد بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. لە لایەکی دیکەوە ڕووسییەکان بە شێوەیەکی فرە دژوار پەلاماری کوردیان دا و تالانیان کردن. تا ئەم زووانەش هەندێ دایکانی کورد کە دەیانەوێ منداڵەکانیان کڕ بکەنەوە، بەوە دەیانترسێنن کە ڕووسەکان گوێیان لە دەنگی گریانیان دەبێ و دێن پەلاماریان دەدەن.

لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧و دروستبوونی یەکێتی سۆڤیەت، شەڕی سارد لە نێوان دنیای کۆمۆنیستی و دنیای سەرمایەداریی ڕۆژئاوایی دەستی پێ کرد؛ لەمیانی ئەو شەڕەو لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی، سۆڤییەتیەکان ویستیان کورد وەک کۆڵەمی پێنجەم بەکار بێنن و ئەو پشتیوانییەش کە لە کۆماری کوردستانیان کرد، هەر بەو مەبەستە بوو کورد وەک ئامێرێک بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیان بەکار بێنن. کە سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستانیش نکووڵی لە جێبەجێکردنی ئەو ڕۆڵەدا کرد و داوای سەربەخۆیییەکی مکومی گەلەکەی کرد، سۆڤیەتییەکان پشتی خۆیان لە کورد کرد و وەک نێچیرێکی شەتەک دراو تەسلیمی دەستی شای ئێرانیان کردەوە. لە دوای ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت لە ١٩٩١، گەلێک ڕێکخراو و گرووپی

کوردی بانشگە لە ڕووسیا حەشارگەیان بۆ خۆیان سازداوە و جێگیر بووینە. بۆ نموونە لە ١٩٩٥، ڕووسیا ڕێگەی بە پەرلەمانی کوردی دەرڤەیی وەڵاتدا دا تا ژڤێرێ کۆ ببێتەوە و لە ١٩٩٨، عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان، ویستی لە ڕووسیا بە پەنابەری سیاسی وەربگیرێ، بەڵام ڕێگەی نەدرا.

لە کاتێکدا کە لە ١٩٩٠، ڕووسیا ویستی کورد وەک کارێکی گوشار خستنە سەر تورکیا بەکار بێنێ، تورکەکان هەستان پشتی چێچانییە یاخییە بە ڕەگەز تورکەکانیان دژی ڕووسیای فێدراڵی گرت. لە ١٩٩٠ـەکان، ڕووسیا دژی بەردەوامیی سزا ئابوورییەکانی سەر ڕژێمی سەدام حوسێن بوو. ئەم هەڵوێستەی ڕووسیا دژی وڵاتە یەککگرتووەکان و لەبەر بەرژەوەندی ئابووریی ڕووسیا بوو.

لە سەردەمی سۆڤیەتی، ناوچەی لاچین لە ئەرمینیای سۆڤیەتی ژمارەیەکی دیاری کوردی لێ هەبوو، بە ناوی "کوردستانی سوور" دەناسراو تا ئێستاش هەندێ بنەماکانی ناسنامەی کوردیی هەر ماوە. جۆزێف ستالین کوردەکانی بۆ ئاسیای ناوەڕاست ڕاگوێزانەوە. بە پێی هەندێ ئامار، ژمارەی ئەو کوردانەی ستالین لە وڵاتی خۆیانی وەدەرنان، ژمارەیان لە ملیۆنێک کەس دەدا. زۆربەی نەوەی ئەو کوردانە ئێستا لە ڕووسیادا دەژین، لەناو کۆمەڵگەی ڕووسیدا تواونەتەوە. هەندێ لە شارەزایان دەڵێن ئێستا ژمارەیان ٢٠٠,٠٠٠ کەس دەبێ. ئەگەر تەماشای لایەنی مێژوویی ڕووسی بکەین، دەبینین کە ژمارەیەکی زۆری ڕووس بایەخیان بە کورد داوە. بۆ ڕێنە میخائیل لازاریڤی سەرۆکی بەشی کوردناسی Kurdology و کێشە هەرێمییەکانی بەشی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە پەیمانگەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتییەکان لە ئەکادیمییای زانستیی ڕووسی لە مۆسکۆ، زۆر بە چڕی دەربارەی کوردی نووسیوە و ئۆڵگا ژیگالینای هاوکاریشی هەمان ئەرکی ئەنجام داوە.

**ڕیا ئازادی**، سەیری (پارتی سۆشیالیستی کوردستان - پسک) بکە.

**ریچەرد نیکسن (١٩١٣- ١٩٩٤)**. ئەو سەرۆکەی وڵاتە یەککگرتووەکان بوو کە لەگەڵ ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتەکەی "هێنری کیسینجەر" خیانەتیان لە گەلی کورد کرد و لە ١٩٧٥، بێ هیچ ئاگادارییەک هەموو جۆرە یارمەتییەکی سەربازی و داراییان لێ بڕی و پێشەوا مەلا مستەفا بارزانییان ناچار کرد، بۆ

ڕێگەگرتن لە کاولکردنی کوردستان و کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراودا، شۆڕشی ئەیلوول لە ئاداری ١٩٧٥، ڕابگرێ. مێژوو دەنووسێ کە نیکسن و کێسینجەر درۆیان لە گەلی کورد و خیانەتیان لە سەرکردەکەی کردووە. چاودێران دەڵێن ستراتیژی گەورەی ئەوکاتی کیسینجەر تەنیا یارمەتیدانی ئیسرائیل و بەرهەڵستی کردنی یەکێتی سۆڤیەت بووە. پاشتر کە لێیان بوو بە هەرا و ڕەخنەی زۆریان لێ گیرا، هینری کێسینجەر، بیانووی بۆ خیانەتکردنەکەی هێناوە و نووسی: "ناکرێ کردەیەکی نهێنی لەگەڵ ڕاپەڕاندنی ئەرکێک تێکەڵی یەکتری بکرێن." سەیری (ڕاپۆرتی کۆمیتەی پایک) بکە.

**ڕێکخراوی پەیمانی ناوەندی (سێنتۆ).** سەیری (پەیمانی بەغداد) بکە.

**ڕێککەوتنی جەزایر (پەیمانی).** لە ئاداری ١٩٧٥، عێراق و ئێران لە جەزایر پەیماننامەیەکیان مۆر کرد و بەپێی ڕێککەوتنەکە، لە بەرانبەر پێکەوە بەکارهێنانی ڕووباری شەتولعەرەب، ئێران هەموو جۆرە یارمەتییەکی لە شۆڕشەکەی مەلا مستەفا بارزانی بڕی. بە بێ یارمەتییەکەی ئێران، شۆڕشە درێژخایەنەکەی بارزانی کە هەندێ جار هەڵدەگیرسا و جارانی تر دادەمرکاوە، خێرا هەرەسی هێنا و سەرکردەی مەزنی کورد ناچار کرا ڕوو لە تاراوگە بکا و لە ١٩٧٩ بە پەناهەندەیی سەری ناوە. کورد تا ئەمڕۆش ڕێککەوتننامەکەی جەزایر لەبیر ناکەن و بە گەورەترین کارەسات و خیانەتکاریی بیانی لەگەڵیاندا، دەزانن. سەیری (هینری کیسینجەر) بکە.

**ڕێککەوتننامەی سایکس- پیکۆ.** لە بنەڕەتدا ڕێککەوتننامەکی نهێنی بوو لە ١٩١٦ لە نێوان بەریتانیا و فرەنسا و ڕووسیادا مۆر کرا، بۆ ئەوەی لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئیمپراتۆری عوسمانی لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن و بەم چەشنە ڕێککەوتننامەکە زۆربەی کوردستانی گرتەوە. سێر مارک سایکس لە بری بەریتانیا و مسیۆ فرانسوا پیکۆ، نوێنەری فرەنسا و سێجی سازانۆڤ لە جیاتی ڕووسیا ئەو ڕێککەوتنەیان مۆرکرد. بەڵام لەدوای شۆڕشی بەلشەفی، ڕووسیا لە ڕێککەوتنەکە خۆی کشاندەوە. حکوومەتە تازەکەی سۆڤیەت ڕێککەوتننامەکەی بە هەموو دنیا ڕاگەیاند.

لە بنەڕەتدا، ڕێککەوتننامەکەی سایکس-پیکۆ، زۆربەی ئەو خاکەی کوردستانی کە ئێستا لە بن دەستی عێراق و سووریا بۆ فرەنسا تەرخان کردبوو. ئەو کوردستانەی کەوتە ژێر دەستی تورکیاش بۆ ڕووسیا دانابوو. لە دوای ئەوەی کە ڕووسیا لە پەیمانەکە دەرچوو، بەریتانیا بەشەکەی فرەنسای لە ویلایەتی مووسڵ داگیر کرد و بەبەر دەسەڵاتی ئیداریی خۆی گرت. ڕێککەوتننامەکەی سایکس پیکۆ بووە لەکەیەکی قێزەوێن بە نێوچەوانی ئیمپریالزمی فرەنسی و بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا نووسا و بە پێی ئەو ڕێککەوتننامەیە بوو توانییان یاری بە چارەنووسی کورد بکەن و بیخەنە ژێر دەستی خۆیان. کە تورکیای کەمالی پەیدا بوو، تورکەکان توانییان زۆربەی ئەو ناوچانە بگرن کە بڕیار بوو ڕووسیا داگیریان بکەن. ئەو ناوچانە ئێستێکە لە ٢٠٠٧دا، کوردستانی تورکیا پێک دێنن.

**ڕێگەی هاملتن.** ئەو ڕێگایە لە بنەڕەتدا بەریتانییەکان لە ساڵانی ١٩٢٠ـەکان و ١٩٣٠یەکاند دروستیان کرد. ڕێگەی هاملتن ڕێگەیەکی سەربازی، ستراتیژی بوو بەریتانییەکان بۆ ئەوە دروستیان کرد تا بتوانن هۆزە کوردییەکان هێور بکەنەوە و دەستیان بەسەریاندا بشکێ. لە هەولێرەوە هەڵدەستێ و تا مەرزی ئێراز هەڵدەکشێ. ئارکیباڵد و. هاملتن، کە ئەندازیارێکی نیوزیلەندی بوو، ئەو ڕێگەیەی دروست کرد؛ بۆیە ڕێگەکە ئەو ناوەی لێ نرا. هاملتن کتێبی "ڕێگەیەک با کوردستان"ی لە ١٩٣٧دا نووسییەوە.

# ز

**زازا**. سەیری (دیمیلی) بکە.

**زاگرۆس؛ زنجیرە چیای**. زنجیرە شاخێکە وەک ئەستوونێکی ناقۆلا، لە باکوری ڕۆژئاوای کوردستانڕا بۆ باشووری ڕۆژهەلاتی دەخشێ. ئەو کێوانە دیارترین تایبەتمەندییە جیۆگرافییەکانی ئەم خاکەنە کە بەزۆری ولاتێکی شاخاوییە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشەوەیە کە کورد زاگرۆس بە سیمبولێکی نەتەوەیی و هێمای نەمریی گەلەکەیان دەزانن.

**زەردەشتی**. ئاینێکی پێش هاتنی ئیسلام بووەو لە سەردەمی هەردووک ئیمپراتۆری ئەخمینییەکانی (٥٥٠- ٣٣٠ پ.ز.) و ساسانییەکانی (٢٢٦-٦٥٠ ز.)یدا باو بووە. گومان لەوەدا نییە کە ئاینی زەردەشتی کاریگەریەکی زۆری لە ڕێبازی فریشتەکان (ئاینی ئێزیدییەکان)دا هەیە. هەندێ دەڵێن کورد لە جەژنی نەورۆزدا ئاگر دەکەنەوە، تا ڕیز لە ئاگر بگرن، چونکە ئاگر لەم ئاینەدا هێمای پاککردنەوەیە.

ئاینی زەردەشتی، سەرجەم کات واتە (زەمان)، بە ڕابردووو ئێستا و ئایندەشیەوە، دەکاتە چوار سەردەمی جودا، کە هەر سەردەمێکیان ٣٠٠٠ ساڵ دەخایەنێت:-

١- لە سێ هەزار ساڵەی یەکەمدا؛ لە خودی کەسی ئەهورامەزدا بترازێت؛ چونکە ئەو ئەزەلەو هەر هەبووەو هەر دەشمێنێ، هیچ بوونەوەرێک نەبووە.

٢- ئەم سێ هەزار ساڵەی دووەمیش، پێش هاتنی زەردەشت بووە، لەم ماوەیەدا ئەهورامەزدا "مادیا" و "ماشیانا"ی واتە "ئادەم" و "حەوا"ی داهێنان؛ ئەمانەش یەکەم پیاوو ئافرەت بوون کە خودا خەلقیکردن. ململانێی نێوان چاکە و خراپە لێرەوە و لە سەرەتای داهێنانی مرۆڤەوە دەستی پێ کرد.

٣- لەم سەردەمەی سێیەمدا باوەڕی زەردەشتی بڵاو بووەوە. ململانێی نێوان چاکە و خراپە لە پێشان دژوار تر بەردەوام دەبێت؛ چونکە مرۆڤ دەکەوێتە نێوان دوو ئایدیۆلۆژیای ناتەباوە کە بیری پاک و ڕەوشتی چاک لەلایەکیەوەیەو لە لایەکەی تریشی بیری تاریک و خراپەکاریە. مرۆڤە چاکەکان ملکەچی ئەهورامەزدا دەبن؛

کـەچی ئەهریمەن هەندێک لە لەخـۆبایی بووان فـریو دەدات؛ ئەمـانـە مـرۆڤـە خراپکارەکانن کە بەدوای قسەی ئەهریمەن دەکەون؛ ئەمانە هەڵخەڵەتاوەکانن.

٤- لەسـەردەمی چوارەمـیندا، ڕزگـارکـەرێک بەناوی "سـاونشـیـانت" پەیدا دەبێت. ڕاستی باڵادەست دەبێت، هەمیشە بۆ یەکجارەکی چاکە سەردەکەوێ و کۆتایی بە ملمـلانێی نێوان دوو ئایدیۆلۆژیا ناکۆکەکان دێت؛ چونکە لەم سـەردەمە مرۆڤ ژیرتر دەبێت، بۆیە هەمـوو لەسـەر یەک هزرەوە ڕێک دەکـەون و لە نێـوان خۆیاندا کۆک دەبن. ئەم بیرۆکـەیە لە ناو جـوولەکە و شـیـعە مـەزهـەبـەکـاندا هـەیە و لەلای شیعەکان "ساونشیانت" گۆڕاوەو کراوە بە (محەمەدی مەهدی چاوەڕوان کراو).

ئاینی زەردەشتی تەنیا یەک کتێبی پیرۆزی هەیە، ئەویش "ئاڤێستا"یە. ئاڤێستا بە واتای ؛"یاسـا" دێت. هـەندێ جـاریش پـێی دەڵێن (زەند- ئاڤـێسـتـا)، وشـەی "زەند" دەکـاتە "ڕوونکردنەوە"؛ بەم چەشنە (زەند- ئاڤێسـتا) دەبێتە (ڕوونکردنەوەی یاسـا). ئاڤێسـتا بە شێوە زارێکی ئێرانیی کۆن نووسـراوەتەوە کە نزیکە لە زمـانی "ڤـەندی سـەنسکریتی" و گەلێک لە دەقەکانی خراپ بووە و هەندێکیشی ناخوێندرێتەوە.

ئاینی زەردەشـتی Zoroastrism کە ئەهورامـەزدا، لە سـەردەمی شـا جـەمـشـید، بۆ ئارییـەکـانی ئاشکرا کـرد؛ ، بۆ پاککردنەوی ئینسـان، تـەکنیکێکی تایبـەتـی پەیڕەو کـردووە تا سروشـتـی ئاشـتـیپـەروەر و ئاسـوودەیی کـۆمـەڵانی ئاری نەژاد دەرببڕێ؛ هەروەها بۆ ئەوەی بە توندی دژایەتیی (فرە – خوا polytheism)یەتی بکات.

زەردەشت لە سـەرەتای ئامـۆژگـارەکانیـدا لە گـەلەکـەی خـۆی خـواست کـە واز لە (دووانە – خواهی dualism) بهێنن و باوەڕ بە (یەک – خودا monotheism) بێنن؛ باوەڕ بە "ئەهورامـەزدای تاک"، "خوای ژیر" بێنن. ئەم خوایەی ئاینی زەردەشتی "بێـهاوتایە abstract" و "لە بوونەوەری مادی بەرزترە" و "موتڵەقە".

زەردەشت لەو باوەڕە بووە کە ئەهورامەزدا دنیای لە شەش ڕۆژدا دروست کردووەو جـەخـتـیشـی کردووە کە ئەهـورامـەزدا مـرۆڤی داهـێناوە، واتە خـوا جـەسـتـەو بـیری مـرۆڤی دروست کــردووە. هـەر ئەهـورامــەزداشــە پارێزەر و خــۆراکـدەری هـەمــوو گیانداڕێک. لەو باوەڕەشدا بووە کـە ئەهورامـەزدا بە خۆی تـاکە خوایە کە ئاسمـانی داهێناوە؛ زەویی درووست کردووە و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیشی داهێناوە و دەیپارێزێ

و ئازادیشی بە مرۆڤ داوە بۆ ئەوەی لە نێوان دوو ئایدیۆلۆژیای دژ بە یەکەوە ڕێگەی خۆی هەڵبژێرێ. بەم جۆرەش بە سەر ئەم دوو تیپە فیکرییە دابەش ببن. گرووپی یەکەم؛ مرۆڤە چاکەکانن، ئەمانە ملکەچی ئەهورامەزدا دەبن. کەچی ئەهریمەن هەندێک فریو دەدات؛ ئەمانە مرۆڤە خراپەکانن کە بەدوای قسەی ئەهریمەن دەکەون؛ ئەمانە خەڵەتاون. دەشبێ ئەم دوو لایەنە یان پاداشت بکرێن، یان سزا بدرێن. بۆیە ئەهورامەزدا، دوای مردن زیندوویان دەکاتەوە و دادگاییان دەکات. پاشان هەموو کەسێک دەبێ بە سەر "پردی چینڤاتۆ"دا ڕەت ببێت. ئەم پردە بە سەر دۆزەخدا دەپەڕێتەوە و خەڵکەکە دەکاتە دوو چین. ئەو کەسەی کە باش نییە، پردەکە لە پێشیەوە تەسک دەبێتەوە و مرۆڤە خراپەکە لەوێوەڕا بەردەبێتەوە بۆ ناو دۆزەخ. بەڵام ئەگەر مرۆڤەکە چاک بێت، شایانی ڕزگاربوون بێت، ئەوە پردێکی پان و بەرین دێتە پێشیەوەو بە ڕووناهیی هەمیشەیی شاد دەبێ.

زەردەشت هەمیشە کۆششی کردووە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەیەک سەرچاوەوە ببەستێتەوە؛ ئەویش خودایە. ئەو خوایەی کە ئینسانی داهێناوە؛ زەردەشت باوەڕی وابووە کە ئەهورامەزدا پارێزەری پادشایەکانی زەمان و هەموو پیاوچاکان بووە و (ئەهورامەزدا) بە ڕاست دەزانێ و باوەڕی وایە جگە لەو، هیچ خوایەک نییە؛ بەڵکوو ئەهریمەن هەیە. ئەهریمەنیشی وەبەر نەفرەت گرت.

نوێژکردن بریتیە لە کڕنۆش بردن بۆ ئەهورامەزدا نزاکردن و پاڕانەوە و قوربانی بۆی پێشکەشکردنە. قوربانییەکە دەشێ کەرەستەی خاوی سروشتی بێت کە خوا خۆی دروستی کردوونەو لە هەموو ئەو قوربانییانەشیان بالاتر (ئاگر)ە؛ بەڵام قوربانیی ئاوو خاکیش شوێنی باڵایان لەلای ئەهورامەزدادا هەیە. ڕێزی تایبەت لە ئاگر دەگیرێ؛ هەر لەبەر ئەمەشە کە کەسانێک هەن بە هەڵە وا تێ گەیشتوونە کە زەردەشتیان ئاگر دەپەرستن. بەڵام ئەمە بە هیچ ڕەنگێک ڕاست نییە؛ چونکە زەردەشتی کە ڕێز لە ئاگر دەنێ؛ مەبەستی ئەوەیە کە توێکڵە و ڕوحی سروشت پیس نەبێت. ئاخر وەک ئاو، ئاگر هەموو پیسایەک لەناو دەبات و وەکوو عەرەبیش دەڵێن دوا ڕێگە بۆچارەسەری برین سووتاندنیەتی؛ بەم جۆرە ئاگر هەموو خراپەیەک دەسووتێنێ و نایهێڵێ.

زەردەشت لەو باوەڕەدابووە کە ئەهورامەزدا خودانی هەرە مەزنی هەموو دنیایە، هەموو بوون (وجوود) هەر خۆیەتی، خودا سەرچاوە و کانی ژیانە. ئەهورامەزدا ڕووناهییە و شکۆمەندە و گەورەترینە، چاکترینە، جوانترینە، بەهێزترینە، زاناترینە، پیرۆزترین پیرۆزە، داهێنەری زەوی و ئاسمانە. خودا نەگۆڕە، بەرزە، ڕاستە، دادە، بەزەییە، هەموو چاکەیەک لەئەوەوە بۆمان دێت.

زەردەشت، پەیتا پەیتا، بەڕووی هەندێ ڕەوشتی ناپەسندی وەک سەرخۆشی و قوربانیکردنی "گا"دا وەستا و پاشان حەرامیکردن. بەم جۆرە زەردەشت یەکەم کەس بووە کە ڕێنماییەکانی بڕیاری تاکەکەسی و بەهەشت و جەهەننەم و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەی دوایی، ڕۆژی حەشری فێر کردووە. ئەم ڕێنماییانە دواتر بوونە کەرەستەی باوەڕهێنان بۆ مرۆڤ و ئایینەکانی تریش ئەم ڕێنماییانەیان وەرگرتووە. بەڵام مرۆڤی زەردەشتی بە خۆی لە هەمووان پتر و توکمەتر ئەم ڕێنماییانە پەیڕەو دەکات. زەردەشت لە ڕێنماییەکانیدا دەفەرمێ:- "هەموو شتێکی باش و سوودبەخش بۆ مرۆڤ، ئەهورامەزدا دای هێناوە. هەرچی کە سروشتی خراپە و کاریگەریی خراپی هەیە و ئەنجامی خراپیشی لێ دەکەوێتەوە، هەمووی لە ئەهریمەن (شەیتان)ەوە دووچاری ئینسان دەبێت."

ڤێندیداد تاکە سەرچاوەی ئاینی زەردەشتییە؛ فەرمان بە زەردەشتیانی ئافرەت و پیاو دەدا، بۆ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ هاوئایینییەکانیاندا بکەن. ئەم ڕێنماییە پیرۆزە ئەوەی تێدا ڕەچاو دەکرا کە توانای پتەوی مۆراڵی (ڕۆحی) ئاینی ئاریایان و ناسنامەی ئیتنۆسی ئارییە زەردەشتییەکان بپارێزێ. زەردەشت بڕیاری داوە کە ناسنامەی نەتەویی و ئاین یەکن و لە یەکتری جودا ناکرێنەوە؛ خودی ئەهورامەزدا بە خۆی لە (ڤێندیداد)دا ئەمە ئاشکرا دەکات.

* ئاینی زەردەشتی هەندێ بنەمای ئەوپەڕ بەهاداری هەیە؛ ئەو بنەمایانە لە ئاینەکانی دیکەدا نینە. زەردەشتی ئەوە جەخت دەکاتەوە کە "ڕاستکارانی هەر ئایینێک دەچنە بەهەشت، هەموو ئاینەکان یەکسانن، بۆیە (ئاین- گۆڕی -conver sion) گێلاتییە. ئاینگۆڕی دژی یاسای باڵای خودایە و دژی ڕاستییە؛ چونکە خودا ئێمەی لەسەر ئاینێکی دیارەوە دروست کردووە، بۆ ئەوەی بیپەرستین نەک بۆ

ئەوەی متمانەی پێ نەکەین و لێی یاخی ببین و بچینە سەر ئاینێکی تر." زەردەشت لەو باوەڕەدا بووە کە هەموو هزرەکان "المعتقدات" لە کۆتاییدا ئیمان بە خودا دەهێنن. بۆیە زەردەشتیان نە (نێردراوە ئاینییە مزگێنبەخشەکان missioaries) بۆ بەزەردەشتیکردنی خەڵک دەنێرن؛ نە لایەنگرانی ئاینەکانی تر دەگۆڕنە سەر ئاینی خۆیان؛ بەڵکوو بۆ پترکردنی لایەنگرانیان دەبێ پشت بە ژنهێنانی نێوان زەردەشتیان ببەستن و چەندی بۆیان دەلوێ بێلن منداڵیان ببێت.

* بە مەبەستی پاراستنی پاکیی ڕەگەزی ئاریایی، ژن لە کاتی بێنوێژی menstruation دا بۆی نییە لە ڕێوڕەسمە ئاینییەکاندا ئامادە ببێت؛ تەنانەت نابێ لە ماڵەوەش ئاگر بکاتەوە و دەبێ بە درێژایی ئەو ڕۆژانە لە مێردەکەشی دوور بکەوێتەوە.
* لە بنەمایە سەرەکییەکانی دیکەی ئاینی زەردەشتی، ئەوەیە کە مردوو دەبێ لە ناو "داخمە"یەکدا لەناو ببرێ. وشەی "داخ" لە کوردی ئەمڕۆدا هەمان واتا کۆنەکەی دەبەخشێ. بەم جۆرە پێویستە گۆشتی مردوو یان لە ناو کوورەیەکدا بسووتێندرێت، یان باڵندەیەکی گۆشتخۆر بیخوات یان دەبێ لەبەر هەتاوێدا وشک بکرێتەوە.

**زەلێ**. کامپێکە لە ناو شاخەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی لە باشووری کوردستان و لە نزیکی سنوورەکانی ئێرانە. نزیکەی ١,٧٠٠ جەنگاوەری پارتی کرێکارانی کوردستان لەو کامپەدا بوون. دەڵێن لە دوای شەڕەکەی کە لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢، لە نێوان ئەوان و پێشمەرگەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان قەوما، ئەوانە هێندرانە نێو ئەو کامپەوە. لەو شەڕدا، تورکیا دژی «پ. ک. ک»، پشتیوانیی «ی. ن. ک» و «پ. د. ک»ی کرد.

هێندەی نەبرد کە میدیاکانی تورک دەمی قەڵەمەکانیان لە «ی. ن. ک» کردەوەو گومانی داڵدەدانی گەریلایان خستە پاڵیەوە. لە یەنایری ١٩٩٤، فڕۆکەکانی تورک کامپەکەیان بۆردومان و وێران کرد، بەڵام گەریلاکانی «پ. ک. ک» سەرکەوتووانە پێش بۆردومانەکە کامپەکەیان چۆل کرد و هەندێ لەو بۆمبایانەی فڕۆکەکانی تورک بەریان دانەوە کەوتنە نێو خاکی ئێران و لەوێ تەقینەوە و ٢٠ ئێرانییان کوشت.

سەیر ئەوەبوو لە ٢٠٠٠، «پ. ک. ک» و «ی. ن. ک» سەنگەریان لە یەکتری گرتەوە و شەڕ لە نێوانیان قەوما. شەڕەکەش بە هۆی ئەوەوەبوو کە «پ. ک. ک» دەیویست

بنکەکانی خۆی لەناوچەی زەڵێ توند بکا و ئەمەش پێ دەچوو هەڕەشە لە پێگەکانی «ی. ن. ک» بکا. کە تورکیا عەبدوڵڵا ئۆجەلانی دەستگیر کرد، جەنگاوەرانی «پ. ک. ک» ناچاربوون لە سنوورەکانی تورکیا دوورتر کەونەوە و پتر بۆ ناو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی «ی. ن. ک» بچن.

**زەند.** هۆزێکی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، لە ١٧٥١ تا ١٧٩٤ ڕۆژئاوای ئێرانی حوکم کردووە. زەند لە بنەماڵەی لەکن. نادر شا لە ١٧٣٢دا، ئەوانەی لە زێدی باپیرانیان لە "دەپەری" چەقی کێوەکانی زاگرۆسەوە، بۆ خۆراسان ڕاگوێزانەوە. بەڵام پاشان کە نادر شا لە ١٧٤٧ کوژرا، زەندەکان بە سەرکردایەتیی کەریم خانی زەند، بە شەڕ توانییان ڕێی خۆیان پاک بکەنەوە و بۆ زێدی خۆیان بێنەوە.

ناوبانگی بنەماڵەی زەند بە ناوی کەریم خانەوە بەندە. توانیی لەشکرێکی گەورە لە کوڕانی عەشایری زاگرۆس پێک بێنێ و هاوپەیمانی لەگەڵ بیورۆکرات و گەورە کەسایەتییەکانی شارە گرینگەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی فارس دابمەزرێنێ. ئەو هاوپەیمانەتییە شارەکانی ئیسفەهان و شیراز و تەورێز و کرمانی دەخۆدا گرتبوو. بۆ ماوەیەک کەریم خان ئەفسانەیەکی بووژاندنەوەی سەفەوییەکانی بەکار هێنا و ناتۆرەی وەکیل، واتە بریکاری لە خۆی نا. دووبارە پایەتەختەکەی خۆی کە شیراز بوو، دروست کردەوە و سیاسەتێکی ئابووریی زیرەکانەی دارشت و ڕێبازی شیعە دوازدە ئیمامییەکانی پەسند کرد و نەرمییەکی زۆری لە بواری ئاینیدا پەیرەو کردو بە پێی بەندە فۆلکلۆرییەکانیش بێ ئەندازە جوامێر بووە. کەریم خانی زەند، بۆ ماوەیەکی کورتیش بەندەری بەسرەی لە عوسمانییەکان گرت و پاشان پاشەکشەی لێ کرد.

زەندەکان لە ئەوپەڕی بەهێزییاندا، تەنیا ڕۆژئاوای وڵاتی فارسیان حوکم کرد و نەچوون قاجارەکانی ئەسترابادی سەر لێواری دەریای خەرزیش بگرن. کەریم خان نەچوو ناوچەی خۆراسانی باکوری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی فارسیش داگیر بکا. میراتگرەکانی کەریم خانی لە ناو خۆیاندا بەشەڕ کەوتن و پاش ماوەیەکی کورت تورکمانە قاجارەکانی ئەستراباد، هاتن و وڵاتەکەیان لێ داگیرکردن. لوتف عەلی خانی زەند، دوا فەرمانڕەوای زەند بوو. لە شەڕدا بەزی و گیرا. پاشان بە فەرمانی

ئاغا محەمەد خانی گەورەی قاجارەکان، لە ناو تەلارە قەشەنگەکەی کەریم خانی زەند، تا لە بن دەستیان مرد، هەر ئەشکەنجەیان دا.

**زوحاک.** سەیری (نەورۆز) بکە.

**زیا گۆکاڵپ ( ١٨٧٦-١٩٢٤).** کەسێکی بە ڕەگەز کورد بوو لە دیاربەکر هاتبووە دنیا. خۆی بە تورک دەزانی و سەیر ئەوەیە کە یەکێک لە دامەزرێنەرانی هزری نەتەوەپەرستی هاوچەرخی تورکی بوو. لە ١٩٢٠دا لە توێژینەوەی (بنەماکانی تورکایەتی The Principles of Turkism)یدا پێشبینیی پەرەسەندن دەکات و نەتەوە وا پێناسە دەکا کە لە ئەنجامی پەروەردە دروست دەبێ و پێوەندیی بە ڕەچەڵەکەوە نییە. بە بۆچوونی گۆکاڵپ، گەل گرووپێکی ڕەگەزی، ئیتنی، جیۆگرافی، سیاسی، یان خۆبەختکاری نییە، بەڵکو گرووپێک خەڵکن بە یەک جۆر پەروەردە دەبن و فێری یەک زمان، یەک ئاین، یەک ڕەوشت و یەک هونەریش دەبن. ڕەنگە ئەو نووسینەی ئەو کابرایە بووبێ وای لە کەمال ئەتاتورک کرد هەوڵ بدا کورد لە ناو ئەو نەتەوە تورکەی کە تازە خەریک بوو دروست دەبوو، بتوێنێتەوە.

**زیلان.** سەیری (میلان) بکە.

**زێنەفۆن.** سەرکردەی ئەو ١٠,٠٠٠ سوارە یۆنانییە بووە کە کوروشی فارسی لە ٤٠١پ.ز. بەکرێی گرتوون بۆ ئەوەی ئەردەشێری برای بکوژن و دەسەڵاتی بۆ لێی وەربگرنەوە. زێنەفۆن کتێبی ئاناباسیس Anabasis نووسیوەتەوە؛ لەو کتێبەدا باسی ئەو سەفەرەی دەکا. ئەوەی جێی بایەخ پێدانە ئەوەیە کە زێنەفۆن دەگێڕێتەوە چۆن دیلێکی کاردۆخیی بە خەنجەرەکەی کوشتووە، چونکە ئەو ڕێیەی پێنیشان نەدا کە بتوانێ لەوێوەڕا لەشکرە جاشەکەی دەرباز بکا. پاش کوشتنی یەکەم شەهیدی کورد کە مێژوو باسی بکا، دیلەکەی دووەم ڕێگەی دەربازبوونی پێ نیشان دان و تێشی گەیاندن کە ئەو دیلەی زێنەفۆن کوشتی بۆیە ڕێگەیەکەی پێ نیشان نەدان چونکە ماڵی کچەکەی کەوتووەتە سەر ئەو ڕێیە و ئامادە بوو خۆی بکاتە قوربانی نەک کچەکەی ببێتە دیل و بەبەردەستی جاشەکانی زێنەفۆن بکەوێ. چیرۆکەکە لە کتێبی (دە هەزارەکە)دا هەیە و وەرگێڕی ئەم کتێبە ئەویشی کردووەتە کوردی. سەیری (کاردۆخییەکان) بکە.

## ژ

**ژن (ئافرەت)**، وەک زۆربەی کۆمەڵگە نەریتی و ئیسلامییەکان، کۆمەڵگەی کوردەواریش هەندێ ماف و دەسەڵاتی بە پیاو داوە کە لە ژنانی حەرام کردووە. لەناویان دەبێ پیاو دەسەڵاتدار و فەرماندار و جەنگاوەر بێ و پێداویستییەکانی رۆژانەی خێزانەکەی پەیدا بکا؛ کەچی ئافرەت دەبێ ئاگای لە ماڵ و منداڵ بێ و ملکەچی خواستەکانی مێردەکەی بێ.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر ئافرەتی کورد لەگەڵ ژنانی ئەو نەتەوە موسڵمانە دراوسێیانەی نەتەوەی کورد بەراورد بکەین، بە ڕاشکاوی دیارە کە ئافرەتی کورد، هەمیشە لەوان پرتر ئازاد بووە و دەسەڵاتی لەوان فرەتر هەبووە. لەڕاستیدا، هەموو ئەو گەڕیدانەی کە بە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا ڕەت بووینە، باسی ئەوەیان کردووە کە ژنی کورد پێچەی نەکردووە و ڕووی خۆی نەشاردووەتەوە و ئازادیی زۆری هەبووە و زۆربەی کارەکانی خۆی بە دەست کردووە. لە کاتی شووکردنیشدا، ئافرەتی کورد پرسی پێ دەکرێ و لە بابەتی مێردکردن قسەی ئەو بەسەر دەکەوێ. بەڵام هێشتا هەندێک جار دایک و باوک دەست لە پرۆسەی ژنهێنانی منداڵەکانیان وەردەدەن و بۆیان ڕێک دەخەن. پیاوی کورد لە هەموو پیاوانی ئەو نەتەوانەی دەوروبەری خۆیان بە شێوەیەکی یەکسانتر هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوسەرانی خۆیاندا دەکەن و ڕێزیان لێ دەگرن. ژنانی کورد پتر لە ژنانی میللەتانی دراوسێیان ماڵداریکەرترن و لەوان پتر باری دارایی خۆیان و هی خێزانەکانیان بەڕێوە دەبەن. ژنی کورد زۆر بە ئاسانی لە دوای مێردەکانیان، توانیویانە سەرداری ماڵەکانی خۆیان بکەن و جا ئەگەر منداڵی نێرینەشیان هەبێ هەر دەکەونە بەر دەسەڵاتی دایکەکانیانەوە؛ دایک ماڵەکە بەڕێوە دەبا.

جاری ئاواش بووە کە ئافرەتی کورد ڕۆڵی سەرەکیی لە بواری سیاسی و سەربازیدا بینیوە. خانمی قەرە فاتمە (فاتمە ڕەش)ی مەرەشی، لە شەڕی ڕووسی-تورکی لە ١٨٧٧، سەرکردایەتیی سەدان پیاوی دەکرد و لە شەڕی دژی عرووسەکاندا

باشترین جەنگاوەری مەیدان و لە دادگای عوسمانی لە ئەستانە، نوێنەری گەلی کورد بوو. دوا فەرمانداری ئۆتۆنۆمیی ناوچەی هەکاری ئافرەت بووە. بێجگە لەوانەش چەند ئافرەتێکی کورد ڕووبەڕووی لەشکری داگیرکەری عوسمانییەکان بوونەتەوە: لە کوردستانی باشوور؛ دایە پوور حەلیمەی پشدەری و دایە نێرگزە ڕەشی ناوچەی شوان و لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیش، دایە پڕشەنگی هۆزی میلان مەیدانیان لە سوپای عوسمانییان گرتووە. عادلە خاتوونیش، تا مردنی لە ١٩٢٤، سەرکردەی ڕۆشنبیر و ناوداری عێلی جاف بووە. هەرچەندە مارگرێت جۆرج خۆی ئاشووری بووە، بەڵام هەر بە ئافرەتێکی جەنگاوەری کورد دەناسرێ. هێرۆی خێزانی جەلال تاڵەبانییش لە بواری بەرگریکردن لە مافەکانی ئافرەتانی کورد، کەسایەتییەکە ناو و دەنگی خۆی هەیە.

هەرچەندە ئەم هەموو نموونانەمان لە بەردەستدا هەیە، بەڵام هێشتا مافەکانی ژنی کورد لە کوردستان کێشەیەکە پێویستی بە چارەسەر هەیە. بۆ نموونە، ئافرەتی کورد لە ژێر دەستی تورکان، لە باکوری کوردستان بە تایبەتی لە ساڵانی شۆڕشی «پ. ک. ک» لە ١٩٨٠کان و ١٩٩٠ـەکاندا، دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی تورک زۆر بە توندوتیژی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن و ئابڕوویان دەبردن و دەستدرێژیی نامووسییان لێ دەکردن. لەم دواییانەشدا، حکوومەتی هەرێمی کوردستان یاسایەکی بۆ سزادانی شەرەفکوژی داڕشت و کوشتنی ئافرەتی بە دەستی خزم و کەسانی بە بیانووی ئەوەی کە ناوی خانەوادەکەی پیس کردووە بە کردەوەیەکی دژی یاسا دانا و بکوژی ئافرەت وەک هەر بکوژێکی ئاسایی، سزا دەدا. لە کوردستانی باکوریش خەریکە بایەخ بە هەمان بابەت دەدرێ. ژنە پەناهەندە مێیینەکان و بێوەژنان لە پیاوان زۆرتر ئازاریان هەیە. بێگومان، هێشتا زۆر ماوە لە کوردستان بکرێ، بۆ ئەوەی مافەکانی مرۆڤی ئافرەتی کورد، وەکوو پێویست، بپارێزرێ.

## س

**سادق خەلخالی (ئاخوند).** بە ناتۆرەی (دادوەری سێدارە) ناوی دەرکرد، چونکە، بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کوردی ئێران، کە لە ١٩٧٩دا دژی کۆماری ئیسلامی ڕاپەڕین، هەر بە دادگاییکردنێکی کورت، بە کۆمەڵ لاوی کوردی ئیعدامکردن. وا دەخەملێندرێ کە تا شوباتی ١٩٨١، نزیکەی ١٠,٠٠٠ کورد یان لە شەڕدا کوژران و یانیش ئیعدامکران. سەیری (خومەینی) بکە.

**سارەلوو.** گرووپێکی بچووکی کوردی سەر بە کاکەییە ئەهلی هەقەکانن، لە کوردستانی باشوور، لە شەش گوندی قەراخی زێی بادیناندا دەژین. سارەلووەکانیش وەک ئێزیدی و شەبەک و باجەلانەکان نهێنییەکانی ئاینی خۆیان بە چاکی دەپارێزن و کەسی فێر ناکەن. سارەلوو شێوە دایەلەکتێکی گۆرانی زمانی کوردی بەکار دێنن.

**سامی عەبدولڕەحمان (محەمەد عەبدولڕەحمان) ( ١/١٩٣٢- ٢- ٢٠٠٤ )** بە (سامی) ناسرا بوو، تا دوای سەردەمی مەلا مستەفا بارزانی سەرکردەیەکی ناوداری کورد بوو. لە بەریتانیا بڕوانامەی ئەندازیاریی وەرگرتبوو. ماوەیەک لە دوای نسکۆی شۆڕش لە ١٩٧٥، سامی پێوەندیی بە هەردوو کوڕەکەی مەلا مستەفا بارزانی، ئیدریس بارزانی و مەسعوود بارزانییەوە کرد، بۆ ئەوەی لەگەڵیاز سەرکردایەتییەکی کاتی «پ. د. ک» پێک بێنێ. بە هۆی جیاوازیی بیر و بۆچوونی لەگەڵ ئیدریس بارزانی، سامی وازی لە «پ. د. ک» هێنا و لە ١٩٨١ پارتی گەلی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند. لەمیانی دانوستانەکەی بەهار و هاوینی ١٩٩١ نێوان حکوومەتی عێراق و بەرەی کوردستانی، سامی یەکێک لە نوێنەرەکانی کورد بوو.

لەمیانی هەڵبژاردنە گشتییەکەی کوردی عێراق لە ١٩ی ئایاری ١٩٩٢دا، کردیان پارتی گەل، ئەنجامێکی خراپی بەدەست هێنا. بۆیە هەوڵی بەهێزکردنەوەی خۆی دا، لەگەڵ دوو پارتی کوردیی بچووکتر، یەکیان گرت و پارتی یەکگرتووی کوردستانیار

پێک هێنا، سامی له ١٩٩٣، دووباره پێوەندی به «پ. د. ک» کردەوە. لەو کاتەوە ڕۆڵێکی گرینگی گێڕا و بووە جێگری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، له سەرەتای ٢٠٠٢ سامی عەبدولڕەحمان تووشی دڵەکوتە بوو، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت توانیی بێتەوە سەر کار. سامی عەبدولڕەحمان؛ له ئەنجامی تەقینەوە تیرۆریستییەکەی ١ی شوباتی ٢٠٠٤ی بارەگای لقی دووی «پ. د. ک» له هەولێر، هاودەم لەگەڵ دەستەیەک له سەرکردە هەرە دیار و بەرپرسە کارامەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا، شەهید بوو.

**سلێمان دیمیرێل (١٩٢٠–    )**. بڕوانامەی ئەندازەی هایدرۆلیکی هەیە. له باڵی ڕاستڕەوە نەرمۆیەکانە. له ١٩٦٥ڕا تا ١٩٩٣، چەند جارێک پۆستی سەرۆک وەزیرانی تورکیای وەرگرتووە و له دوای مردنی تورگوت ئوزاڵیش، له ١٩٩٣ڕا تا ٢٠٠٠، سەرۆک کۆماری تورکیا بووە. سوپا دوو جار له ١٩٧١و له ١٩٨٠دا، سلێمان دیمیرێلی لەسەر حوکم لاداوە. ئەمە وای لێ کرد گەلێک وریا بێت و سەبارەت بە کێشەی کورد بەرهەڵستی سوپا نەکا.

که سلێمان دیمیرێل له ١٩٩١ بووە سەرۆکی حکوومەت، دانی بە "ڕاستیی بوونی کورد" دانا؛ بەمەش ئومێدێکی زۆری نیشان دا کە ڕەنگە سەرکەوتووانە کێشەی کورد چارەسەر بکات. بەڵام ئەو مێشکەی ئاسایشی نەتەوەیی کە سەبارەت بە بنەما سەرەکییەکانی مافەکانی مرۆڤ هەیانە، بووە تەگەرە و هەرەسی بە پێشنیازە بچووکەکانی دیمیرێل هێنا. هەرچەندە دیمیرێل سیاسەتمەدارێکی کارامە و گوتارخوێنەرێکی وا بوو کە کەس تۆزی نە دەشکاند، بەڵام هێشتا بووە سیمبۆلی ئەوەی کە تورکیا ناتوانێ نە خۆی بگۆڕێ و نە چاکسازیش ئەنجام بدا. هەوڵەکانی دای بۆ ئەوەی وەک سەرۆک کۆمار بمێنێتەوە سەرنەکەوتن. ئەحمەد نەجدەت سیزەر کە چاکسازێکی نەشارەزایە لە ٢٠٠٠ لە دوای ئەودا، پۆستی سەرۆک کۆماری وەرگرت.

**سلێمانی**. شارێکی ٧٥٠,٠٠٠ کەسییە. دووەم گەورەترین شارە کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەڕێوەی دەبا. گەلێ جار بە سلێمانی دەڵێن: "پایەتەختی ڕۆشنبیریی کوردستانی باشوور". دانیشتوانەکەی بە دیالەکتی سۆرانی دەدوێن. ئەگەر سلێمانی بە هەولێر بەراورد بکەین؛ دەزانین کە سلێمانی شارێکی فرە تازەیە؛

چونکە لە ١٧٨٥ بەبەکان بناغەیان بۆی دانا و کردیانە پایەتەختی میرنشینی بابان. شارەکە بە ناوی بوپوک سلێمان پاشا (سلێمان پاشای گەورە)ی والی بەغداد لە ١٧٨٠– ١٨٠٢، کراوە. دوای ئەوەی میرەکانی بابان لە ١٨٥٠، ئیتر دەسەڵاتیان نەما، شێخەکانی بەرزنجە جلەوی دەسەڵاتی ناوچەکەیان بە دەستەوە گرت.

لە ١٩٢٠ـەکان، شێخ مەحموود بەرزنجی سلێمانی کردبووە، پایەتەختی مەملەکەتی کوردستان و لەوێوەڕا چەند شۆڕشێکی سەرنەکەوتووی دژی بەریتانییەکان بەرپا کرد. لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، حکوومەتی هەرێمی کوردستان پارچە بوو؛ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی جەلال تاڵەبانی، بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەتی خۆی لە سلێمانی دامەزراند. لە هەرێمی کوردستان چوار زانکۆ هەیە، یەکێکیان لە سلێمانییە. لە سالانی دەسەلاتی دەوڵەتی دیفاکتۆی هەرێمی کوردستان و لە ئەنجامی ئەو پارەیەی لە بەرنامەی نەوت بە خۆراک وەری دەگرت و پاشانیش لە دوای ئازادکردنی عێراق، سلێمانی بە شێوەیەکی دیار گەشەی کردووە. پارێزگایەکەش هەر بە سلێمانی دەناسرێ و یەکێک لەو سێ پارێزگایانەیە کە تا ٢٠٠٧، حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەڕێوەی دەبردن.

**سمایل ئاغای سمکۆ (١٨٧٥– ١٨٣٠).** دوژمنانی کورد بە کابرایەکی کوردی ئێرانی سەرشێتی خێڵەکیی دەزانن؛ بەڵام کەسانی دیکە بە نموونەی هەڵگری بیری کوردایەتیی دەزانن کە تازە ئاکاری لە کوردستان دروست دەبوو. سمکۆ لە ١٩١٨ـەوەڕا تا ١٩٢٢، لەناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ، لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، دەسەلاتێکی کوردیی ئۆتۆنۆمی دامەزراند. بۆ ئەم مەبەستەش سمایل ئاغای سمکۆ سوپایەکی بە هێزی دامەزراند کە بۆ چەند ساڵێک لە لەشکرەکانی حکوومەتی ئێران بەهێزتر بوو؛ فرە کەڕەت سوپای حکوومەتی بەزاند. بۆ ماوەیەکی کورت سمکۆ هاوپەیمانییەتی لەگەڵ سەید تەهای نەهری لە کوردستانی باکوردا، هەبووو پێوەندیی بە سەرکردەکانی کوردی باشوور و باکوری کوردستانەوە هەبووە.

لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، سمکۆ هەوڵی دا هێزێکی گەورە بۆ خۆی پێک

بێنێ و بۆ ئەم مەبەستەش سنووره دەستکردەکەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بەزاند و ئەمەش هەردوو حکوومەتی هەراسان کرد. بە پێی کات و ڕووداوه هەنووکەییەکانەوە، سمکۆ یارمەتیی لە ڕووسیا و یەکێتیی سۆڤیەت و تورکیا و بەریتانیاو ئێران وەرگرتووه. لە ١٩١٨، سمکۆ هەڵەیەکی گەورەی کرد و، مار شیمۆنی سەرکردەی ئاشووریی کە میوانی بوو کوشت (ئاشوورییەکان لە جەنگی عوسمانییەکان لە ناوچەی هەکاری ڕایان کردبوو و سمکۆ لە ناوچەکانی خۆی حەواندبوونیانییەوە.) لەشکرەکانی ئێران لە شوباتی ١٩٢٠، بۆ ماوەیەکی کاتی سمکۆیان بەزاند و تا دەرەوەی وڵاتیان ڕاونا، بەڵام پاشان لێی بەخشین. سمکۆ یەکسەر هێزێکی گەورەتری دروست کردەوە. لە ١٩٢١ بەهێزترین سوپای خۆی هەبووه و ڕۆژنامەیەکیشی لە سابڵاخ دەرکردووه.

لەگەڵ ئەوەش کە سمکۆ ڕێزێکی تایبەتی لە ناو کورداندا هەبووه، بەڵام هێشتا حکوومەتی ئێران لە ٩ی ئابی ١٩٢٢، تووشی نسکۆیەکی وای کرد کە پاشتر هەرگیز لێی هەڵنەستاوه. پاشتر زۆر کۆششی کرد بتوانێ پلەی جارانی بەدەست بێنێتەوه و لە عێراقەوە چووه تورکیا و خۆی لە سەید تەهای نەهری و شێخ مەحموود بەرزنجی نزیک کردەوە. لە بەهاری ١٩٢٥، سمکۆ گەڕاوه بۆ ئێران و لە جێی عومەر خانی نەیاری، سەرۆکایەتیی بنەماڵەی عەبدۆییەکانی خێڵی شکاکی وەرگرت و دیسان شۆڕشی هەڵگیرساندەوە. بەڵام چونکە نیوەی چەکدارەکانی چوون لای عومەر خانیان گرت و وازیان لە سمکۆ هێنا، بۆیە هێزە تازەکانی ڕەزا خان بە ئاسانی هێزەکانی سمکۆیان بەزاند. ڕەزا خان پاشتر بووه شای ئێران و ناوی ڕەزا شای پەهلەویی لە خۆی نا. لە ١٩٣٠ حکوومەتی ئێران داوێکی بۆ سمکۆی شکاک داناوه و وای لێ کرد بگەڕێتەوه تا دانوستانی لەگەڵدا بکا و ئۆتۆنۆمی بۆ دابین بکا، بەڵام لە ڕێگە بە خیانەت بۆسەیەکیان بۆی داناوه و لە نزیک شارۆچکەی شنۆی کوشتیان.

هەرچەندە هەموو هێز و تواناکانی سمکۆ لە کوڕانی عەشایرەوە هاتبوو، بەڵام لاوازییەکەشی هەر لەوانەوە بوو. سیستمی خێڵەکی هەمیشە سیستەمێکی هەلپەرست بووه؛ بۆیە هەرکە سمکۆ هەڵدەستا خێڵەکان پشتیوانییەکی تەواویان لێی دەکردو هەرکە تووشی هەر نسکۆیەکیش دەهات، هێزە خێڵەکییەکانی دەوروبەری

وەک ئاو دەبوونە هەڵم و بزر دەبوون. سمکۆ نە ئامانجێکی نەتەوەیی بەرزی هەبووە و نە پارتێکی سیاسیشی بەدواوە بووە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیدا پشتیوانیی لێ بکا و ڕێنماییشی بکا. دەڵێن سمکۆ لە ناخیەوەڕا هەر کابرایەکی خێڵەکی بوو، بە چاوێکی نزم سەیری ژیانی شارستانیی کردووە؛ بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ کە ڕۆژنامەیەک دەربکا و بیەوێ ڕۆشنبیری لە ناو گەلەکەیدا بڵاو بێتەوە. حکوومەتەکەی ڕەزا شا بە فێڵ ئەو سەرکردە کوردەی کوشت. ڕەنگە لە دوای قازی محەمەد و دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملوو، سمکۆ ئاغای شکاک لە سەدەی ٢٠ـەم، ناودارترین سەرکردەی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بێ. دەبێ ئەو ڕاستییە مێژووییەش بزانین کە هەرسێک ئەو سەرکردە کوردانە بە دەست و بە گوێرەی پلانەکانی حکوومەتی ئێرانییەوە کوژراون.

**سنجابی.** خێڵێکی کوردی نیشتەجێی ئوستانی کرماشانن و لایەنگری دەوڵەتی فارس بووینە و ڕۆڵێکی گرینگیان لە پاراستنی سنووری دەوڵەتەکە لە بەرانبەر ئیمپراتۆری عوسمانیدا هەبووە. ڕەنگە ئەو هۆزە لەبەرئەوە هێندە ملکەچی دەوڵەتی فارسی بووبێ چونکە لە ناوچەی دەشتاییدا ژیاون و وەک ئەو کوردانەی کە لە نێو شاخەکاندا دەژین هێندە حەشارگەیان نەبووبێ، تا ئەگەر لە میری یاخی بن، پەنایان بۆ ببەن و لەوێ خۆیان حەشار بدەن. ئەو خێڵە لە ١٨٨٠ ئەو ناوەی لێ نرا، ئەویش پاش ئەوەبوو کە بەتالیۆنێکی سەربازییان بۆ گرتنەوەی هەرێمی هەراتی ئەفغانستانی نارد. چەکدارانی ڕەوانی هەرات کران، ڕانکوچۆخەی مەرەزیان دەبەردا بوو کە ڕەنگی لە ڕەنگی مووی سمۆرە بوو، سمۆرەش بە فارسی "سنجاب"ە و ئیتر ناوەکەیان لێ هات. سەرۆکەکانی خێڵی سنجابی شیعەبوون، بەڵام زۆرینەی خێڵەکە سوننە و شیعە و ئەهلی هەقن و بە ئاشنایی لەگەڵ یەکتریدا دەژین.

شیر محەمەد خان تا سەردەمانێکی درەنگ بەرگریی لە دەوڵەت دەکرد و بە فەرمی نازناوی شمشیری مەملەکەتی پێ درا. کوڕی کوڕێکی ئەو شیر محەمەد خانە، کە ناوی دکتۆر کەریم سنجابی بوو، لە ١٩٥٠کان، لە وەزارەتەکەی محەمەد موسەدەق وەزیری پەروەدەی نیشتمانی و پاشان لە ١٩٧٠کان، لە دەستپێکی دامەزراندنی حکوومەتی شۆڕشی ئیسلامیدا، وەزیری کاروباری دەرەوە، بوو. لەم دواییانە خێڵەکە

دووچاری بارێکی ئابووریی ناله‌بار هات، چونکه حکوومه‌ت سیاسه‌تی جێگیرکردنی دژیان په‌یڕه‌و کردووه.

**سنه (سه‌نه‌نده‌ج)**. سه‌یری (کوردستان) بکه.

**سه‌دام حوسێن - صدام حسين (٢٨-٤-١٩٣٧/٣٠-١٢-٢٠٠٦)**. پیاوه ده‌سه‌ڵاتداره‌که‌ی به‌غدا بوو که له ١٦ ته‌ممووزی ١٩٧٩، له دوای ئه‌حمه‌د حه‌سه‌ن به‌کر، پۆستی سه‌رۆکی عێراقی وه‌رگرت. سه‌دام له ئه‌نجامی په‌یڕه‌وکردنی پلانێکی زۆر توندوتیژ دژی هه‌ڤاڵه‌کانی خۆی له ناو حزبی به‌عس و دژی هه‌موو عێراقییان ئه‌م پۆسته‌ی پێ وه‌رگیرا. پاشان هه‌مان پلانه دڵڕه‌قه‌که‌ی له شه‌ڕه‌که‌ی له‌گه‌ڵ ئێران له ١٩٨٠- ١٩٨٨و له ١٩٨٠کان و ١٩٩٠کاندا، دژی کورد به‌کارهێنا.

له سه‌ره‌تادا که دانوستانی به‌یانی ئاداری ١٩٧٠ی له‌گه‌ڵ مه‌لا مسته‌فای بارزانی ئه‌نجام دا، واپێ ده‌چوو که سه‌دام هۆشمه‌ندانه کێشه‌ی کورد چاره‌سه‌ر ده‌کا، که‌چی ئامانجی ڕاسته‌قینه‌ی سه‌دام حوسێنیی ئه‌وه‌بوو پێچکه‌ی کورسیی ده‌سه‌ڵاتی خۆی توند بکا. له‌و پێوه‌ندییه نێو ده‌وڵه‌تییانه‌ش نیگه‌ران بوو که کورد هه‌یانبوو؛ چونکه لای ئه‌و وا پێ ده‌چوو که بنه‌مای یه‌کێتیی خاکی عێراق هه‌ڵده‌ته‌کێنێ. له ١٩٧٥، سه‌دام حوسێن ڕێککه‌وتننامه‌ی جه‌زایری له‌گه‌ڵ ئێراندا مۆر کرد، ئه‌م ڕێککه‌وتننامه‌یه ڕێگه‌ی عێراقی خۆش کرد تا به‌که‌یفی خۆی په‌لاماری کورد بدا. له‌میانی شه‌ڕی ئێران و عێراق له ١٩٨٠کاندا، سه‌دام حوسێن چه‌کی کیمیایی دژی کورد به‌کارهێنا و شاڵاوی ئه‌نفالیشی کرد بۆ ئه‌وه‌ی کورد قڕ بکا، تا به‌م شێوه تۆڵه‌ی ئه‌وه‌یان لێ بکاته‌وه که له شه‌ڕه‌که‌دا کورد پشتیوانیی ئێرانیان کرد.

ئه‌و هه‌موو پێشێلکارییه له ڕاده‌به‌ده‌رانه‌ی سه‌دام حوسێن دژی مافه‌کانی مرۆڤی کورد کردی، وای له زۆربه‌ی کورد کرد، (به‌تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که له ناو عێراقیدا ده‌ژین) تا سه‌دام حوسێن به دژوارترین و بکوژترین دوژمنی کورد بناسن. له سه‌ره‌تای ٢٠٠٣، زۆربه‌ی کورد پشتیوانیی توندی وڵاته یه‌کگرتووه‌کانیان کرد له‌و هه‌ڵمه‌ته‌ی له شه‌ڕی دووه‌می که‌نداو بۆ چه‌ک داماڵین و له‌سه‌ر کورسی لادانی سه‌دام حوسێن کردی.

سەدام حوسێن لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ لە بەغداد دەرکرا و لە ١٣ دیسێمبەری ٢٠٠٣ لە کونی چاڵچۆڵەکەیان دەرهێنا و لە دوای دادگاییکردنێکی دووردرێژ و بەرگریکردنی دەستەیەکی پارێزەری عێراقی و عەرەب و بیانی، بە تاوانی کۆمەڵکوژیی ١٤٨ عەرەبی شیعەی خەڵکی دجێل لە ١٩٨٢دا، لە ٣٠ی دیسێمبەری ٢٠٠٦ لە سێدارە درا. زۆر لە چاودێران توانجیان لە شێوەی دادگاییکردنە ئاشکرایەکەی سەدام دا و نووسییان کە هەرگیز سەدام بە هیچ شێوەیەک ئەو بوارەی بە نەیار و بەرهەڵستکارانی نەدا بۆ ئەوەی ئەوانیش پێش کوشتنیان بەرگری لە خۆیان بکەن.

**سەعید ئاڵچی** (؟– ١٩٧١). نەتەوەپەرستێکی کوردی چالاکی خەڵکی بینگۆلی تورکیا بوو. لە ساڵە نیمچە لیبراڵەکانی ١٩٦٠ـەکاندا کە ڕووناکبیران جووڵەیان هەبوو، ئاڵچی چالاکانە لە مەیدان بوو. لە ١٩٦٦، لە دوای فایق بوجاک، پۆستی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیای وەرگرت، لە ١٩٦٨دا گیرا. لە زیندان دۆستایەتیی لەگەڵ سەعید قرمزتۆپراخ پەیدا کرد. قرمزتۆپراخ کوردێکی چەپڕەوی خەڵکی دەرسیم بوو کە پاشان بە ناوی نهێنیی دکتۆر شڤان ناسرا. کە هەردووکیان چوونە کوردستانی عێراق، هەردووک لەوێ چیتر دیار نەمان. وا پێ دەچێ دکتۆر شڤان، ئەڵچیی لە سێدارە دابێ و مەلا مستەفا بارزانی بە تاوانی کوشتنی ئاڵچی سزای دابێ. هەرچەندە لقەکەی دکتۆر شڤانی بۆ ماوەیەکی کەم بەدەرکەوتەوە و ناوی بووە پارتییا پێشەنگا کارکەرێن کوردستانێ (پ.«پ. ک. ک») بەڵام چالاکییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا نەما.

**سەرخۆبوون.** واتای سەربەخۆیی دەبەخشێ. ئەمە گۆڤارێک بوو، بۆ ماوەی چەند ساڵ، پارتی کرێکارانی کوردستان لە شاری کۆلۆن، لە ئەڵمانیا دەری دەچوواند.

**سەرۆک.** زاراوەی سەرکردەی گەورە دەگەیەنێ. لە ڕۆژانی شۆڕشی ئەیلوول، کورد یەکەم جار ئەم زاراوەیان بۆ ئاماژەکردن بۆ مەلا مستەفا بارزانی بەکار هێنا. پاشان کوردەکانی باکوری کوردستان لە ١٩٩٠ـەکاندا بۆ ناوهێنانی عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان بەکاردێنا.

**سەلاحەدین ئەیوبی** (١١٣٧– ١١٩٣). لە جیهانی ڕۆژئاوادا، سەلاحەدین با

گەورەترین و بەناوبانگترین و میهرەبانترین سوارچاکی کورد دەناسرێ کە لەسەر ئەم خاکەدا ژیابێ. پێش لەوەی خۆی بە کورد بزانێ، سەلاحەدین خۆی بە لای دینەکەی داگرتووە. لە شاری تکریت، لە عێراق لە دایک بووە. سەلاحەدین سەرۆکی بنەماڵەی ئەیوبییەکان بووە و ناودەنگی جەنگاوەرێکی موسڵمانی هەبووە.

لە ١١٧١، دەوڵەتی فاتمیی شیعەی لە میسر ڕووخاند و دەوڵەتی ئەیوبیی موسڵمانی سوننیی دامەزراند و لە میسر و سووریا و عێراقدا حوکمی کرد. لە شەڕی حەتین، لە نێز یکی دەریاچەی تەبەرییە، کە ئێستا دەناو دەوڵەتی ئیسرائیلە، سەلاحەدین لەشکری کریستیانە خاچدارەکانی بەزاندو قودسی پیرۆزی ئازاد کرد.

جگە لەمە سەلاحەدین چەندین مزگەوتی بچووکی لە سەرتاسەری وڵاتدا دروست کردو جۆگە و جۆباری بۆ ئاودێری دامەزراند و هانی ئەدەب و خوێندەواریی دا. لە مەلاتیشدا کەس باری ئەو کەڵەپیاوەی نەدەبرد و تۆزی نەدەشکاند. نەوەکانی سەلاحەدین تا ١٢٤٩ حوکمداری میسربوون و تا ١٢٦٠یش فەرمانداری سووریابوون. جگە لەوان مەلیکەکانی حەسەن کێف، لە باکوری کوردستان، نەوەی ئەیوبییەکان بووینە.

**سەلیم چوروکایە (تیلکی)**. ناتۆرەی (تیلکی) واتا (ڕێوی) یە. لە ئەوروپا جاران سەرکردەی پارتی کرێکارانی کوردستان بووە. لە دوای ئەو تۆمەتانەی خرایە پاڵی کە گۆیا پارەیەکی زۆری لە فرۆشتنی درەگ (کەرەستە بێهۆشکەرەکان) پەیدا کردووە، نێوانی لەگەڵ پارتەکەی تێک چوو، پاشان فەرمانی کوشتنی درا. چوروکایە ڕای کرد و چووە ئەڵمانیا. لەوێ کتێبێکی بەناوی (گۆرانییەکانی ئاپۆ) بڵاو کردەوە. «پ. ک. ک» کتێبەکەی ڕیسوا کرد. چوروکایە لە کتێبەکەیدا عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان بە "بکوژ" و "دیکتاتۆر" ناوزەد دەکا و پێی یێژێ "گەورەترین خیانەتکارە لە شۆڕشی خیانەت لێکراوی کورد." پێشتر ئەیسەل (میدیا)ی ژنی سەلیم، لەناوچەی ئامەد (دیار بەکر) سەرکردەی چەکدارانی «پ. ک. ک» بووە.

**سۆران**. میرنشینی سۆران لە باشووری کوردستان دامەزرا و لە سەرەتادا هەرەسی هێنا تا پاشان لە دەستپێکی سەدەی ١٩مین بۆ ماوەیەکی کورت بووژایەوە.

چونکە میر محەمەد پاشای ڕەواندز، چاوێکی لەدەست دا بوو بۆیە بە پاشای کۆر دەناسرا. پاشای کۆرە لە ١٨١٤ڕا دەستی پێ کرد زۆربەی هەرێمی کوردستانی عێراقی ئێستای ئازاد کرد و تا ١٨٣٤ میرنشینەکەی سۆران هەر مابوو. عوسمانی و فارس و بەریتانیا و ڕووسیا لە دژی دەسەڵاتی میرنشینی سۆران پیلانیان گێڕا. لە کۆتاییدا میر محەمەدی کۆر، بانگێشتی ئەستەمبوڵ کرا و لە چەند لاوە ڕێزی لێ گیرا، بەڵام بە شێوەیەک کە نەزانداروە چۆن بوو، لە ڕێی هاتنەوەی بۆ کوردستان، شوێن بزر کرا. ڕەسوڵی برای لە جێی ئەو پۆستی فەرمانداریی ڕواندزی وەرگرت تا لە ١٨٤٧ والیی بەغداد لە پۆستەکەی لای دا.

**سۆرانی.** یەک لە دوو دایەلەکتە هەرە گرینگەکانی زمانی کوردییە. نزیکەی ٦ ملیۆن کورد لە باشووری کوردستانی عێراق و لە ئێران شێوەزاری سۆرانی لە قسەکردنیاندا بەکار دێنن؛ کەچی ١٥ ملیۆن کورد لە باکوری کوردستان (تورکیا) و باکوری ڕۆژئاوای باشووری کوردستان (عێراق) بە شێوەزمانی کرمانجی دەئاخێڤن. هەردووکیان سەر بە گرووپە زمانەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێرانەوەن. دەڵێن هەردوو زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی لە چەند لە لایەنی ڕێزمانەوە لە یەکتری جیاوازن، ڕێزمانی ئەم هەردوو دیالەکتانەش هێندە لەیەکدی جودانە. جیاوازیی وشەسازی وەک ئەوەیە کە لە نێوان زمانی ئەڵمانی و هۆڵەندییەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، تەگەرەیەکی گەورە نییە بۆ ئەوەی سۆرانی و بادینی لە یەکتری تێ بگەن.

دایالەکتە لاوەکییەکانی سۆرانی ئەمانەن: موکری؛ ئەردەلانی؛ گەرمیانی؛ خۆشناو؛ پشدەر؛ وەرماوە؛ کرمەشانی؛ هەولێری کە پێی دەڵێن شێوەی ستانداردی سۆرانی. هەبوونی ئەو دوو دایالەکتە تا ڕادەیەک جیاوازی سیاسی لە نێوان کوردان پەیدا کردووە. تەنانەت کاتێک کە پۆلیتبیرۆی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی یاخیبوون، دوژمنانی کورد بانگێشتەی ئەوەیان دەکرد کە باڵە یاخییەکەی ئیبراهیم ئەحمەدی باڵی سۆرانییە ڕۆشبنیرەکانە و ئەوانەش دڵسۆزی شۆڕش و سەرۆکایەتی بارزانی مانەوە، کرمانجی خێڵەکی و دواکەوتوون. گومان لەوەدا نییە کە ئەم هەڵسەنگاندنە تاوانێکی گەورەو گێلاتییەکی لە ڕادەبەدەر ساکار و دژی بەرژەوەندی گەلی کورد بوو.

ڕەنگە زازا (دیمیلی) کە لە ئەوپەڕ باکوری خۆرئاوای کوردستان بەکار دێت و گۆران کە لە ئەوپەڕ باشووری خۆرەڵاتی کوردستان بەکار دێ، دوو دیالەکتی سەرەکیی زمانی کۆنی کوردی بووبن و لە سەرەتای سەدەی ١٨دا، کرمانجی و سۆرانی شوێنیان لێ گرتبنەوە.

**سۆفی.** زاراوەی سۆفی لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبییە و واتای خوری یان هوری دەگەیەنێ و بەم مانا زمانەوانییەشی سۆفی کەسێکی خوری ئاسایە، یان دنیا نەویستەو بە کەم شتێک سوپاسگوزارە. خوریش کەرستەییەکە بۆ خۆ داپۆشین و گەرمبوونەوەش مرۆڤ دەیپۆشێ. "سۆفی" یان (دەروێش) دوو زاراوەنە کە بە ئیسلامەوە نووساون و لەگەڵ مێژووی ئیسلامدا پەیدا بووینە و موریدی شێخێکی تەریقەتن و جەخت لەسەر بوونی خودا دەکەنەوە پتر لەوەی بایەخ بە چۆنیەتی زاتی ئیلاهی بدەن. سۆفیاتی لە هەردوو سەدەی ١٢م و ١٣م پەیدا بووو تا ڕادەیەک بە خەڵوەتگری و ڕەبەنکاری چەرخی ناوەڕاستی ئاینی فەلەکان دەچوو.

لە کوردستان تەنیا دوو ڕێبازی سۆفیاتی هەیە؛ ئەوانیش تەریقەتی نەقشبەندی و تەریقەتی قادرینە. سۆفی بەو کەسانە دەڵێن کە موریدی تەریقەتی نەقشبەندینە و دەروێشیش موریدەکانی تەریقەتی قادرینە. نەقشبەندییەکان گاڵتەیان بە زاراوەی (دەروێش) دێ و بە کۆنەپەرستی و خەیاڵبازی و حاڵگرتن و ئاگر خواردن و شێواندنی ڕاستیی دەناسن.

ڕێبازی سۆفیاتی لە لایەکەوە کۆمەڵگەی کوردەواری بەهێز کردووە و لە لایەکی تریشەوە دووبەرەکیی تێدا پەیدا کردووە. ئەوانەی باوەڕیان بە ڕێبازەکە هەیە، بە شێوەیەکی پوختە پەیڕەوی دەکەن و لە یەکتری نزیک دەبنەوە و گوێ بە هۆز و تیرە و بنەماڵەکانیان نادەن؛ ڕێبازەکەیان خزمایەتی لە کن گەورەترە. بەڵام کە دێتە سەر فرەجۆریی تەریقەتەکان، ئەمە کۆمەڵی کوردەواری لێک دەترازێنێ و وەک پارتێکی سیاسی کار لە لایەنگرانی دەکا. بە هۆی دوو ڕێبازی جیاوازی تەریقەتی نەقشبەندی، لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩دا، ناکۆکی لە نێوان سەیدەکانی نەهری و شێخەکانی بارزان پەیدا بوو.

لە دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥، مستەفا کەمال ئەتاتورک ڕێبازی

سۆفیاتیی قەدەغە کرد؛ چونکە شێخ سەعید، شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بوو. بەڵام چونکە سۆفییەکان بە هۆی ڕێبازەکە ناسران و فێری کردن چۆن خۆیان لە گۆڕانکاریی دنیا ڕابێنن، بۆیە ڕێبازەکە بە نهێنی هەر هەناسەی دا و لە ناو نەچوو. کە لە ۱۹۵۰کان پارتی دیموکرات لە تورکیا حوکمی وەرگرت، ڕێگەی ژیانەوەی لە پێش گەلێک لەو ڕێبازە جودایانە خۆش کرد و تارادەیەک سۆفیاتی لە تورکیا گەشەی کردەوە؛ کەچی سۆفیاتی لە ئێران و عێراق و سووریادا هەر ڕوو لە کزی بووە.

**سۆین (ئیلی بانستەر سۆین) (۱۸۸۱– ۱۹۲۳).** لە بواری سیاسیدا نووسەرێک بووە کە تەقەی زۆری لەسەر کراوە. سۆین گەڕیدەیی کردووە و لە ۱۹۱۹وە تا ۱۹۲۱، لە باشووری کوردستان، ئەفسەری سیاسیی بەریتانی بووە. هەرچەندە شێخ مەحموودی بە کابرایەکی فێڵباز ناسیوە، بەڵام زۆر پشتیوانیی سەربەخۆیی کوردی کردووە و هەر بە هۆی ئەو هەڵوەستەشیەوە بوو پۆستەکەی لەدەست دا.

لە ئاداری ۱۹۱۹، سۆین جێی مێجەر نۆیلی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە سلێمانی گرتەوە. نۆیل پشتیوانیی شێخ مەحموودی دەکرد. دوای ئەوەی شێخ بۆ یەکەم جار لە بەرانبەری بەریتانییەکان تووشی شکستی بوو، سۆین بە توندی ناوچەکەی بەڕێوە برد و چەند ڕۆژەیەکی گشتیی دەست پێ کرد و هانی بەکارهێنانی نووسینی بە زمانی کوردی لە ڕۆژنامە و قوتابخانەکان دا. کە کۆنفرانسەکەی قاهیرە، لە ئاداری ۱۹۲۱، بڕیاری دا واز لە بیرۆکەی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی بێنێ و تا بگونجێ بەریتانیا کۆنترۆڵی کوردستان بکا، بە کورتی بڕیاری دەرکردنی سۆین لەوێوە درا.

سۆین کتێبی "بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان بە نهێنی" لە ۱۹۱۲و "کورتە کۆکراوەیەکی هۆزانی گۆران"یشی لە ۱۹۲۱، داناوە. لە دوای مردنی بێوەژنەکەی سۆین، خانمی لاینێت لیندفیلد–سۆین، لە ۱۹۹٤، هیوای سۆین بۆ کوردستانSoane Trust for kurdistan دامەزرا؛ بۆ ئەوەی ئەو پرۆژانە ئەنجام بدا کە پێوەندییان بە کوردستانەوە هەیە. نووسەری ئینگلیزی– نیوزیلاندی و دۆستی کورد و خانمی شێری لایزەر. سەرۆکی ئێستای متمانەکەیە.

**سووریا**. یەک لەو چوار وڵاتەی ڕۆژهەڵاتی ناڤینە کە بەشێکی کوردستانی مێژوویییان داگیر کردووە. پتر لە ملیۆنێک کورد لە سووریادا دەژین. زۆربەی باپیرانی ئەو کوردانە لە دوای هەرەسهێنانی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥، لە ترسی سەرکوتکاریی تورکەکان، وڵاتی خۆیان بەجێ هێشت و لە سنووری تورکیاوە دەربازبوون و هاواریان بۆ سووریا هێنا. حکوومەتی سووریا تا ئێستاش ڕەگەزنامەی سوورییان پێ نادا و ئەوانەی کە پێشتریش وەریانگرتبوو، لە سەردەمی سەرۆک حافز ئەسد لێیان سەندرایەوە و بەمجۆرە تا ساڵی ٢٠٠٧یش، لە زۆربەی مافە سەرەتاییەکانیان بێبەش کراون. لە لایەکی تریشەوە؛ چونکە هەموو ڕەگەزنامەیان نییە، بۆیە ئەستەمە بزاندرێ ژمارەی ڕاستییان چەندە.

هەرچەندە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە تورکیا ئێران و عێراقیش لە ژمارەی کوردەکانی سووریا پترە، بەڵام هێشتا کوردەکانی سووریا ڕێژەی ٩ لە سەدی سەرجەم ژمارەی دانیشتووانی ئەم وڵاتە پێک دێنن و پڕترین ڕێژەی کەمینە نەتەوەییەکانی سوریا پێک دێنن. لە سێ ناوچەی باکوری سووریادا دەژین کە بە یەکتریدا نەنووساون: کوردەکان لە ناوچەکانی کورد داغو کۆبانی لە پارێزگای حەلەب و بەشی باکوری پارێزگای حەسەکەدا کۆبوونەتەوە. ناوچەی حەسەکە بەشێکە لە جزیرە و بە هەردوو هەرێمی باکور و باشووری کوردستانەوە لکاوە. فرەنسییەکان ئەو ناوچەیەیان بە دندووکی مراوی Bec de canard ناو دەبرد. قامشلوو، گەرەترین شاری ئەو ناوچەیەیە و لەوبەری سنووری تورکیا لە بەرانبەر شاری نسێبینە.

حزبی بەعسی سەرکوتکار لە ١٩٧٠دا لە سووریا هاتە سەر حوکم. تا ٢٠٠٠، سەرۆک حافز ئەسد حوکمی کرد و کە ئەویش مرد، بەشار ئەسدی کوڕی، حوکمی وڵاتی زەوت کرد. سووریا لەگەڵ تورکیاو ئێران و عێراقیش زۆر بە توندی دژایەتیی دامەزراندنی هەر دەوڵەتێکی کوردی دەکا؛ چونکە ئەو دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیە هەڕەشە لە یەکێتیی ئێستای خاکی سووریا دەکا. هەرچەندە ئەو چوار وڵاتە لە گەڵێ لایەنەوە هەرگیز کۆک نەبووینە، بەڵام هەمیشە بۆ ڕێگەگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ، موویان بە بەینەوە ناچێ و هەمیشە وێکڕا بۆ

پووچەڵکردنەوەی هەر پرۆژەیەکی لەم چەشنە یەکریز ڕاوەستاون.

لەگەڵ ئەمەشدا، سووریاش وەک ئێران و تورکیا و عێراق، هەرگیز لە سوود وەرگرتن لە کورد بۆ هەراسانکردنی وڵاتەکانی دیکە درێغی نەکردووە و بە تایبەتیش لە کورد بەگژوەنانی تورکیا نەسڵەمیتەوە و بۆ ماوەی چەندین ساڵ سووریا و پارتی کرێکارانی کوردستان، سیاسەتێکی هاوپەیمانێتییان دژی تورکیا هەبوو. لە ۱۹۷۹، سووریا بۆ ماوەی ۱۹ ساڵ، تا ئۆکتۆبەری ۱۹۹۸، ڕێگەی بە عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی «پ. ک. ک» دا تا کەمپێکی سەربازی لە ناو خاکی سووریا و لەو ناوچە لبنانییانەی سووریا کۆنترۆڵی دەکرد، بەڕێوە ببا. کەمپی مەزلوم قورمز لە دەشتی بیقاعی لبنانی لە هەموو ئەو کەمپانە ناودارتر بوو. لە ناو خاکی سووریاشەوەڕا، گەریلاکانی «پ. ک. ک» دزەیان بۆ ناو خاکی کوردستانی باکوری ژێر دەستی تورکان دەکرد و دەستیان دەوەشاند و پاشان دەهاتنەوە نێو کەمپەکانی سووریا و لەوێ بە شێنەیی و بێترس دەژیان و خۆیان بۆ هێرشی دیکە ساز دەدا.

سووریا چەند بیانوویەکی بۆ داڵدەدانی «پ. ک. ک» بە دەستەوە بوو. ڕەنگە لە هەموو ئەو بیانووانە گرینگتر، کێشەی ئاوی نێوانیان بووبێ. چونکە تورکیا دەستی بەسەر سەرچاوەکانی ڕووباری فوراتەوە گرتبوو نەیدەهێشت بۆ ناو سووریا بێ. کە تورکیا دەستی بە پرۆژەی گاپ کرد، خەریکبوو ئاوی ڕووبارەکان چک بکا. بۆیە سووریا «پ. ک. ک»ی وەک ئامێرێکی تێکەولێکە پێکردن بەکار هێنا، بۆ ئەوەی بتوانێ ساڵانە برێکی پتر ئاوی فورات بۆ خۆی مسۆگەر بکا، بەڵام لە هەوڵەکەیدا سەرنەکەوت. لەلایەکی تریشەوە سووریا هێشتا داخی ئەوەی لە دڵدا مابوو کە تورکیا لە ۱۹۳۹ هەرێمی هاتای "ئەسکەندەرۆن"ی ئاخنییە نێو خاکی خۆیەوە و ئەمەش هۆیەک بوو وای لە سووریا کرد کە پشتگیریی «پ. ک. ک» بکا. هەندێک دەڵێن «پ. ک. ک» بۆ بەرژەوەندی خۆی، دەرخوونەی لەسەر کوردەکانی سووریا داخستبووو نەیدەهێشت بەرانبەر بە حکوومەت جووڵە بکەن. چەند ساڵ بوو سووریاو تورکیا دەمەتەقێی کەڕانیان لە نێواندا بوو و هیچیان نەیدەویست بارودۆخەکە بگۆڕێ. بەڵام هەرکە سووریا پشتیوانیی یەکێتیی سۆڤیەتی لە دەست دا، چونکە دەوڵەتەکە لە ۱۹۹۰دا ڕووخا و تورکیاش ستراتیژییەتی لێک تێگەیشتنی

لەگەڵ ئیسرائیل مۆر کرد، تورکیا لە ناوچەکە باڵا دەست بوو و توانیی لە ئۆکتۆبەری ۱۹۹۸، سوریا ناچار بکا کە ئۆجەلان لە خاکی خۆی وەدەرنێ. ئەوە بوو ئۆجەلان هێندەی لەگەڵ حکوومەتی هەرێمی کوردستان نەچاندبوو کە لە کاتی پێویستدا بیدرووێتەوە و کە لە سووریا دەرکرا بێ لە پەنای بەڕێوەبەرایەتیی کوردیدا خۆی بشارێتەوە؛ لە ئەنجامدا بە هاوکاریی چەند دامەزراوێکی سیخوڕیی جیهانی، تورکیا توانی لە شوباتی ۱۹۹۹، لە کینیا ئۆجەلان دەستگیر بکا، بیهێنێتەوە زیندانی بکا و پاشان سزای ژینزیندانی پێ دا.

سووریا بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆریش یارمەتیی لۆجستیی پێشکێشی هەردوو پارتە سیاسییە کوردییەکەی کوردستانی باشوور، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش کرد؛ چونکە دەیویست تۆڵە لە ڕژێمی حوکمی بەعسی بەغداد بکاتەوە و بەگژ یەکتریشیانەوە، بنێ بۆ ئەوەی لاوازیان بکا و نەهێڵێ حکوومەتێکی سەربەخۆ پێک بێنن.

**سوسورلوک.** لە ۳ی نۆڤێمبەری ۱۹۹٦، لە سوسورلوک لە کوردستانی باکور، کارەساتێکی لێکدانی دوو ئۆتۆمۆبیل ڕووی دا. لەو ڕووداوەدا لە ناو یەکێک لەو دوو ئۆتۆمۆبیلەدا، تیرۆریستێکی ڕاستڕەوی ناسراو کوژرا. تیرۆریستە کوژراوەکە بە درەگ (حەشیشە) فرۆشی و بە هەڵهاتنی لە دەستی عەدالەت تاوانبار بوو. لەگەڵ تیرۆریستەکە سیداد بوجاکی سەرۆک جاش لە ناو هەمان ئۆتۆمۆبیل دابووو بە سەختی بریندار بوو. سیداد بوجاک، سەرۆکی پاسەوانانی گوندی و ئەندامی پەرلەمانی تورکیش بوو. ئەو ڕووداوە بووە بەڵگەیەکی زیندوو و سەلماندی کە گەورەترین دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی تورک، دەستیان لە کردە تاوانی ڕێکخراو Organized Crimeدا هەبووە.

سوسورلوک گومانی ئەوەشی لە دەوڵەتی تورکیا پەیدا کرد کە ڕەنگە بە خۆی ڕێکخراوێکی نایاسایی دامەزراندبێ و لە ڕێی ئەو ڕێکخراوە نایاساییەوەڕا چەند هەزار کوردێکی سیڤیلی، بە گومانی ئەوەی کە ڕەنگە لایەنگری پارتی کرێکارانی کوردستان بووبن، تیرۆر کردبێ. ئەو جەردانە ئیشیان بۆ دەوڵەتی تورک دەکرد و لەبری ئەو خزمەتانەش کە پێشکێشیان دەکرد؛ تورک ڕێی پی دەدان دڕەگ دەرباز

بکەن و بیفرۆشن و بەرهەڵستکارانی دەوڵەت تیرۆر بکەن و کردەوەی ناقانوونی فرەچەشنیش ئەنجام بدەن و لێشیانی نەدەپێچانەوە. هەرچەندە ڕووداوەکەی سوسورلوک تا ئەوپەڕ ئاشکراو لە بەرچاوی ڕای گشتیدا بوو، بەڵام هێشتا بە ڕاڕایی و مێچکە مێچکە ئینجا سووکترین سزا دژی ئەو کەسانە دەرچوو کە کارەساتەکەیان ئەنجام دا.

**سوورچی.** خێڵێکی گرینگە لە باشووری کوردستان، نیشتەجێیە و سنووری گوندەکانیان لەگەڵ سنووری بارزان لەسەر یەکن و گەلێ جار ناکۆکی لە نێوانیاندا پەیدا بووە. لە ساڵانی شۆڕشی ئەیلوول کە مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکایەتیی دەکرد، سورچییەکان جاش بوون و پشتیوانی حکوومەتی عەبدولکەریم قاسمیان دەکرد. بەڵام لەمیانی ڕاپەڕینی ۱۹۹۱، خێڵی سوورچی کە عومەر ئاغای سوورچی سەرۆکی بوو، هاتە ڕیزی کوردە شۆرشڤانەکان و لە ڕاپەڕینی گەلی کورددا بەشداریی کرد.

عومەر سوورچی یەکێک لەو سەرکردە خێڵەکییانە بوو کە پارتی پارێزگارانی کوردستانیان لە ئەیلوولی ۱۹۹۱دا، دامەزراند. لە ١٦ی حوزەڕانی ۱۹۹٦، لە ئەنجامی شەڕێک لە نێوان ئەو سوورچییانەی لایەنگری پارتی دیموکراتی کوردستان، کە مەسعوود بارزانی سەرۆکی بوو، لەگەڵ ئەوانەی لایەنگری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، حوسێن ئاغای سوورچی کوژرا. لە ناو سوورچییاندا، حوسێن ئاغا جوامێرێکی خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتی بوو. کوژرانی حوسێن ئاغا، نیگەرانییەکی زۆری لە نێو کورد پەیدا کرد و درزی نێوان خێڵەکانی بەرینتر کرد. سەرۆکی کوردستان مەسعوود بارزانی لە ۲۰۰٦دا توانیی دڵی بنەماڵەی حوسێن ئاغای سوورچی بداتەوە و ئاشتیان بکاتەوە و لە بارەگای خۆی پێشوازیی لە کوڕەکانی حوسێن ئاغای سوورچی کرد و لەگەڵ عومەر سوورچی، سەرۆکی پارتی پارێزگارانی کوردستانیش ئاشت بووەوە.

**سیاحەتنامە.** سەیری "ئەولیا چەلەبی" بکە.

**سێر پێرسی کۆکس ( ١٨٦٤– ١٩٣٧ ).** لە ساڵانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، پێرسی کۆکس یەکێک لەو گەورە کارمەندانەی بەریتانیا بوو کە لە کوردستانی

عێراق فەرمانیان دەگێڕا. لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٠ جێی ئارنۆڵد ویڵسنی گرتەوە. کۆکس سەرکەوتووانە کاری بۆ ئەوە کرد کە کوردستانی پڕ نەوت و دەوڵەمەند لەگەڵ ئەو دەوڵەتی عێراقدا ببەستێتەوە کە بەریتانیا خەریک بوو تازە پێکییەوەدەنا.

**سێسیڵ جۆون ئێدمۆندز ( ١٨٨٩- ١٩٧٩).** کارمەندی سیاسیی بەریتانی بوو لە عێراق و لە بواری کوردستان ناسی و زمانی کوردیش پسپۆڕ بوو. ئێدمۆندز لە ١٩١٢ پێوەندی بە کاروباری دەرەکیی بەریتانیای مەزنەوە کرد و لە ١٩٥٠، بە پلەی وەزیر خانەنشین بوو. لەمیانی کاری سەربازیدا، ڕیزی لێ نرا؛ چونکە سێ جار ڕەوانی مەیدانی شەڕێ کرابوو. یەکێک بوو لە ناو ئەو چەند کارمەندە سیاسییە بەریتانییانەی کە لە ١٩٢٠، ڕەوانی باکوری عێراق کرا و هەر لە ١٩٢٢ تا ١٩٤٥، لە بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی عێراق کاری کرد. لەو کارەیدا، ئیدمۆندز زانیارییەکی چاکی دەربارەی کوردستان پەیدا کرد و یەکێک لە باشترین ئەو لێکۆڵینەوانەی نووسییەوە کە لە ئینگلیزیدا هەیە: "کورد و تورک و عەرەب؛ گەڕان و توێژینەوە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراق، (١٩١٩- ١٩٢٥) (١٩٥٧). لە ١٩٥١، بووە مامۆستای زمانی کوردی لە زانکۆی لەندەن و لەگەڵ تەوفیق وەهبیش وێکڕا فەرهەنگی کوردی- ئینگلیزییان کۆکردەوە و ڕێکیان خست.

## ش

**شافیعی.** سەیری (حەنەفی) بکە.

**شڤان پەروەر (١٩٥٥ –      ).** گۆرانیبێژێکە لە کوردستانی باکور هاتووەتە دنیاوە و لە ١٩٧٦ـەوەڕا لە بانشگەدا دەژی. گۆرانییە نیشتمانییەکانی کاریگەرییەکی تایبەتیان لە هاندانی جەماوەردا هەبووە و چونکە لە سرووودەکانیدا هانی یەکبوونی گەلی کورد و گەشەکردنی هەستی کوردایەتیی داوە، بۆیە هەموو کوردی جیهان ڕیزێکی تایبەتی لێ دەگرن. سرووودی هەڵەبجە، کە بۆ ٥,٠٠٠ قوربانییەکەی کیمیابارانی هەڵەبجە دەیخوێنێ، ئاگر لە هەستی بیستەرانی هەڵدەگیرسێنێ. جگە لەمە شڤان پەروەر گەلێک لاوک و گۆرانیی فۆلکلۆری کوردیی زیندوو کردووەتەوە.

**شرناخ.** شارێکی بچووکی کوردستانی باکورە ٢٥,٠٠٠ هاووڵاتیی کوردی تێدا دەژین. بە بیانووی ئەوەی کە گەریلاکانی «پ. ک. ک» لەو شارە خۆیان حەشار داوە، سوپای تورک لە ١٨ی ئابی ١٩٩٢، شارۆچکەکەی خاپوور کرد و بە پێی ڕاپۆرتە فەرمییەکان، لەمیانی پرۆسەی کاولکردنی شارۆچکەکەدا ٣٤ کەسی کوشت، بەڵام بێگومان لە ماوەی ٣٠ ڕۆژی پاش تێکدانی شرناخ، لانیکەم ٥٠٠ کەسێکی دیکەش گیانی خۆیان لە دەست دا. شرناخ بووە هێمای دڵڕەقی و بێبەزەیی و توندی سوپای تورک و وەک ئارمی مۆرێکی بێدادی بە نێوچەوانی دەسەڵاتدارانی تورکەوە نووساوە. سوپای تورک پتر هێرشی هاوشێوەی ئەمەی دژی شارەکانی کوردی ئەنجام داوە؛ جوکورجا (جقورجە) و دەرگەجیت و یۆکسەکۆڤا و لیجە، ئەو شارە کوردییانەن کە بە هەمان شێوە تورکەکان تێکیان دان.

**شکاک.** کۆنفیدراسیۆنێکی هۆزەکانی کورد بوو، لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩ـەم، لە هەردوو دیوی سنووری نێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و فارسی لە دەوروبەری دەریاچەی ورمێ، فرەهێزی پەیدا کرد. شکاک موسڵمانی سوننەنە و بە دیالەکتی کرمانجی دەئاخێڤن. خێڵی شکاک لەوەوە ناوبانگیان دەرکرد کە پەلاماری کورد و

کریستیانە ڕاپاتەکانیان دا و لاملییان کرد و باجیان نەدا. لە دەقی هەندێ لە لاوک و ئەدەبییاتی کوردیدا، شکاک لەگەڵ شاکاکی لێک نەکراونەتەوە؛ (شاکاکی، خێڵێکی عەلەویی بەڕەچەڵەک کوردە بەڵام ئێستا ئەندامانی بە زمانی تورکی قسە دەکەن،)و لە ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتی تەورێزدا نیشتەجێنە و لە سەرەتای سەدەی ٢٠ـەمیشدا چوار بەتالیۆن سەربازیان بۆ سوپای شای قاجارەکان ئامادە کرد. پێشدەچی کە پێوەندیی نێوان شکاک و شاکاکەکان لەوە پتر بێ کە تەنیا ناوەکانیان لێک دەچێ.

کە شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە ١٨٨٠، ولاتی فارسی داگیر کرد، خێڵی شکاک بەرهەڵستی شێخی نەهریی کرد. لە ١٨٩٦، کاتێک کە شۆڕشگێرەکانی ئەرمەنی لە چنگی ئیپراتۆیەتی عوسمانی ڕایان دەکرد و لە ناوچەی ڤان دەکشانەوە، شکاکەکان بۆسەیان بۆ دانانەوە و ٨٠٠ کەسیان دەبۆسەدا گرتن. دووساڵیش پاش ئەم ڕووداوە، هێشتا لە بری فارسەکان ڕاوەدووی ئەرمەنییەکانیان دەنا. پیاوانی خێڵی شکاک، شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی دووەم؛ براگەورەی مەلا مستەفا بارزانییان دەستگیر کردو تەسلیمی دەستی عوسمانییەکانیان کرد، ئەوانیش لە ١٩١٤دا ئیعدامیان کرد. شێخ عەبدولسەلام بارزانی بە گومانی هاریکاریکردنی ڕووسییەکان تاوانبار کرابوو.

سمایل ئاغای سمکۆ، لە ١٩٢٠ـەکاندا گەورە شۆڕشگێڕی ناسراوی کوردی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو. سمکۆ سەرۆکی تیرەی عەبدۆییەکانی خێڵی شکاک بوو. لە ڕۆژانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، خێڵی شکاک وەک هەلپەرست هەڵسوکەوتیان کرد و خێرا پشتیان لە کێشەکە کرد و وازیان لە کۆماری کوردستان هێنا. لە ١٩٧٩ش دوای شۆڕشی ئیسلامی، کاتێک کە دەسەڵاتی ناوەندی لە ئێران بۆ ماوەیەکی کورت لە ناوچەکەدا نەمابوو، هەمان هەلپەرستیی جارانیان دووبارە کردەوە. بە هەر هەمان شێوە، لە ١٩٤٥، ئۆفیسی حزبی تودەی ئێرانی لە ورمێ، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، توانی بۆ ماوەیەکی کورت هەزاران کەسی شکاک لە ڕیزەکانی حزبەکە ڕێک بخاو پاشان وازیان لێ هێنا.

**شەبەک.** شەبەک چینە کوردێکن لە چەند گوندێکی نزیکی شاری مووسڵ دەژین و

ڕێباز ئاینییەکەیان وەک ئەو ڕێبازەیە کە عەلەوییە قزڵباشەکانی باکوری کوردستان پەیڕەوی دەکەن. شەبەک خۆیان بە کورد دەزانن. ڕژێمی سەدام حوسێنی هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی شەبەک بکاتە عەرەب. لەمیانی شالاوەکانی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨و لە دوای شەڕی ئێران-عێراق، ڕژێمی بەغداد نزیکەی ٢٠ گوندی شەبەکانی خاپوور کرد.

زۆربەی شەبەکەکان فرە زمان دەزانن. هەرچەندە زمانی دایکیان دیالەکتی کوردیی گۆرانە، بەڵام هێشتا ویردە ئاینییەکانیان بە تورکی دەخوێنن. شەبەک عەشرەتیان نییە و خێڵەکی نینە و زەویوزاری خۆیان نییە، بەڵکو ڕەنجبەری ئەو خودان زەوییانەن کە لە شاردا دەژین و پێیان دەگوترێ (سەید). چونکە دەڵێن ئەو سەیدانە نەوەی پێغەمبەرن، بۆیە دەسەڵاتێکی ڕوحیی زۆریان بە سەر شەبەکەوە هەیە. شەبەکەکان ناوی خودا (ئەڵلا) و (محەمەد)و (عەلی) دێنن و بەم جۆرە تایبەتمەندییەکی خواوەندانەی پیرۆز بە عەلی دەدەن. لە یەک لە ویردەکانیان ئاماژە بۆ حاجی بەگداش و سەفەوییەکان دەکەن؛ چونکە ئەوان ڕێبازی ئەمانەیان داهێناوە. دەڵێن هەندێ لەو سرووتە ئاینییانەی لە کۆبوونەوەکانیاندا دەیانخوێننەوە، کاتی خۆی شا ئیسماعیلی سەفەوی و پیر سوڵتان عەبدالی شێخی ئەنادۆڵ، دایاناون.

کتێبە پیرۆزەکەیان ناوی (کێتابی مەناقێب)ەو بە (بیوروک)یش دەناسرێ. ئەم کتێبە لە دوو بەش پێک هاتووە؛ بەشی دووەمی وەک ئەو کتێبەیە کە کوردە عەلەوییەکانی باکوری کوردستان بەکاری دێنن. هەر تاکە کەسێکی شەبەکی ئادەڵت adult پیرێکی خۆی هەیە کە ڕێنمایی ڕوحیی دەکا. پیر، لە ماڵی خۆیدا، سەرۆکایەتی کۆبوونەوە ئاینییەکان دەکا. شەبەک ساڵانە سێ بۆنەی شەوێنییان هەیە کە هەردوو ڕەگەز، وێکڕا پشکداری تێدا دەکەن. لە ئەدەبی کۆنی شەبەکدا باسی (لەیلە تولکەشف) دەکا کە لەو شەوانەدا ئەوانەی کە کۆدەبنەوە ڕیسواکاریی سێکسیی تێدا ئەنجام دەدەن. جگە لەمانە، شەبەک چەند گلکۆیەکی پیرۆزیان هەیە کە سەردانیان دەکەن بۆ ئەوەی لەوێ بە مرازەکانیان بگەن.

پێوەندی شەبەک لەگەڵ ئەو عەلەوی و سەفەوییانەی پەیڕەو ڕێبازی ئەهلی هەق دەکەن، لەو ڕێبازە هەرتەقییانەی وەک ئاینی ئێزیدی و ڕێبازی سارەلوو، جودایان

دەكاتەوە كە لە ناوچەكەیاندا هەنە. باجەلانیش لە نزیكی شەبەكەكاندا دەژین گەلێ جاران دەڵێن باجەلانیش هەر شەبەكن، بەڵام جیاوازیی ئەوەیان لە نێواندا هەیە كە شەبەك سەر بەهیچ خێڵ و عەشیرەتێك نینە و باجەلان خۆدان خێڵ و هۆز و تیرەی خۆیانن. چونكە كاكەیی و شەبەك و توركمانە شیعەكان بە ئازادی لە نێوان خۆیاندا بە ژن تێكەڵی یەكتری بووینە، بۆیە ناكرێ بە ئاسانی ڕێبازە ئاینییەكانیشیان لە یەكتری جودا بكەینەوە. سەیری "غوللات" بكە.

**شەددادییەكان.** بنەماڵەیەكی كورد بووە لە ساڵانی نێوان ٩٥١ تا ١٠٧٤، كە دەسەڵاتی خەلیفەكانی عەبباسی لاواز بووە، ئەوان ناوچەی نێوان كوور و ڕووباری ئاراسیان حوكم كردووە. شەددادییەكان لە دوو لاوە حوكمیان كردووە، لایەنە سەرەكییەكەیان لە گەنجە و دوین فەرمانڕەوا بووە و لایەنە بچووكەكەشیان لە ئانی حوكمدار بووە. ئەم لایەنە بچووكەیان چەند ساڵ لە دوای نەمانی بەشە گەورەكەیان دەسەڵاتیان هەر مابووە.

شەددادییەكان ناوی دەیلەمی وەك لەشكری و مەرزوبان و ناوی ئەرمەنیی وەك ئاشووتیان لە منداڵەكانیان ناوە، بۆیە هەندێ مێژوونووس گومان لە بە كوردبوونی شەددادییەكاندا دەكەن. ئەو جیاوازییە لە سەرجەم ناوچەكانی باكوری وڵاتی فارس و كوردستاندا باو بووە. سەرچاوە كریستیانە هاوچەرخەكان باسی ئەوە دەكەن كە شەددادییەكان هەندێ پاشماوەی دیانە گریگۆرییەكانیان لە پاش بە جێ ماوە. توركەكان دەوڵەتی شەدداوییان لەناو برد.

**شەرەفخانی بتلیسی. (١٥٤٣- ١٦٠٣).** دانەرە كوردەكەی شەرفنامەیە. شەرەفنامە كتێبێكی مێژوویی زۆر تێروتەسەلی بنەماڵە فەرماندارەكانی میرنشینە كوردییەكانە و بە فارسی نووسراوەتەوە و لە ١٥٩٦ كۆتایی هاتووە. لەكن زۆران، شەرەفنامە، تا دەگاتە كاتی نووسینەوەی، بە گرینگترین سەرچاوەی مێژووی كورد دەزاندرێ.

شەرەفنامە، مێژووە نووسراوەكەی دەكاتە چوار بەش. بەشی یەكەمی تایبەتە بەو پێنج ڕەچەڵەكەی كە پلەی (سەڵتەنەت)یان هەبووە. ئەوانیش؛ مەروانییەكانی دیاربەكر و جزیرە و حەسەن وەحیدییەكانی دینەوەر و شارەزور و فادلوییەكانی

لوڕی گەورەو شازادەی لوڕی بچووک و ئەیوبییەکان بوونە. بەشی دووەمی بۆ ئەو خانەوادانە تەرخان کردووە کە سکەی پارەیان هەبووە و لە گوتاری هەینی (خوتبە)دا ناویان هاتووە. (خوتبە ئەو گوتارەیە کە ڕۆژانی هەینی بۆ نوێژکەران دەخوێندرێتەوە و تیایدا باسی پێغەمبەر و چوار خەلیفەکانی ڕاشدین و فەرمانڕەوای سەردەمی تێدا دەکرێ.) بەشی سێیەمیش باسی ئەو بنەماڵانە دەکا کە بە ڕەچەڵەک فەرماندار بوونە. بەشی چوارەمیشی مێژووی میرەکانی بتلیس دەگێڕێتەوە.

شەرەفخان فەرمانداری پێشووی میرنشینی بتلیس بووە و پاشان کە لە نووسینی کتێبی شەرەفنامە بووەتەوە، ئیتر بۆ کوڕەکەی وازی لە دەسەڵات هێنا. وا پێ دەچێ کە زۆربەی ژیانی خۆی بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان تەرخان کردبێ، بۆ ئەوەی مێژووەکەی تەواو بکا.

**شەرەفنامە.** سەیری (شەرەفخانی بتلیسی) بکە.

**شەرەفەددین ئاڵچی ( ١٩٣٨ –        ).** کوردی تورکیایە. لە کۆتاییی ١٩٧٠کاندا، لە وەزارەتەکەی بلێند ئەجەڤیتیدا، شەرەفەدین وەزیری کاری گشتی بوو، کاتێک کە لە سەرتاسەری تورکیادا ناوی زڕا؛ چونکە گوتی: "من کوردم. کوردیش لە تورکیا هەنە." بۆ تەقاندنەوەی ئەم بابەتە، ئاڵچی دوو ساڵ و سێ مانگی لە زیندان بەسەر برد. لە ١٩٧٧، بووە سەرۆکی دیموکراتیک کیتلە پارتیسی (د.ک.پ.). ئەمەش کۆششێک بوو کردی بۆ ئەوەی پارتێک دابمەزرێنێ پاڵپشتی کورد بکا و لە خەلق ئەمەک پارتیسی (پارتی کرێکاری گەل)و لە دیموکراسی پارتیسی(پارتی دیموکراتی)یش نەرمڕۆتر بێ؛ چونکە ئاڵچی بەم دوو پارتەی دەگوت مارکسینە. ئاڵچی داوای ناسینی ناسنامەی کورد و دووبارە ڕێکخستنەوەی دەوڵەتی ناوەندی بەهێزی تورکیای کرد، بەڵام بەمەرجێ نابێ سنووری تورکیا ببەزێ. د.ک.پ. نەیتوانی هیچ دەستکەوتێکی دیار بەدەست بێنێ و پاشتر لە ١٩٩٩دا قەدەغە کرا.

**شەرەف– کوژی.** کوشتنی ئافرەتە، بەدەستی نێرینەیەک کە لە بنەماڵەی ژنەکە خۆی بێ. ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە کە ژن بواری ئەوەی نییە لە یاسا نەریتەکانی تایبەت بە پەڕین لادا و ئەگەر بە شێوەیەکی نایاسایی لەگەڵ نێرینەیەکدا زاووزێ بکا؛ شەرەفی خانەوادەکەی دەشکێنێ. پیاوان بەزۆری لەبەر شەرەف ژن دەکوژن، بۆ

ئەوە تۆڵەی لێ بکەنەوە. تا ئێستاش، دادگاکان لەم بارەیەوە نەرمی دەنوێنن، هەر بۆیەش شەرەفکوژی ئێستاکە بووەتە خاڵێکی گرینگی مافەکانی ئافرەت و مافەکانی مرۆڤ و گەلێ لایەن لەم بارەیەوە ڕەخنە ئاراستەی نەریتی کوردەواری دەکەن. سەیری "سەهنداڵ و فاتیمە" بکە.

**شەڕی ئێران–عێراق (١٩٨٠– ١٩٨٨).** لە سێپتێمبەری ١٩٨٠، سەدام حوسێن وای زانی کە ئێران لە ئەنجامی شۆڕشی ئیسلامی، ئێجگار بێهێز بووە و توانای بەرگریی نەماوە، بۆیە عێراق پەلاماری ئێرانی دا و بەشێکی زۆری خاکی ئەو وڵاتەی داگیر کرد. لە سەرەتادا، عێراق سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام پاشان شەڕەکە درێژەی کێشاو بواری بۆ بزووتنەوی ڕزگاریخوازی کوردی هەردوو لا ڕەخساند و مەترسیشی بۆ گەلی کورد پەیدا کرد.

ئێران و عێراق هەردووکیان هەوڵیان دا کوردەکانی لایەکەی دیکە وەک کۆڵمی پێنجەم fifth column دژی بەرانبەرەکەی و بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکار بێنێ. کوردی هەر دەوڵەتێکیش لە لای خۆیانەوە ویستیان مافە نەتەوەییەکانی خۆیان بەدەست بێنن، بۆیە پشتیوانیی دوژمنی ئەو وڵاتانەیان کرد کە لێی دەژیان. شەڕەکە وای لە کورد کرد کە بتوانن ڕۆڵێکی نێونەتەوەیی، لە هەموو کاتێکیان گرینگتر بگێڕن.

لە عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە سەرەتاوەڕا پشتیوانی ئێرانێی کرد. بەڵام یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕۆڵێکی ورياتری گێڕا و بۆ ماوەیەک لە ڕێگەی ئۆفیسی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، ویستی ڕێککەوتنێک لەگەڵ بەغدادا بکات. تا ١٩٨٧، «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» نەیانتوانی لە دژایەتی کردنی یەکتری بسەڵمێنەوە. بەڵام لەوساڵەدا، بە ناوبژیوانی کردنی ئێران بنەمای دروستکردنی بەرەی کوردستانی عێراقیان ڕاگەیاند. ئەم بەرەیە بوو کە بەردی بناغەی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردستانی لە باکوری عێراق، لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١دا، دامەزراند.

هەر ئەو پشتیوانییەی کە کورد لە ئێرانی کرد، عێراقی بەو ئاراستەیەدا برد کە سزایان بدا. بۆ ئەو سزادانەشی چەکی کیمیایی لە ئاداری ١٩٨٨دا، لە هەڵەبجە دەژیان بەکار هێنا و شالاوەکانی جینۆسایدی ئەنفالیشی بۆسەر کردن. ١ ملیۆن

مرۆڤ لە شەڕی ئێران-عێراقدا کوژران. لە کۆتاییی شەڕەکەش بارودۆخی کورد زۆر لەوە خراپتر بوو کە لە پێشی شەڕەکە هەیانبوو. دوای سێ ساڵ، شەڕەکە کەوتە بەرژەوەندیی کوردی عێراق، بەڵام کوردەکانی ئێران هەر وەک خۆیان بە بێهێزی مانەوە.

**شەڕی کەنداو (١٩٩١).** سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراق لە ١٩٩٠ کوێتی داگیر کرد و لەو شەڕە هاوپەیمانەکان، بە سەرکردایەتیی وڵاتە یەکگرتووەکان، زوو تێیدا بە سەر سەدام حوسێندا زاڵبوون. لە دوای سەرنەکەوتنی ئەو ڕاپەڕینەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان، لە پاش شەڕی، هانی دا، کەژاوەی پەناهەندەی گۆڕەوی کورد بە جۆرێک سەرنجی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بۆ خۆی ڕاکێشا، کە هەرگیز ئەم گەلە پێشتر بەمجۆرە بایەخی پێ نەدرابوو و لە ئەنجامدا دەوڵەتێکی دیفاکتۆی کورد لە باکوری عێراقدا دروست بوو، ئەم دەوڵەتە دیفاکتۆیە تا ئێستاش هەر ماوە و هەرێمی کوردستان بەڕێوە دەبا.

شەڕی کەنداو سەلماندی کە لە تورکیاش سەرەتای سەردەمێکی تازە بوو بۆ کێشەی کورد؛ چونکە حکوومەتە دیفاکتۆیەکەی کورد لە باشووری کوردستان ئومێدێکی گەورەی بە کوردی تورکیا بەخشی، ئەو بۆشاییەی دروست کرد کە پارتی کرێکارانی کوردستان، سوودی لێ وەرگرت و قرگەی خۆی لێ داکوتا. تورکیا بنکەی ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفورت بوو؛ وڵاتە یەکگرتووەکان لەوێوەڕا ناوچەی دژە فڕینی باکوری سەپاند.

**شەڕی دووەمی کەنداو (٢٠٠٣).** وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا، لە ئاداری ٢٠٠٣، شەڕیان دژی عێراق دەست پێ کرد و بەعسییەکانی سەدام حوسێنیان، لە حوکم وەدەرنا. هەرچەندە ڕەنگە تا چەند مانگ و ساڵی تریش دەرئەنجامی ڕاستی شەڕەکە دەرنەکەوێ، بەڵام خۆ هەر دیار بوو کە شەڕەکە کاریگەرییەکی زەبەلاح لەو بارودۆخەدا دەکا کە کوردی عێراق و حکوومەتی هەرێمی کوردستان، لە دوای شەڕی یەکەمی کەنداوی ١٩٩١، بۆیان ڕەخسا بوو.

لە دەستپێکی شەڕی کەنداوی ٢٠٠٣، زۆربەی کورد بە ئاواتەوەبوون تا بە چاوی خۆیان ببێنن سەدام حوسێن لەناو دەچێ و بە لەناوچوونیشی چیتر هەڕەشەکانی

نامێنێ. کوردی عێراق چاوەڕێی ئەوەشیان دەکرد کە لە دوای سەدام عێراقێکی دیموکراتی، پەرلەمانتاری فیدرالیی ئەوتۆ پێک بێ کە مافەکانیانی تێدا مسۆگەر ببێ. بەڵام ئەگەر لە لایەنی مێژووییەوە تەماشای دووبەرەکی و نەبوونی ڕێبازی دیموکراتی لە عێراقدا بکەین، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەری دروستبوونی ئەو مۆدێلە عێراقە دیموکراتی و فیدرالییەی کە کورد لێرە چاوەڕێی بوون، ناشێ بە ئاسانی بۆیان بێتە دی. پێت سەیر نەبێ ئەگەر لەم لایەنەوە لێکی بدەینەوە، دەشێ بڵێین کە سەدام حوسێن (باشترین دۆستی) کورد بوو، چونکە تا ئەو لە دەسەڵاتدا مابوو، وڵاتە یەکگرتووەکان کوردی دەپاراست و نەیدەهێشت بەغداد پێ دەناو ناوچەی دژە فڕین بخا. کە سەدام حوسێن نەما، ئەو پرۆسەی پاراستنەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەیکرد، ئەویش نەما و کورد دیسان دەبێ لەگەڵ حکوومەتێکی ناوەندیی لە عێراقدا مشتومڕەکانی خۆیان دەست پێ بکەنەوە.

لەمەش فرەتر ئەو ترسەیە کە تورکیا لە فیدرالزمی کوردی عێراق هەیەتی؛ چونکە ڕەنگە ببێتە هەنگاوی یەکەمی سەربەخۆیی و ببێتە نموونەیەک کە کوردی تورکیا چاوی لێ بکەن. تاکە هۆی ئەوەی کە تورکیا نەیتوانی سوپای خۆی بێنێتە ناو باکوری عێراق ئەوەبوو کە تورکیا نەیتوانی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان بگەنە ئەو ڕێککەوتنە کە ڕێی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان بدا، بنکەی سەربازیی تورکی بەکار بێنێ تا لەورەوەڕا پەلاماری عێراق بدا. لەگەڵ ئەمەشدا، هەڕەشەکانی تورک لە کوردی عێراقی دەکا، بۆ هاتنە ناوەوە، هێشتا هەر ماوە و پشتی لێ نەکراوەتەوە.

**شەڕی چاڵدیران (١٥١٤).** لەم شەڕە گرینگەی لە باکوری ڕۆژهەڵاتی دەریای وان قەوما، عوسمانییەکان گورزێکی کوشندەیان لە فارسە سەفەوییەکان وەشاند. لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا بوو کە لە ١٦٣٩ پەیمانی زەهاو مۆر کرا و هێڵی سنووریی نێوان هەردوو وڵات کێشراو تا ئێستاش ئەو سنوورەی ئەو کاتە هەر وەک خۆی ماوەتەوە. هەر بە پێی ئەو پەیماننامەیە بوو، زۆرینەی کورد کەوتنە ناو سنووری ئیمپراتۆری عوسمانی و کەمینەیەکیش کەوتنە ناو وڵاتی فارس. لە دوای شەڕەکەوە ئیتر کوردە ڕەوەندە کۆچەرییەکان پێوەندییان بە جووتیارە ئەرمەنییەکانەوە کرد و هەندێکیان هاتن شوێنەکانیشیان گرتنەوە و لەو دەشتاییەی ئەوێ نیشتەجێبوون.

**شەمدینان.** سەیری "نەهری" بکە.

**شەمدین ساقیق.** بە ناوی زەکی پارماکسز (بێ تپل)یش دەناسرێ. ئەم ناوەشی لەوەوە بۆ هات، چونکە لە کاتێک کە مووشەکێکی ئاگر دەدا، پەنجەیەکی پەڕی. شەمدین ساقیق، سەرکردەیەکی توندڕۆی پارتی کرێکارانی کوردستانی، ناوچەی ئامەدی کوردستانی باکور بوو. ساقیق بەوە تاوانبار دەکەن کە لەلای خۆیەوە ئاگربەستە یەکلایەکەی ئاداری ۱۹۹۳ی «پ. ک. ک»ی شکاند و لە ئایاری ۱۹۹۳، لەسەر شارێی بینگۆل- ئەلازیگ ۳۳ سەربازی تورکی کوشتن.

لە سەرەتای ۱۹۹۸، ساقیق لە پارتی کرێکارانی کوردستان جودا بووەوە. پاش ماوەیەکی کورت، یەکەیەکی کۆماندۆی تورکی لە باشووری کوردستان دەستگیریان کرد. پاشان دادگایی کرا و فەرمانی کوشتنی درا، بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی تا ۲۰۰۷یش حوکمەکەی بەسەردا نەسەپاوە.

برای شەمدین ساقیق، بە ناوی سەلیم ساقیق، ئەندامێکی پارتی دیموکراسی بوو، لە پەرلەمانی تورکیا بووە ئەندام تا لە ۱۹۹٤ دەرکرا. پاشان هاوڕی لەگەڵ ژمارەیەک لە پەرلەمانتارانی کوردی دەپ بە گومانی خیانەتکاری زیندانی کران، لەیلا زانا یەکێک لەو هاورێیانەی ساقیق بوو کە بۆ ۱۵ ساڵ زیندانی حوکم درا.

**شوانکارە.** خێڵێکی کوردە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێیە. بۆ ماوەی چەند ساڵ لە چەرخی ناڤینی ئیسلامەتی، ئەو هۆزە ڕۆڵێکی گرینگی لە ناوچەکانی کرماشان و فارسدا گێڕا. ئەو هەرێمەی کە لە باشووری کوردستانی ڕۆژهەڵات، تێیدا دەژی هەر بە ناوی شوانکارەوە دەناسرا. پایەتەختەکەی لە ئیج بوو. سەنگەر و قەڵاتی بۆ پاراستنی خۆی دامەزراندبوو و خاکەکەی زۆر بە پیت و بێر بووە و ئاشی تایبەتی و بازاڕی تایبەتی هەبووە.

لە ساڵانی ۱۲۰۰- ۱۲۰۱ شوانکارە خۆی لە ترۆپکی بە هێزی دا. لەو سەردەم دوو میری هەبوو، ناویان قوتبەدین موبارێز و نیزامەدین مەحموود بوو هەردووکیان برا بوون؛ هەردوو برا کرماشانیان داگیر کرد. نیزامەدینیان کابرایەکی بێ ئابڕوو بووە و ناوبانگی بە دەستدرێژیکردنە سەر ناموسی خەڵک دەرکردووە. ئەو باڵادەستییەی

شـــوانکاره، زۆر دەوامی نەبوو، چونکە پاش مـــاوەیەکی کـــەم، ئەتابەگی فـــارس دەسەڵاتەکەی لێ سـەندنەوە. لە ١٢٦٠، هۆلاکۆی مەغۆلی شاری ئیچی خاپوور کرد و موزەفەر محـەمەدی میری شوانکارەی کوشت. محـەمەد عەلی شوانکارە (١٢٩٨ – ١٣٥٨) مـێـژوونووسـێکی کـارامـە بووە و مـێـژووەکـەی لە سـەردەمی خـانی دووەمی مەغۆلەکاندا نووسیوەتەوە.

**شۆڕش**. گـرووپێکی کـۆمـۆنیسـتـەکـان بوو لە ١٩٤٣ لە عـێـراق دامـەزرا بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت مـاوە. گرووپەکە بە ناوی ئەو گۆڤـارەوە هەڵدەدرا کە دەری دەکرد. تا ئەو کاتـەی لە ١٩٤٦ خۆی تاواندەوە، شۆڕش ڕۆڵێکی گرینگی لە سیاسـەتـی کوردیدا هـەبوو. کە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦، پارتی دیموکراتی کوردسـتـان دامـەزرا، بە خواسـتی مەلامستەفا بارزانی بوو شۆڕش خۆی تاواندەوە.

هەمزە عـەبدوڵڵای یەکەم سکرتێری گشتیی «پ. د. ک» پێشتر ئەندامێکی چالاکی شۆڕش بوو. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ باڵێکی کوردی لە حزبی شیوعیی عێراق هەر مابوو. ئەم باڵە کوردییە لە ١٩٨٨، پێوەندیی بە بەرەی کوردستانەوە کرد.

**شۆڕشی ئارارات (١٩٢٧– ١٩٣٠)**. یەکێک لەو شـۆڕشـە مـەزنانە بوو لە سـەرەتای دامـەزراندنی کۆمـاری تورکیادا هەڵگیرسـا؛ دوو شۆڕشـەکانـی دیکە، شۆڕشـی شـێخ سـەعـید، لە ١٩٢٥و شـۆڕشی دەرسـیم لـە ١٩٣٦– ١٩٣٨ بوو. خـۆیبوون پلانی ئەو شـۆڕشــەی داناو لەناوچـەی دووری ڕۆژهـەڵاتی تورکـیـا لە دەوروبـەری شـاخـەکـانی ئارارات هەڵگیرسـا. خۆیبوون پارتێکی نوێ بوو لە سووریا دامەزرا. پارتی داشناکی ئەرمەنی و بزووتنەوەی کەمینەی نەتەوەیی یارمەتیی دارایی ئەم شۆڕشەیان دا.

ئیـحسـان نووری دەسـتنیـشـان کـرا تا ببـێـتـە سـەرکـردەی هێزێکی شـەڕکـەری ناخـێـڵـەکی؛ تـا ئەم ڕاپەڕینەش وەک ڕاپـەڕینە خـێـڵـەکییـەکـانی پێـشـووتر هـەرەس نەهێنێ. لەگـەڵ ئەمـەشـدا، چەندەها سـەرۆک هۆز پێوەندییان بە شـۆڕشـەکەوە کـرد؛ خێڵـی جـەلالی یەکێک لـەو تیرانە بوو کە لـە ناوچەکەدا دەژیا و ڕیزی شـۆڕشـەکـەی گـرت. حکوومـەت پێک هـاتبـوو، لە شــەڕی یەکـەم کـورد تورکـەکـانیـان بـەزاند. بەڵام چونکە تورکـیـا سـەرچاوەی پـتـری لەبـەردەسـتـدا هـەبوو، بۆیە توانی شـۆڕشـەکـە تەفروتۆنا بکا. جگە لەمەش، تورکیا لەگەڵ ئێران ڕێک کەوت و سنووری خۆی گۆڕی

و بەمجۆرە توانیی گەمارۆی شۆڕشڤانە کوردەکان بدا و ڕێی پاشەکشەکردنیشی بۆ ناو ئێران لێ گرتن.

**شۆڕشی قۆچگری.** شۆڕشی خێڵی قۆچگری کوردی بوو کە لە نۆڤێمبەری ۱۹۲۰، لە ڕۆژئاوای دەرسیم لە تورکیا هەڵگیرسا. ئەم شۆڕشە لە کاتێکدا هەڵگیرسا کە کەمالییەکان بە هەموو توانای خۆیان هەوڵیان دەدا لە لای ڕۆژهەلات هێرشی ئەرمەنییەکان و لە لای ڕۆژئاواش هێرشەکانی یۆنانییەکان بەرسڤ بدەنەوە. عەلی ئیحسان بەگی کوڕی مستەفا پاشای سەرۆک خێڵی قۆچگری سەرکردەی شۆڕشەکە بوو.

کوردە سوننییەکان پشتیوانیی ئەم شۆڕشەیان نەکرد و گومانیان لەوە هەبوو کە قۆچگرییەکان پێوەندییان بە ئەرمەنییەکانەوە هەبێ. خۆ تەنانەت کوردە عەلەوییەکانی ناوچەی باشووریش پێوەندییان بە شۆڕشەکەوە نەکرد. کەمالیستەکان هەوڵیان دا، کاتیان بەدەست هێنا تا هێزەکانی خۆیانیان کۆکردەوە و لە نیسانی ۱۹۲۱ پەلاماری ئەم شۆڕشە لاوەکییەیان دا و سەرکوتیان کرد. پاشتر گەلێک شۆڕشی گەورەتری کورد بەرپابوون؛ لەوانە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی ساڵی ۱۹۲۵ و شۆڕشی ئارارات لە ۱۹۲۷ـەوەڕا تا ۱۹۳۰، شۆڕشی دەرسیمیش لە ۱۹۳٦ڕا تا ۱۹۳۸ی خایاند.

**شیلەت.** شیلەت و چۆخ سۆر، دوو خێڵی بەهێزی ناو کۆنفیدراسیۆنی میرنشینی بۆتانی باکوری کوردستان بوون. کە لە ۱۸٤۷، میرنشینی بۆتان لەناو چوو، ئەو دوو خێڵەش خێرا هاوپەیمانەتییەکەی نێوانیان هەڵوەشاندەوە. خێڵی میرانی سەر بە کۆنفێدراسیۆنی چۆخ سۆر، بۆ ماوەیەکی کورت ئەوانی دیکەی داگیر کرد، مستەفا پاشای میران، نموونەیەکی زیندووی ئەو باڵادەستییەی لە ۱۸۹۰ـەکاندا نیشانی هەمووان دا. کۆنفیدراسیۆنی شیلەت لە خێڵەکانی باتوان، کچان، خەریکان، موسەرشان پێک هاتبوو.

**شێخ.** سەیری "پیر" بکە.

**شێخ ئەحمەد بارزانی ( ۱۸۸٤– ۱۹٦۹).** براگەورەی مەلا مستەفا بارزانی بوو.

دوا بارزانییش بوو کە نازناوی "شێخی بارزان"ی هەبێ. لە ١٩٢٠ـەکاندا، شێخ ئەحمەد، ناوبانگی بەوە دەرکرد کە هەندێ جۆرە ڕاهێنانی ئاینی تایبەتی دەکرد. هاوکات لەگەڵ مەلا مستەفای برای لە حکوومەت یاخیبوون و لە کۆتاییدا شێخ ئەحمەد بەند کرا. لە ساڵانی کۆتاییی تەمەنی، شێخ ئەحمەد کۆششی زۆری بۆ ناوبژیوانی حکوومەت و مەلا مستەفا بارزانی کرد، بەڵام سەرنەکەوت.

**شێخ سەعیدی پیران (١٨٦٥– ١٩٢٥)**. شێخێکی کاریزماتی نەقشبەندی بوو، لە ١٩٢٥ یەکەم گەورەترین شۆڕشی دژی تورکیای کەمالی بەرپا کرد. لە سەرەتادا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا، بەڵام پاشان نەیتوانی بەرانبەر بە زەبروزەنگ و تفاقی زۆری لەشکری کەمالییەکان خۆی ڕابگرێ و شۆڕشەکە لەناو برا و شێخ سەعیدیش دەستگیر کرا. پاشان تورکەکان تاوانی خیانەتیان بەمل دابڕی و لە داریان دا.

تا ئێستاش مێژوونووسان لە سەر بابەتی شێخ سەعید هەر مشتومڕیانە و هەندێک دەڵێن شۆڕشەکەی شۆڕشێکی نەتەوەیی کوردپەروەر بووە و نەیارانی کوردیش باسی ئەوە دەکەن کە ڕەنگە شۆڕشەکەی شێخی پیران تەنیا ڕاپەڕینێکی ئاینی بووبێ و هەستی کوردایەتیی پێوە نەبووبێ. کەچی لە ڕاستیدا پارسەنگەکە پتر بە لایەنی یەکەمدا دەچێ؛ بەڵام هێشتا ڕەنگە شۆڕشی شێخی پیران، مۆرکێکی ئاینیشی پێوە هەبووبێ. ڕێکخراوی سیاسیی "ئازادی" بوو کە شێخ سەعیدی بۆ سەرۆکایەتیکردنی شۆڕشەکە دەستنیشان کرد؛ چونکە شێخ ژمارەیەکی بێ ئەندازە سۆفی و مریدو لایەنگری هەبوو. ڕێکخراوی ئازادی خۆی، هێندەی شێخ لایەنگری نەبوو. ئامانجی سەرەکیی شۆڕشەکە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بوو؛ چونکە کەمالییە سێکولارەکان، بنەمای شەریعەتی ئیسلامیان لە تورکیا ڕاتەکاند و سیستەمی حوکمڕانیی خەلیفایەتییان لادا بوو. کەچی بە بیرو بۆ چوونی شێخ سەعید دەبوو ڕێز لە شێوەی حوکمی خەلیفایەتی بگیرابا و نەبڕابایەوە.

لەو سەردەمیش کورد هەموو بەدوای شێخ سەعیدی نەکەوتن و تەنیا زازاکان پشتیان گرت و عەلەوییەکان بەلای دەسەڵاتی تورکاندا کەوتن؛ چونکە لەو باوەڕەدابوون کە ژیانیان لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی عیلمانی تورکیدا باشتر دەبێ

لەوەی کە بکەونە بەر دەستی حکوومەتێکی کوردیی وەسا کو بنەماکانی ئیسلامی سوننی ڕەچاو بکا و شێخێکی نەقشبەندییش سەرۆکی بێ. هۆزەکانی دیکەی کورد خۆیان دوورەپەرێز ڕاگرت و دەڵێن یەک لەو خێڵانە خیانەتیان لە شێخ کرد، چونکە لە کاتی ڕاکردنیدا گرتیان و تەسلیمی تورکانیان کردەوە. شۆڕشی ئاراراتی ١٩٣٠یش هەر بەدرێژەی شۆڕشەکەی شێخ سەعید دادەندرێ.

**شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٣١– ١٨٨٣)**. کوڕی سەید تەهای نەهرییە و یەکێکە لە سەرکردە کوردە هەرە بەهێزەکانی سەدەی ١٩ لە ١٨٨٠، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، گەورەترین شۆڕشی کوردایەتیی دژی عوسمانییەکان کرد، بەڵام شۆڕشەکە تا کۆتایی سەری نەگرت. بۆیە دەگوترێ شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا سەرهەڵدانێکی نەتەوەیی بووە؛ چونکە خودی خۆی نامەیەکی ئاراستەی کۆنسوولی گشتیی بەریتانیا لە تەورێز کردووە و تێیدا نووسییەتی: "نەتەوەی کورد.....گەلێکی جودایە.....ئێمە دەمانەوێ کاروباری خۆمان بە دەستی خۆمانەوە بێ."

پاشتر چونکە حکوومەتی فارسی بە خراپی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو سەرۆک خێڵ و هۆزە کوردانە کرد کە بێ ڕاوێژکردنی خودی شێخ عوبەیدوڵڵا پێوەندییان پێیەوە کردبوو هەردوو کوڕەکەی دەستیان پێ کرد پەلاماری داوودەزگاکانی ئیمپراتۆریەتی فارسییان دا شێخ عوبەیدوڵڵا خۆیشی لە سنووری ئیپراتۆریەتی عوسمانییەوە دەربازی نێو دەوڵەتی فارس بوو. دوای ئەوەی، چەند سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا، هێزە خێڵەکییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا لەبار یەکتری ترازان، هێشتا خۆ ئیمپراتۆریی فارسی پەلاماری نەدابوون کە شۆڕشەکە لە خۆوەڕا دامرکاوە.

عوسمانییەکان نەرمتر لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵا هەڵسوکەوتیان کرد و لە پێشدا تەنیا بانشی ئەستەمبوڵ کرد و پاشان لە ١٨٨٢ لە ئەستەمبوڵ ڕای کرد، جا کە گرتیانەوە ئەمجارە بانشی حیجازیان کرد و لەوێ لە ١٨٨٣دا مرد. ڕەنگە عوسمانییەکان بۆ ئەوە نەرمییان لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵا نواندبێ، چونکە ویستوویانە شێخ بمێنێ و مانی شێخ، بە بۆچوونی سوڵتان، ڕێگە لە پەیدابوونی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی دیان دەگرێ و لەلایەکی تریشەوە ناهێڵێ کولتوور و شارستانییە تازەکەی ڕۆژئاوا لە باکوری کوردستان گەشە بکا. پێشتر لە ١٨٧٧–

١٨٧٨، له كاتی شه‌ڕی ڕووسی-توركی شێخ به سه‌رۆكی هێزی عه‌شایری كوردی دامه‌زرابوو. دامه‌زراندنی شێخ له‌و پۆسته‌، جۆره فریودانێكی كورد بوو، چونكه عوسمانییه‌كان ده‌یانزانی كورد چه‌ند ملكه‌چی شێخ بوون، بۆیه هه‌موو هێزی خێڵه‌كانی كوردانیان له بن ده‌ستی ئه‌و دانا تا به‌بێ بیر كردنه‌وه ئیمپراتۆری عوسمانی بپارێزن.

عوسمانییه‌كان له لایه‌كی تره‌وه شۆڕشه‌كه‌ی شێخیان به هه‌لێك زانی بۆ ئه‌وه‌ی به‌ربه‌رچی ئه‌و فشارانه بده‌نه‌وه كه ڕۆژئاوا خستبوویه سه‌ر سوڵتان تا چاكسازی له وڵاتدا بكاو ئه‌ویش نه‌یده‌ویست بیكا، چونكه ترسی هه‌بوو كه ئه‌و چاكسازییه ئیمپراتۆریه‌ته‌كه‌ی برووخێنێ. هه‌مان كێشه ئێستاش له نێوان حكوومه‌تی توركیا و یه‌كێتیی ئه‌وروپا به‌رده‌وامه و تورك نایانه‌وێ چاكسازیی بنه‌ڕه‌تی له په‌یكه‌ری ده‌وڵه‌ته‌كه‌یان بكه‌ن، نه‌كا ئه‌و چاكسازییانه ده‌وڵه‌ته‌كه‌یان له ده‌ست بدا، چونكه تورك ده‌زانن بوونیان له مه‌ترسیدایه.

له ڕاستیدا، شێخ عوبه‌یدوڵلا ده‌یویست ئۆتۆنۆمییه‌كی وه‌ك سه‌ربه‌خۆیی میرنشینه كوردییه‌كان بۆ خۆی مسۆگه‌ر بكا. بزووتنه‌وه‌كه‌ی شێخ تۆوی كوردایه‌تی چاند.

**شێخ مه‌حموود به‌رزنجی (١٨٨١- ١٩٥٦)**. یه‌كێكه له نه‌وه‌كانی خانه‌واده‌ی شێخه‌كانی قادری كه چه‌ند سه‌ده‌یه‌ك به‌ر له ئێستا ڕه‌چه‌ڵه‌كیان هه‌بووه. له ١٩١٨، بریتانییه‌كان كردیانه فه‌رمانداری سلێمانی و ده‌وروبه‌ری. له ئینگلیز یاخی بوو، شۆڕشی دژیان به‌رپا كرد و ناوی له خۆی نا مه‌لیكی كوردستان. ده‌ركه‌وت شێخ پشتیوانییه‌كی كه‌می هه‌بوو. به‌ریتانییه‌كان به فڕۆكه‌كانیان چه‌ند شۆڕشێكی شێخیان بۆردمان كرد و تێكیان شكاندن. له دوای دامركاندنه‌وه‌ی دوا شۆڕشی له ١٩٣١، شێخ له باشووری عێراقدا، ماڵزیندانی كرا. كه به زامداریش ده‌ستگیر كرا، به‌ریتانییه‌كان فه‌رمانی له سێداره‌دانیان بۆ ده‌ركرد، به‌ڵام پاشان ئه‌فسه‌ری سیاسیی به‌ریتانی نه‌یویست ئیعدام بكرێ، بۆ ئه‌وه‌ی نه‌بێته پاڵه‌وانێكی نه‌ته‌وه‌یی كورد پاشان بۆ هیندستان بانش كرا. شۆڕشه‌كانی شێخ مه‌حموود به هێما سه‌ره‌تاییه‌كانی بیری كوردایه‌تی له باشووری كوردستان ناسرا.

**شێخ مووس حه‌سه‌ن جگه‌رخوێن (١٩٨٣- ١٩٠٤)**. شاعیرێكی كوردی لای

جـەمـاوەر زۆر پەسـند و خـۆشـەویست بـووە و وەک کـەسـێکی ڕادیکاڵیش پابەندی یەکێتیی کوردو پشتیوانیی چاکسازیی کۆمەڵی کردووە. شیعرەکانی بە پلەیەکی تایبەت بەهادارن. جگەرخوێن توانیویەتی بە هەردوو شێوەی کلاسیک و هاوچەرخ هۆزان بهۆنێتەوە. "دیوانی جگەرخوێن" و "سەورە (شۆڕشی) ئازادی"، دوو لە دیوانە هەرە ناودارەکانی ئەو هۆزانڤانە پایەبەرزەن. سەیری "ئەدەب" بکە.

**شێرکۆ بێکەس** (١٩٤٠–      ). یەکێک لە ناودارترین هۆزانڤانە هاوچەرخەکانی کوردە. زۆربەی شیعرەکانی لە بواری نەتەوەپەروەری و وڵاتپارێزی چوارچێوە دەگرن. "ئەگەر ئازادی لە شیعرەکانم دەربکەی...ئازادیم لێ دەستێنییەوە، ساڵم دەمرێ و منیش دەمرم."

لە پارێزگای سلێمانی، لە کوردستانی عێراق لە دایکی بووە. شێرکۆ بێکەس شیعرەکانی لە گۆڤارەکان لە سەرتاسەری کوردستان بڵاو کردووەتەوە. شیعرەکانی بۆ چەند زمانی بیانی وەرگێڕدراون؛ لەوانە زمانی عەرەبی، ئیتاڵی، سویدی، فرەنسی و ئینگلیزیش. لە ، لەمیانی پێشبڕکێیەکی ئەدەبی پاداشتێکی لە ئەوروپا وەرگرت. لە ١٩٩٢ تا ١٩٩٣ لە کوردستانی عێراق، وەزیری ڕۆشنبیریی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بووە.

## ع

**عەبدولڕەحمان قاسملوو (١٩٣٠- ١٩٨٩)**. کوردێکی ئێرانی چەپڕەوی لێزان بوو. پلەی دکتۆرا (PHD)ی لە بواری ئابووری لە زانکۆی پراگ وەرگرت و لە ١٩٦٥ کتێبی کوردستان و کوردی نووسییەوە. لە ١٩٧١، بەسەرۆکی حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران هەڵبژاردرا. قاسملوو مرۆیەکی کارامە و ستراتیژزان و دیپلۆمات و ڕێکخەرێکی لێهاتوو بوو. لە سەردەمی سەرکردایەتیی قاسملوو، حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران دروشمی (ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دێمۆکراسی بۆ ئێران)ی پەسند کرد. فرە جار بەرهەڵستی کوردی عێراقی کرد، چونکە ئەوان پشتیوانی ئێرانیان دەکرد و ئەویش لای عێراق دوژمنایەتی ئێرانی دەگرت. لە کاتێکدا کە لە تەممووزی ١٩٨٩، هەوڵی دەدا، دانوستانی ئاشتی ئەنجام بدا، خیانەتیان لەگەڵیدا کرد و سیخوڕەکانی ئێرانی لە ڤییێنای پایتەختی ئەوستریادا، کوشتیان. زۆر لە کوردان بە یەکێک لە گەورە سەرکردەکانی سەدەی بیستەمی کوردی دەزانن.

**عەبدولسەلام دووەم (شێخی بارزان) (١٨٨٢- ١٩١٥)**. براگەورەی پێشەوای ئەفسانەیی کورد، مەلا مستەفا بارزانی و مامی سەرۆکی کوردستان، مەسعوود بارزانی بوو. ئەو خێلەی بارزانی کە عەبدولسەلامی دووەم سەرکردایەتی دەکرد، بە سەرکردایەتی ئاینی و سەربازی ناودێرە. عەبدولسەلام جوامێرێکی هێندە لێبوردە بوو، تا بە نازناوی (شێخی دیانان the sheikh of the christians" ناوی دەرکرد. هەروەها لەمیانی کزبوونی دەسەڵاتی عوسمانیدا، بە نمایندەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد ناسرا کە تازە چرۆی دەکرد. لە دەستپێکی ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، عوسمانییەکان لە سێدارەیان دا.

**عەبدولکەریم قاسم (١٩١٤- ١٩٦٣)**. پلاندانەری ئەو کودەتا سەربازییە بوو کە لە ١٤ی تەممۆزی ١٩٥٨، بنەماڵەی پاشایەتیی هاشمیی لەسەر تەختی حوکم لە عێراق لادا. ژەنراڵ قاسم بانگهێشتەی مەلا مستەفا بارزانیی کرد بۆ ئەوەی لە بانشگەی یەکێتیی سۆڤیەت بگەڕێتەوە و لە سەرەتادا زۆر بە دۆستانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ

بارزانی بە تایبەتی و لەگەڵ گەلی کورد بە گشتیدا کرد. قاسم پارتێکی سیاسیی بە دواوە نەبوو بۆ ئەوەی پشتی بگرێ و ڕێنمایی بکا؛ بۆیە بە خۆیشی نەیدەزانی چ دەکا. لە ١٩٦١، بارزانی شۆڕشی کرد و ئەم شۆڕشە هێشتا قاسمی بێ هێزتر کرد. لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣، بەعسییەکان قاسمیان لەسەر حوکم لادا و کوشتیان. زۆر کەس قاسم بە سەرکردەیەکی باشتر دەناسن، لەوانەی کە لەدوای ئەودا هاتن. هەندێک دەڵێن یەک لە داباپانی قاسم کورد بووە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان (ئاپۆ) (١٩٤٦-        )**. دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان «پ. ک. ک» یە. لە ٢٧ی نۆڤێمبەری ١٩٧٨، «پ. ک. ک»ی دامەزراند. هەرچەندە ئاپۆ لە ١٦ی شوباتی ١٩٩٩وە دەستگیر کراوە و زیندانییە، بەڵام هێشتا هەر سەرۆکی پارتەکەیە. بۆیە دەشێ بڵێین کە سەربردەی ژیانی ئۆجەلان مێژووی «پ. ک. ک» دادەڕێژێ.

عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە گوندی ئۆمەرلی سەر بە ناوچەی هەلڤان سەڤەرەکی هەرێمی ئورفە لە باکوری کوردستان هاتووەتە دنیاوە. ئۆجەلان نۆبەرەی خێزانێکی جووتیاری هەژارە و شەش خوشک و برای هەیە.

لەمێژە عەبدوڵڵا ئۆجەلان بە (ئاپۆ) ناسراوە. "ئاپۆ" واتە "مامە". لە سەرەتای پەیدابوونی پارتە سیاسییەکەی، لایەنگرانی ئۆجەلان بە ناتۆرەی "ئاپۆ جولار" واتە (پشتیوانانی ئاپۆ) دەناسران. "ئۆجەلان"یش واتای (تۆڵەسێن) دەدا.

ئۆجەلان بە منداڵی تورکی نەدەزانی، بەڵام پاشان بە ناچاری لە پلەی خوێندنی سەرەتاییدا فێری بووە و پاشتر چونکە هەر زمانی تورکیی بەکار هێناوە ئیتر کوردییەکەی خراپ بووە، جا بۆ ئەوەی بتوانێ کوردی بە ڕەوانی لە بۆنەکاندا بەکار بێنێ، ناچار بوو کە زمانەکە بخوێنێ. کە بۆ یەکەم جار لە ١٩٦٦، سەردانی ئەنکارای کرد بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی وەرگرتنی زانکۆ بکا، خۆی بە تورک ناساند.

چونکە ئۆجەلان لە ئەکادیمیای شەڕی تورکی وەرنەگیرا، چوو زانستە سیاسییەکانی لە زانکۆی ئەنکارا خوێند. شایانە بزانین کە ئۆجەلان بایەخی تایبەتی بە خوێندنی مێژووی ئابووری دا. لە ١٩٧٠ پشکداری خۆپیشاندانێکی نایاسایی

قوتابییانی کرد و لە ئەنجامدا زیندانی کرا. ئەو بەندکردنەی بوو سەرتاپا شێوەی ژیانی گۆڕی. لەم کاتانەدا بوو باوەڕی بە هزری مارکسی هێنا. چەند ساڵ پاشتر، عبداللە ئۆجەلان خۆی دانی بەوە دانا کە دەنیز گەزمیس و ماهێر جایان کاریان تێی کردووە. دەنیز و ماهێر هەردووکیان کوردبوون، لە ١٩٧٠کاندا، لە تورکیا، سەرکردەی چەپڕەوە ڕادیکاڵەکان بوون. هەردووکیان لە بەرگریکردن لە کێشەی گەلەکەی خۆیاندا مردن.

لە کۆبوونەوەیەکی دەڤ گەنج، لە ١٩٧٤، لە ئەنکارا، ئۆجەلان و چەند خوێندکارێکی دیکە دامەزراوی پەروەردەی باڵای ئەنکارایان پێک هێنا. ئۆجەلان بە ئامادەبووانی ئەم کۆبوونەوەیەی ڕاگەیاند کە بارودۆخی تازە بۆ بزووتنەوەی کوردایەتی لە تورکیادا هاتووەتە ئاراوە، پێویستە گرووپەکە پێوەندی لەگەڵ هەموو ئەو گرووپە تورکییە چەپڕەوانە ببڕێ کە دان بە مافە نەتەوەیییەکانی کورد دانانێن.

گرووپەکە لە ١٩٧٥، لە ئەنکارا دەرکەوت و چوو لە کوردستان دەستی بە چالاکییەکانی خۆی کرد. لە سەرەتادا تەنیا ئەندامی تازەیان وەرگرتن و هزر و بۆچوونەکانی گرووپەکەیان بە ناو جەماوەردا پەخش دەکرد، تا درەنگی١٩٧٠کان، کە ئیتر دەستیان بە کردەوەی توندوتیژی کرد و پەلاماری گرووپە چەپڕەو و گرووپە کوردییەکانی دیکەیان دا. ئەوەی ئاپۆیییەکانی لە گرووپەکانی تر جودا دەکردەوە ئەوەبوو کە ئەمانە هەموو لە چەرگەی هەژارترین و نزمترین چینی کوردەواری بوون و ئامادەبوون تا کاری توندوتیژی ئەنجام بدەن. لە ١٩٧٩، ئۆجەلان هەستی بە مەترسی کودەتایەکی سەربازی کرد کە خەریک بوو گەڵاڵە دەبوو، بۆیە لە ترسی ئەوەی نەکا لە نەکاوڕایەک بقەومێ و بگیرێ، لە ئایاری ١٩٧٩، وڵاتی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە سووریا. کودەتایە سەربازییە تورکییەکە لە ١٩٨٠ قەوما. ئۆجەلانیش لە سووریاوەڕا سەرکردایەتیی «پ. ک.ک»ی کرد تا ئۆکتۆبەری ١٩٩٨، هەینێ سووریا لە بن گوشاری تورکەکان، ناچار بوو عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە وڵات دەرکات.

عەبدوڵڵا ئۆجەلان هەر لە دەستپێکی شۆڕشەکەی داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی کرد تا لەسەر بنەما مارکسییەکان دابمەزرێ. بەڵام هێدی هێدی ئەو ئامانجانەی گۆڕی و پاشان مشتومڕی لەسەر ئۆتۆنۆمییەکی کوردی یان

دامەزراندنی فیدرالییەک بۆ کورد لە چوارچێوەی وڵاتی تورکیادا کرد. لە سەرەتای ۱۹۹۰، وا پێ دەچوو کە ئۆجەلان جۆرە سەرکەوتنێکی سەربازی بەدەست بێنێ. بەڵام پاشان "لە بەری خۆی پتر پێی خۆی درێژ کرد"و سوپای تورکیش هەموو تواناکانی خۆی بۆ بەربەستکردنی شۆڕشەکە خستە گەڕ.

هەرچەندە لە سەرەتادا خەڵک وەک ستالین سەیرە ئۆجەلانیان دەکرد و بە سەرکردەیەکی بکوژیان دەناسی، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو ڕەخنەگرانی گەیشتنە ڕاستییێک و کۆکبوون کە ئۆجەلان لە هەموو سەرکردەیەکی تری کوردی لەم ساڵانەی دوایی لە تورکیا، پتر توانیی هەستی کوردایەتی و شانازیکردنی نەتەوەیی کوردی بژیێنێتەوە. ئەم هەستەش لەوەوە دەرکەوت کە لە ۱٦ی شوباتی ۱۹۹۹، تورکەکان توانییان لە کینیا عەبدوڵڵا ئۆجەلان بگرن، گەلی کورد لە تورکیا و هەموو کوردستان و لە سەرتاسەری جیهان بۆ نارەزایی دەربڕین خۆ پێشاندانیان کرد و ئەم کردەوە موخابەراتییەی تورکیایان ڕیسوا کرد. ئەو پشتیوانیکردنە بەرفراوانەی ئۆجەلان ڕاستییەکی بۆ هەموو لایەک ڕوون کردەوە؛ ئەویش ئەوەیە کە چۆن دەشێ کەسێک کە لایەنەک بە خەباتکاری ڕێگەی ئازادیی بزانێ، لای بەرانبەری بە تیرۆریستی لە قەڵەم بدا.

لەمیانی دادگاییکردنیدا، ئۆجەلان پێشنیازی کرد شۆڕشی «پ. ک. ک» کۆتایی پێ بێنێ، ئەگەر دیموکراسییەکی ڕاستەقینە لە تورکیا جێبەجێ بکرێ و تورکیا نەیکوژێ. ئۆجەلان لە زیندانەکەیەوەڕا لە دوورگەی ئیمرالی، بەیانێکی بڵاو کردەوە داوای سەپاندنی دیموکراسییەکی ڕاستەقینەی لە دەوڵەتی تورکیا کرد تا لەوێوەڕا کێشەی کورد لە چواچێوەی سنووری ئێستای تورکیادا چارەسەر ببێ و بەمەش ئەوپەڕ ئامانجی ئەتاتورک بۆ دامەزراندنی تورکیایەکی بەهێزی یەکگرتووی دیموکراسی بێتە دی کە بتوانێ پێوەندی بە یەکێتیی ئەورووپاوە بکا. «پ. ک. ک زۆربەی گەریلاکانی لە کوردستانی باکور کشاندەوە و هەموو پەلامارێکی دژی تورک وەستاند. لەگەڵ ئەمەشدا، عەبدوڵڵا ئۆجەلان، بە تاوانی خیانەتکاری، لە ۲۹ی حوزیرانی ۱۹۹۹، فەرمانی لە سێدارەدانی درا.

لە ۲٥ی نۆڤێمبەری ۱۹۹۹، دادگای تێهەڵچوونەوەی تورکی، خواستی تێ

هەڵچوونەوەی ئۆجەلانی ماندەل کرد. بەڵام دادگای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ – تورکیا سەر بەو دادگایەیە– بە پەلە هەندێ ڕێنمایی کاتیی دەرکردو تێیدا داوای لە تورکیا کرد لە سێدارەدانەکە هەڵواسێ تا ڕێگە بەو دادگایە بدا، بڕیاری خۆی دەربارەی تێ هەڵچوونەوەکەی ئۆجەلان دەربچوێنێ. ئەم پێداچوونەوەیەش پتر لە دوو ساڵی خایاند. لەو ماوەی چاوەڕوانیدا تورکیا بۆ بوونە ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا کاندید کرا. بەڵام بوونە ئەندامی بە قبووڵکردنی مەرجەکانی کۆپێنهاگن Copenhagen بەندە. بە پێی ئەو مەرجانەش دەبێ تورکیا دان بە مافی کەمینە نەتەوەییەکاندا دابنێو حوکمی ئیعدامیش لە یاسای سزاکانی دەوڵەتدا نەهێڵێ.

لە ٢٠٠٢، تورکیا فەرمانی لە سێدارەدانی لە یاساکانی خۆیدا لادا. لە سەرەتای ٢٠٠٣ش، دادگای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ داوای لە تورکیا کرد تا سەرلەنوێ دادگایی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بکاتەوە. تا ساڵی ٢٠٠٧یش کە ئەم کتێبەی تێدا بە کوردی کراوە، ئایندەی کورد و ئۆجەلانی زیندانی کراو لە دوورگەی ئیمرالی و سەرجەم پرۆسەی بە دیموکراتی کردنی وڵاتی تورکیا، هەرسێکیان بە بوون بەئەندامێتیی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپاوە بەندن.

**عزەدین حوسەینی، (١٩٢١–      )**. شێخ عزەدین حوسێنی مەلایەکی لیبرالی چەپڕەوی ئەوتۆیە کە پتر لەگەڵ کۆمەڵەی مارکسی دەگونجێ نەک لەگەڵ حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران. ئەم کوردە ئێرانییە کە ناوەکەی مانای هێزی ئاین دەبەخشێ، نموونەی مەلایەکی نائاسایی سوننە نیشان دەدا. شێوەی هەڵسوکەوتی نایابی و کوردایەتییە سێکولارییەکەی وای لێ کرد کە لە دوای ڕووخانی ڕژێمی پەهلەوی لە ١٩٧٩، هەموو گرووپە سیاسییە کوردییەکانی ئێران ڕیزی لێ بنێن.

عزەدین حوسێنی باوەڕی بە جوداکردنەوەی دەوڵەت لە ئاین هەبوو، بۆیە ڕەخنەی لە ڕێبازی ویلایەتی فەقیە و مەرجەعی ئەعلای ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی گرت، چونکە دەست لە کاروباری دەوڵەت وەردەدا. بە ڕای حوسێنی دەبێ مەلایان تەنیا بە کاروباری ئاینییەوە خەریک بن. لەگەڵ ئەمەشدا، شێخ عزەدین حوسێنی بۆ خۆی پۆستی سەرۆکی ئەنجوومەنی گەلی کوردی وەرگرت و بۆ ماوەیەکیش لەو دانوستانانەی کە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی کرا، نوێنەری کوردەکانی ئێران بوو.

خومەینی عزەدین حوسێنی بە دوژمنی دین و عەبدولرەحمان قاسملووی سەرۆکی حزبی دیموکراتی کوردستانیشی بە گێرەشێوێن ناوزەد کرد.

شێخ عزەدین حوسێنی لە ١٩٨٠، بە ناچاری چووە سوێد و لەوێ لە بانشگەدا دەژی. حوسێنی وەک سەرکردەیەکی کوردپەروەر و ناوبژیوانکار و یەکخەری هێزە کوردییەکان ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردی لە ئێران، با چەند کەسایەتییەکی ئاینیش سەرکردایەتییان کردبێ، بەڵام هەرگیز بزووتنەوەیەکی ئاینی نەبووە.

**عەزیز محەمەد (١٩٣٣-      )**. کوردە و لە هەولێر لەدایک بووە و لە کۆتایی ١٩٦٠ـەکانەوەڕا تا سەرەتای ١٩٩٠ـەکان، سەرۆکی حزبی شیوعیی عێراقی بووە. لە دوای خانەنشینبوونی عەزیز محەمەد، حزبەکە سەنگێکی بەرچاوی لە مەیدانی سیاسیی عێراقدا نەما. عەزیز محەمەد لە ١٩٤٨ پێوەندیی بە شیوعییەکانەوە کرد و لە ١٩٤٨ تا ١٩٥٨ لە زیندان بووە. دەرچووی قۆناغی سەرەتاییە و کاری تەنەکەچیاتیی کردووە.

لە سەرەتای ١٩٧٠کاندا، لەو دەمی عەزیز محەمەد سەرۆکی حزبی شیوعی بوو، حزبەکەی ئەندامی جەبهەی قەومی بووە کە حزبی بەعس سەرۆکایەتی کردووە.

لە کۆتایی ١٩٩٠ـەکانیشدا، عەزیز محەمەد ناوبژیوانیی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی کردووە بۆ ئەوەی شەڕی نێوانیان بوەستێنێ.

**عیسمەت شەریف وانلی (١٩٢٤-      )**. سەیدایەک و ژێدەرێکی ناسراوی کوردە؛ لە سووریا هاتووەتە دنیاوە. لە ١٩٦٠ـەکان و ١٩٧٠کان پرۆفێسۆر وانلی، پێوەندیی بە مەلا مستەفا بارزانییەوە کردووەو لە ئەورووپا و ئیسرائیل نوێنەری بارزانی بووە. لە ١٩٧٠کان. سیخوڕانی ڕژێمی عێراقی ویستیان لە سویسرا تیرۆری بکەن، بەڵام لە هەوڵەکە سەرنەکەوتن. هەرچەندە زۆر لە نزیکەوە گوللەیان لە کەللەی سەری دا، بەڵام هەر ڕزگاری بووو نەکوژرا. لە ١٩٩٥، بەئەندامی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنی پەرلەمانی کوردستانی ل دەرڤەیی وڵات هەڵبژاردراو لە ١٩٩٩، بە سەرۆکی کۆنگرا

نەتەوەییا کوردستان دەستنیشان کرا. کۆنگرە لە جێی پەرلەمان پەیدا بوو.

**عەلی ئەکبەر هاشمیی ڕەفسەنجانی (١٩٣٤-      )**. لە نێوان ١٩٨٩ تا ١٩٩٧، سەرۆک کۆماری ئیسلامیی ئێران بوو. هەرچەندە ڕەفسەنجانی بەناو ئیسلامییەکی نەرمڕۆ بوو، بەڵام لەو سەردەمی کە ئەو سەرۆک کۆمار بوو، دوو سەرکردەی کوردی کوردستانی ڕۆژهەڵات تیرۆر کران: دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسلوو لە ڤییێنای پایتەختی نەمسا لە ١٩٨٩شەهید کرا و دکتۆر سادقی شەرەفکەندییش لە بەرلینی پایتەختی جەرمانستان لە ١٩٩٢دا تێرۆر کرا. کە ڕەفسەنجانی لە ١٩٩٣، دووبارە خۆی بۆ سەرۆک کۆمار کاندید کردەوە، کوردستان تاکە ئوستان بوو کە ڕەفسەنجانی نەیتوانی زۆرینەی دەنگی لێ وەدەست بێنێ.

دەبێ ئەوەشی بۆ تۆمار بکەین کە لە سەردەمی سەرۆکایەتی ئەودا بوو، لە دوای ئەوەی کە ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١، شکستی هێنا، ئێران پێشوازیی لە پتر لە ١,٥ ملیۆن پەناهەندەی کوردی کوردستانی باشوور کرد. ڕەفسەنجانی ڕەخنەی زۆری ئاراستەی وڵاتانی ڕۆژئاوا کرد، چونکە زوو بەهانای پەنابەرانی کوردەوە نەهاتن. لە سەردەمی ڕەفسەنجانیش بوو کە ئێران، بە مەبەستی پارسەنگبوونی هێزی خۆی لەگەڵ تورکیا، یارمەتیی پارتی کرێکارانی کوردستانی دا. لە دوای ١٩٩١یش ئێران هەمیشە لەگەڵ تورکیا لە پێشبڕکێ دابووینە بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری حکوومەتی هەرێمی کوردستان وەر بدەن. بۆ چەند جارێک لەشکری ئێران خزاوەتە ناو خاکی هەرێمەوە، لە هەموو دەستتێوەردانەکانی دیارتر لە ١٩٩٦ بوو کە بۆ یارمەتیدانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دژی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، هێزی خۆی نارد.

**عەلی حەیدەر قەیتان (فواد)**. یەک لە ئەندامە سەرەتایی و سەرکردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو. قەیتان بۆ ماوەیەک لە ئەڵمانیا زیندانی کرا. لە ١٩٩٠کاندا ئەندامێکی پۆلیتبیرۆی «پ. ک. ک» بوو. پاشان بۆ ئەندامێتیی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی «پ. ک. ک» دەستنیشان کرا. لە دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە ١٩٩٩، ئەو ئەنجوومەنە کارەکانی سەرۆکی «پ. ک. ک»ی ڕادەپەڕاند. لە ١٩٩٦، قەیتان پۆستی سەرۆکی بارەگای سەرکردایەتیی ناوەندی

سەربازیی سوپای ڕزگاریخوازی گەلی کوردستانی وەرگرت و بارەگایەکە ڕەوانی باکوری عێراق کرا.

**عەلی عەسکەری (؟ – ١٩٧٨).** عەلی عەسکەری یەکێک لە سەرکردە هەرە کارامەکانی مەلا مستەفای بارزانی بوو. لە دوای ١٩٧٥، بووە سەرکردەیەکی دیاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. لەمیانی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە ١٩٧٨، عەلی عەسکەری لەلایەنی «پ. د. ک» گیرا و ئیعدام کرا. ئەم کردەوەیە تا ماوەیەکی زۆر سێبەرێکی تاری لەسەر پێوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان هەردوو پارتە کوردییە سەرەکییەکەی عێراق دەکرد.

**عەلی کیمیاوی (عەلی حەسەن مەجید) (١٩٤٠– ).** کابرایەکی ترسنۆک بوو؛ چونکە ئەگەر ترسنۆک نەبا، مرۆڤی بێدەسەلاتی نەدەکوشت، شاری هەڵەبجەی بە گازی ژاراوی بۆردومان نەدەکرد. عەلی کیمیاوی ئامۆزای سەدام حوسێنی بوو. سەدام دەسەلاتی بێهاوتا و بێ لێپرسینەوەی پێ دا بۆ ئەوەی شالاوەکانی ئەنفال دژی کورد جێبەجێ بکا و بێ بەزەیی کورد سەرکوت بکا. بۆ ئەوەی کارەکەشی بۆ ئاسان بکا، سەدام حوسێنی پسمامی، لە ٣ی ئاداری ١٩٨٧، عەلی کیمیاویی بە سکرتێری گشتیی مەکتەبی کاروباری باکور "مكتب شؤون الشمال" دامەزراند. دەسەلاتی سەرۆک کۆماری پێ دا. بەمجۆرە عەلی کیمیایی دەسەلاتی بەکارهێنانی گازی کیمیاویشی هەبوو. کە عەلی کیمیاوی دەسەلاتی سکرتێری کاروباری باکوری پێ درا، عێراق لە ناسکترین بارودۆخی شەڕی دژی ئێران دابوو. لەو دەمیش کورد بە هیچ شێوەیەک نەک هەر پشتیوانیی ڕژێمی سەدامیان نەکرد، بەڵکو بە توندی دژی ڕژێمەکەی وەستان و بەرگریان لە خاک و خوێنی خۆیان کرد.

هەر لە ١٩٨٧ـەوەڕا عەلی حەسەن مەجید گازی ژاراویی دژی گوندە کوردنشینەکانی باشووری کوردستان بەکار هێنا و دۆڵی بالیسانی گازباران کرد. کە زانیی ڕای گشتیی جیهانی پشتی لە کورد کردووە و وڵاتانی دراوسێش، لە ناخیانەوەڕا قەلاچۆکردنی کوردیان پێ خۆش بوو، ئەم کردەوە سەربازییە قێزەوەنەی نەبڕییەوە تا لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨، گەیاندییە بنکڕی تاوان و هەڵەبجەی کیمیاباران کرد. میدیا و حکوومەتی ئێران گازبارانی هەڵەبجەیان لە ڕژێمی بەعسی بەغداد لە

هەڵڵا دا. لەمیانی شالاوە پیسە سەربازییەکەی ئەنفال بوو، هەڵەبجە کیمیاباران کرا. ئەنفال یان (پاتاری شەڕ) لە سوورەتێکی قورئان وەرگیراوە کە تالانی دوژمن حەلاڵ دەکا و مرۆڤەکانیشی بە کۆیلە قبووڵە. ئەنفالەکەی عەلی کیمیاوی کردەیەکی جینۆساید بوو دژی گەلی کوردستان ئەنجامی دا. لەو کردەوە سەربازییە کۆمەڵکوژەدا، کیمیاوی، بۆ ئەوەی گوندەکانی کورد خاپوور بکا، سیاسەتی خاکی سووتاوی پەیڕەو کرد و لادێیەکانی لە دانیشتوانەکانی چۆل کرد و زۆرینەی دانیشتوانەکانیانی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا بە زیندوویێتی ناشتن. لەمیانی تۆمارێکی دەنگیدا، کە عەلی کیمیاوی بە زمانێکی عەرەبیی جلفی خێڵەکیی ناشیرین قسە دەکا، شانازی بەوە دەکا کە بە سەدان کوردی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا شاردووەتەوە و جنێو بە ڕای گشتیی جیهانی دەدا و بێ هیچ بایەخ پێدانێک سووکایەتی بە هەموو ئەو دەوڵەتانە دەکا کە ڕەنگە ئەگەر هەر بە قسەش بێ بە هاواری کوردەوە بێن و نەفرەتیان بۆ دەنێرێ.

لە دوای ئازادکردنی بەغداد لە ۹ی نیسانی ۲۰۰۳، عەلی کیمیاوی ڕای کرد و خۆی شاردەوە تا لە ۲۱ی ئابی ۲۰۰۳ بە زیندوویێتی و بێ شەڕ دەستگیر کرا، ئەمەش قسەکەی سەرەوە دەسەلمێنێ کە جانەوەرێکی ترسنۆک بووە.

کیمیاوی پێنجەم ناو بوو لەسەر ئەو دەستە کارتەی قومار کە سوپای ئەمەریکی لە دوای داگیرکردنی عێراق بڵاوی کردەوە بۆ ئەوەی دەستگیر بکرێن.

دادگایی کردنی عەلی کیمیاوی بە تاوانی کۆمەڵکوژیی ئەنفال، لە ۸ی یەنایری ۲۰۰۷ دەستی پێ کرد و لە ۱۱ی یەنایری ۲۰۰۷، لە پێش دادگای باڵای تاوان، دانی بەوەدا نا کە لە ڕۆژانی ئەنفال خۆی فەرمانی چۆڵکردنی گوندەکانی کوردانی لە هەرێمی کوردستان داوە و لە ۲۳ی یەنایریش دانی بەوەش دانا کە فەرمانی ئیعدامکردنی ئەو کەسانەی داوە کە لە "المناطق المحرمە" واتا لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا دەگیرێن. لە سەرەتای مانگی نیسانی ۲۰۰۷، داواکاری گشتیی دادگای باڵای تاوان لە دادگای خواست عەلی حەسن مەجید لە سێدارە بدرێ.

**عەباسی مامەند ئاغا.** سەیری (هەباسی مامەند ئاغا) بکە.

**عەلەوییەکان**. چینە خەڵکێکن لە تورکیا، پەیڕەوی جۆرە ڕێبازێک دەکەن کە لە ئاینی ئیسلام پەیدا بووە. کەچی هەنە دەڵێن، ئەم ڕێبازە هیچی بە سەر ئیسلامەتییەوە نییە. بە ناوی قزڵباش، واتە کڵاو سوورەکان، دەناسرێن، ئەم ناوەشیان لەوە هاتووە کە هەر لە کۆنەوەڕا کڵاوی سووریان لەسەر ناوە. بیر و باوەڕی عەلەوییەکان ئاوێتە بیرێکی بەر لە ئیسلام و زەردەشتی و شامانەکانی تورکمان و شیعەکانیش لە خۆ دەگرێ. عەلەوییەکان زۆر بیر و باوەڕیان لەگەڵ ئەهلی هەق وەک یەکن. بۆ نموونە؛ وەک شیعەکان ڕێزی تایبەت لە عەلی زاوای پێغەمبەر دەگرن. ئەم جۆرە ئاینە، گەلێ جار وەک ئاینی ئێزیدی، بە ئاینی فریشتەکان ناوزەد دەکرێ.

(جەم) پیرۆزترین پەرستگای عەلەوی و ئەهلی هەقە و بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم جۆرە خواپەرستییەش لە مزگەوت کۆ دەبنەوە. هەردوو لایەنیش بە مەلایەکانیان دەڵێن "پیر". جاروبار موسڵمانە دیندارەکان ئەم عەلەوییانە بە ڕەگەزتێکەڵی Pro-miscuityگومانبار دەکەن؛ ئەمەش لە تێگەیشتنێکی خراپ سەری هەڵداوە کە گوایا لە ئاهەنگ و بۆنە ئاینییەکانیاندا مۆم دەکوژێننەوە و پاشان ژنەکانیان دەگۆڕنەوە.

مێژوو دەڵێ؛ لە سەدەی ١٦دا کە شا ئیسماعیلی سەفەوی هاتە سەر عوسمانییەکان، ئەو قزڵباشانە پشتیوانیی شا ئیسماعیلیان کرد و بەشێکی زۆری لەشکرەکەی شا ئیسماعیل لەوان پێک هاتبوو. هەر ئەوەبوو وای کرد کە عوسمانییە سوننەکان ئەو قزڵباشانە بە دوژمنی هەرە سەرسەختی خۆیان بزانن و لە دوای سەرکەوتنیان لە شەڕی چاڵدیران لە ١٥١٤، ٤٠,٠٠٠ کەسێکیان لێ بکوژن. بەڵام قزڵباشەکان مانەوە و ئێستاش لانیکەم ١٠ لە سەدی سەرجەم دانیشتوانی تورکیا عەلەوینە؛ کەچێ هەندێ لایەن ئەو ڕێژەیە تا ٣٠ لە سەدی بەرز دەکەنەوە.

لە تورکیای ئەمڕۆدا ناتۆرەی قزڵباش بە پەسند نازاندرێ. گەلێ جار سوننەکان عەلەوییەکان دەچەوسێننەوە، بۆیە عەلەوییەکان هەمیشە مەیلێکی لیبراڵییان هەیە. قزڵباشەکان بەشێکبوون لەو هۆیانەی ئەو یاخیبوونە کوشندەیەیان لە ڕۆژی کریسمەسی ١٩٧٨ لە قارەمان مەرەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بەرپا کرد. چەند سەد کەسێک لەو ئاژاوەدا کوژران. زۆربەی ئەوانەی لە تورکیا بە زازا دەدوێن،

عەلەوینە و زۆرینەی دانیشتوانی هەرێمی دەرسیم پێک دێن، ئێستا پێی یێژن تونجەلی. کوردە عەلەوییەکانی تورکیا، کەمینەی ناو کەمینەنە.

**عەنەزییەکان.** بنەماڵەیەکی کوردبوون لە ٩١١ تا ١١١٧ لە ناوچەی سەر سنووری ئێستای ئێران-عێراق گەشەیان کرد. ئەو عەنەزییانە لە سەردەمی بوەیهییەکان بوون. ئەبولفەتح حەمەد بن عەنەز، بنەماڵەکەی دامەزراند و لە ناوچەی هەڵەوان لەسەر دەشتەکانی ئێران حوکمی کرد. زۆری ناو و ناتۆرەی عەرەبی لە ناو عەنەزییەکان ئەوە نیشان دەدا کە ئەو بنەماڵەیە پێوەندیی زۆر خۆشیان لەگەڵ عەرەباندا هەبووە.

**عوسمان ئۆجەلان (فەرهاد).** بچووکترینی هەر شەش برایەکانی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانە. ئەمەشیان ماوەیەکی درێژە پلەی سەرکردەکانی «پ. ک. ک» هەیە. دەستێکی باڵای لە ڕێکخراوی گەریلا (لەشکری ئازادیخوازی گەلی کورد)دا هەیە. ئەم لەشکرە ناوی گۆڕا؛ ئێستا ناوی (هێزی پاراستنی گەل)ە.

چەند ساڵ عوسمان ئۆجەلان چالاکییەکانی خۆی لە کوردستانی باشوور و لە کوردستانی ڕۆژهەڵات ئەنجام دەدا. ناوی بەوە دەرکردووە کە سەرکردەیەکی ئازای گەریلایە و وەک ئۆجەلانی برا گەورەی تێکەولێکەی ئاڵۆز ناکا. لە دوای ئەوەی گەریلاکانی لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢، پەلاماری هێزی پێشمەرگەی کوردستانیان دا و پەلامارەکانی هەرەسیان هێنا، عوسمان ئۆجەلان دەسەڵاتی جارانی لە دەست دا. لە دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩ی ئایاری ١٩٩٢و پێکهێنانی یەکەم ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان؛ جەماوەری کوردستانی چاوەڕێی ئەوە بوو کە «پ. ک. ک» پشتیوانی لەو دەسەڵاتە کوردییە ساوایە بکا نەک پەلاماری بدا. پاشان، عوسمان ئۆجەلان سەرکردایەتیی گەریلای لە کامپی زەڵێ، لە کوردستانی باشووردا، کرد. لە هاوینی ١٩٩٦، عوسمان ئۆجەلان ئامادەی ئاهەنگی ساڵیادی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی بوو.

لە دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە شوباتی ١٩٩٩، عوسمان ئۆجەلان بە یەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی «پ. ک. ک» دەستنیشان کرا. ئەم

ئەنجوومەنە ئەرکەکانی سەرۆکی «پ. ک. ک» ڕادەپەڕێنێ. کە عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەستگیر کرا، عوسمان ئۆجەلان داوای کرد بە توندی وەڵامی ئەو کردەوەیەی تورکیا بدرێتەوە، بەڵام پاشان هاتە ڕیزی ئەوانەی داوای بە ئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیادا دەکەن. تا ٢٠٠٧، کە کاتی وەرگێڕانی ئەم کتێبەیە، عوسمان ئۆجەلان هەر یەکێک لە سەرکردەکانی کۆنگرا دیموکراسی و ئازادییا کوردستانێ (کادیک) بوو.

**عەشیرەت.** سەیری (خێڵ) بکە.

**عیسمەت ئینۆنۆ (١٨٨٤– ١٩٧٣).** گەورە ئەفسەری مستەفا کەمال ئەتاتورک بوو. لە دوای مردنی ئەتاتورک لە ١٩٣٨ عیسمەت ئینۆنۆ بووە سەرۆک کۆماری تورکیا. هەندێک دەڵێن ئینۆنۆ بە ڕەچەڵەک کورد بووە.

لە سەرەتادا ئینۆنۆ هەڵوێستێکی ئەرێنی سەبارەت بە کێشەی کورد هەبوو، ئاشکرای کرد کە تورکیای نوێ وڵاتی تورک و کورد بوو. بەڵام کە لە تەمووزی ١٩٢٣، سەرۆکایەتیی شاندی تورکیای لە دانوستانی پەیماننامەی لۆزاندا کرد، بە هیچ جۆرێک ناوی کوردی نەهێنا. لە دوای شۆڕشەکەی شێخ سەعیدیش، لە ١٩٢٥، ئینۆنۆ جاڕی دا کە تەنیا تورک دەتوانێ خۆی بە ڕەگەز بناسێ و مافی نەتەوەیی لەم وڵاتەدا هەیە. هیچ کەسێکی دیکە ئەم جۆرە مافانەیان نییە. کە ئینۆنۆ پۆستی سەرۆک وەزیرانی ئەتاتورکی وەرگرت، چەند کردەیەکی دڕندانەی لە شێوەی دادگاکانی سەربەخۆیی ئەنجام دا بۆ ئەوەی هەرچی شۆڕشوان و پشتیوانێکیان هەبوو، هەموویان بە خێرایی ئیعدام بکا و نەیان هێڵێ.

لە ١٩٥٠، ئینۆنۆ ڕێگەی دا بۆ یەکەم جار هەڵبژاردن لە تورکیادا بکرێ و ئەوە بوو خۆی هەڵبژاردنەکەی دۆڕاند و لە دەسەڵات دەرکرا. لە دوای کودەتایە سەربازییەکەی لە ١٩٦٠ کرا، لە ١٩٦١ تا ١٩٦٥، ئینۆنۆ دووبارە دەسەڵاتی وەرگرتەوە. کوڕە گەورەکەی بە ناوی ئێردالٚ ئینۆنۆ، کە چەپڕەوێکی ناسراو بوو، لە ١٩٨٠کاندا، سەرۆکایەتیی کابینەیەکی کاتیی پێش لە خانەنشینبوونی بۆ ماوەیەکی کورت، وەرگرت.

**عیسمەت عیسمەت (١٩٥٩-      )**. ڕۆژنامەنووسێکی ناسراوی تورکە، ناوبانگی بەو لێکۆڵینەوە وردە بێ لایەنانە دەرکرد کە لە ١٩٨٠کانەوەڕا تا ناوەڕاستی ١٩٩٠ـەکان، دەربارەی پارتی کرێکارانی کوردستان بڵاوی دەکردەوە و پاشان لەبن فشاری حکوومەت ناچار بوو خانەنشین بێ. ڕاپۆرتەکانی بە زمانی ئینگلیزی لە Briefingو لە Turkish Daily Newsبڵاو دەکردەوە. پاشان لە ١٩٩٢، ڕاپۆرتەکانی لە کتێبێکدا بە ناوی «پ. ک. ک»: ڕاپۆرتێک دەربارەی بزووتنەوەی توندوتیژی جوداخوازان لە تورکیا لە نێوان سالانی (١٩٧٣- ١٩٩٢)دا، بڵاو کردەوە.

## غ

**غوللات**، ئەو کوردە شیعانەن کە لەبەر بیر و بۆچوونی فرە توندڕەوانەیان گەلێ کەس پێیان وایە کە ئیسلام نینە. سەیری (ئەهلی هەقەکان؛ عەلەوییەکان؛ ڕێبازی فریشتەکان؛ کاکەیی؛ سارەلوو؛ شەبەک؛ ئێزیدییەکان) بکە.

## ف

**فـاتمه سـاهیدال (١٩٧٥- ٢٠٠٢).** یەکـەم کـچـی کوردی پەنـاهەندە بوو کـە لە تۆڕی کولتووری کۆنی ژیانی کوردەواری یاخی بوو. بە قسەی باوکی نەکرد و شووی نەکرد و ڕەدووی کوڕەدۆستـەکەی خـۆی کـەوت. باوکیشی کوشـتی. ئەم کرداره لە ڕۆژئاوا کـاریکی زۆر قێزەوەنه و زیـانیکی زۆریشی بە ناوبەرزیی کـورد لە تاراوگـەدا گـەیاند. فاتیمه لە ئۆپسالای سوید بە دەستی باوکی کوژرا.

**فـایق بوجـاک (؟ - ١٩٦٦).** پارێزەرێکی کوردی تورکیـای خـەڵکی ئورفـا بووه و سـەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تـورکیـا بووه. فـایق بوجـاک لە ١٩٦٦ تیرۆر کراوه (ڕەنگه سیـخوڕەکانی پۆلیس کوشتبێتیان) پارتەکـەشی بووه دوو بەشـی دژی یەکتر. هـەردووکیـشـیان بۆ کـوردسـتـانی عێـراق ڕایان کـرد و لەوێش لە بارودۆخـێکی تەمـاویدا هـەردوو سەرکردەی هـەردوو باڵەکان (د. شڤـان «سـەعید قرمزی تۆپراخ» و سـەعید ئەڵچی) کوژران و ڕێکخـراوەکانیشـیان هەڵوەشانـەوه. هـەندێک دەڵێن دادگای شۆڕشـی ئەیلوول فـەرمـانی کوشـتنی شڤـانـی دا، چونکه ئەڵچیی کوشـتبوو. کـەچی هێندێک هەنه دەڵێن کـه "میللی ئیسـتـخـبـارات تەشکیـلاتی- مـیت" واتا دەزگـای هـەواڵگری نەتەوەیی تورکی دەستی لە کوشتنی ئەڵچیدا هـەبووه.

**فـورسـان سـەلاحـەدین.** سـوارەکـانی سـەلاحـەدین، یان ئەفـواجی خـەفـیفـەیان پێ دەگوتن. ئەمانه هێزی سەربازیی خێڵه کوردەکان بوون کە دژی مەلا مستەفا بارزانـی بوون. ئەمانه پاشـتر بە جاش (واته بێچوه کـەر) دەناسران. بەم چەشنه ئەو جـاشانه هـەمـان ئەو ڕۆڵەیان دەگێڕا کە فـورسـانی حـەمیدییـه لە سـەردەمی ئیمپـراتۆریەتی عوسـمانی گێڕایان و لە کاتی شـەڕی تورکیاش دژی پارتی کرێکارانی کوردسـتان لە ١٩٨٠ کانەوه تا ١٩٩٠ـەکان، پاسەوانەکانی گوند هـەمان ملهوڕییان کرد.

**فرەنسا.** لەمیانی سـاڵانی دواتر، فرەنسا شان بـەشانی بەریتانیای مەزن و ڕووسیا لە هـەر هـەمـوو وڵاتـانی تری ئەورووپا کـاریگەریی فـرەتری لەسـەر کـێشـەی کـورد هـەبووه. بە گوێرەی ڕێککـەوتنەکەی سایکس-پیکۆ، لە دوای شـەڕی یەکەمی جیهـانی،

فرەنسا دەستی بەسەر سووریا داگرت و لەم ڕێگەیەوە کاری بەسەر کوردەوە هەبوو. پێش شەڕی کەنداوی ١٩٩١یش، فرەنسا لە ئاستی هەموو دنیادا، ناوبانگی بەوە دەرکرد کە گەورەترین عەمباری چەکی ڕۆژئاوای عێراق بوو. لە هەر هەمان کاتیشدا، خانمی دانیال میتران، خێزانی سەرۆکی فرەنسا، فرانسوا میتران، ناودارترین و بەپشووترین کەس بوو کە بەرگریی لە کێشەی کورد دەکرد. ئەم خانمە لە ١٩٨٢، یارمەتیی لە دامەزراندنی ئینستیوتی کوردی لە پاریس کرد. لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١یش، فرەنسا پێشەنگی ئەو وڵاتانە بوو کە پشتیوانییان لە پرۆسەی پرۆڤاید کۆمفورت کرد و ناوچەی دژە فڕینیان لە باکوری عێراق پاراست. بەڵام لە ١٩٩٧، فرەنسا لە ئۆپەراسیۆنەکە پاشگەز بووەوە و بە ڕشتی پشتیوانیی لە لادانی سزا ئابوورییەکانی سەر عێراق دەکرد. هەرچەندە فرەنسا لە ١٩٩٣وەڕا چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانی قەدەغە کرد، بەڵام هێشتا «پ. ک. ک» لە پەنای چەندین ڕێکخراوەوە، چالاکانە کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا. پتر لە ٦٠,٠٠٠ کورد ئێستا لە فرەنسا دەژی.

**فەتحوڵڵا گولەن (١٩٣٨–    )**. سەیری (نوور جوولوک) بکە.

**فەدلەوییە.** ئەو بنەماڵە کوردە بوو کە حوکمی بوەیهییەکانی لە ١٠٥٥ بڕییەوە و پاشتر لە ١٠٥٦ڕا تا ١٣١٨، شوانکارەیان حوکم کرد. ئەو بەرەبابە بە ناوی باوە گەورەیانەوە هەڵدەدران. بنەماڵەی موزەفەڕ ئەم بنەماڵەیان لەناو برد.

**فەرەنسۆ هەریری (١٩٣٧– ٢٠٠١)**. ئەندامێکی کریستیانی باڵادەستی پۆلیتبیرۆی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. لە ١٨ شوباتی ٢٠٠١، بە دەستی گرووپی ئیسلامیی توندڕۆی تەوحیدی باکوری عێراق کوژرا. هەریری پارێزگاری هەولێر و وەزیری حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش بووە و هەموو ژیانی خۆی لە خەباتی لە پێناوی ڕزگاریی گەلەکەی بەسەر بردووە.

**فەلە.** سەیری (کریستیانەکان) بکە.

**فەیلی.** سەیری (کوردی فەیلی) بکە.

**فوئاد مەعسوم.** گەورە ئەندامێکی پۆلیتبیرۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و

ئیسلامییەکی عیلمانییە. دکتۆر فوئاد مەعسووم شەرەفی یەکەم سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستانی پێ برا، کە لە دوای هەڵبژاردنەکانی ١٩ی ئایاری ١٩٩٢ لە کوردستان پێک هات. دکتۆر فوئاد مەعسووم سیاسی و تەکنۆکرات و کوڕە مەلایە. لە ئاداری ١٩٩٣، لە پۆستی سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕیزشک resign ی کرد و لەدوای ئەو کۆسرەت ڕەسوڵ پۆستەکەی وەرگرت.

لە شەڕی ناوخۆ، لە ١٩٩٦، دکتۆر فوئاد مەعسووم هاوڕێ لەگەڵ هێرۆخانی خێزانی جەلال تاڵەبانی، بە دیلی گیران. سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، مەسعوود بارزانی، وەک میوان زۆر بەڕێزەوە هەردووکی وەرگرتەوە و پاشان بۆ ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ڕەوانکردنەوە.

دکتۆر فوئاد مەعسووم لە دوای ڕووخانی سەدام لە ٢٠٠٣، لەسەر لیستی هاوپەیمانیی کوردستان، کورسییەکی ئەندامی پەرلەمانی عێراقی لە بری کوردەکانی بەغداد وەرگرت و ئەندامێکی لێژنەی دارشتنی دەستووری عێراقی بوو. هەموو چین و توێژە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان، ڕێزی تایبەتی لەو جوامێرە دەگرن.

## ڤ

**ڤلادیمێر مینۆرسکی (١٨٧٧– ١٩٦٦).** ناودارترین نووسەری ڕووسە کە دەربارەی کوردی نووسیبێ. هەرچەندە مینۆرسکی ماوەیەکی زۆرە گیان ئافەرینی لێمان کردووە، بەڵام تا ئێستاش نووسینەکانی دەربارەی کورد، بە متمانەترین بەرهەم لەم بوارەدا دەناسرێن. مینۆرسکی شایستە کە هەموو کوردێکی ڕووناکبیر دەربارەیەوە بزانێ و ڕێز لە یادگاری و نووسین و لەو خزمەتە گەورانە بگرێ کە پێشکێشی کوردی کردوون.

ڤلادیمێر مینۆرسکی لە١٩٠٠ لە زانکۆی مۆسکۆ دەرچووە و پاشان لە پەیمانگەی ناوداری لازاریڤی تایبەت بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە مۆسکۆ، بۆ ماوەی سێ ساڵی خوێندووە. لە ١٩٠٣، لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕووسیا دامەزراوە و ئینجا لە وڵاتی فارس و تورکستان و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کاری کردووە. هاوکات لەگەڵ کارەکانی دیکەی، لە ١٩١١، لە ئێران هاوشان لەگەڵ ئارنۆڵد ویلسنی نوێنەری بەریتانیای گەورە لە ئێران، سیخوڕییان کردووە و بەدووقۆڵی سنووری دەوڵەتی عوسمانی– ئێرانییان دەستنیشان کردووە.

کە کۆمۆنیستەکان دەسەڵاتی شۆرەوییان وەرگرت. مینۆرسکی ناچار بوو وڵات بەجێ بێڵێ و لە فەرەنسا وەک پرۆفیسۆرێک و پاشان لە بەریتانیا کاری کرد. لە ١٩٣٢، لەگەڵ قوتابخانەی ڕۆژهەڵات و توێژینەوەکانی ئەفریقیا، School of Oriental and African Studies لە زانکۆی لەندەن، دەستی بەکار کرد. ژمارەیەک کتێبی مینۆرسکی لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا سوودیان لێ وەرگیراوە.

**ڤەژین.** سەیری (حوسێن یڵدرم) بکە.

## ق

**قادری.** هاوکات لەگەڵ ڕێبازی نەقشبەندی دوو تەریقەتی دەروێشان لە کوردستان پێک دێنن. تەریقەتی قادری ناوی لە شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧-١١٦٦) وەرگرتووە. شێخ عەبدولقادری گەیلانی ناودارترین شێخە لە ناو موسڵمانان، گۆڕ و گومەتەکەی لە گەڕەکی بابولشێخ لە بەغدادایە. هەرچەندە تەریقەتەکە بەناوی ئەوەوە کراوە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، شێخ عەبدولقادری گەیلانی هیچ پێوەندییەکی بە دامەزرانی ئەو ڕێبازەوە نییە. پاشتر بۆیە ئەو ناوەی بۆ هەڵبژاردراوە تا خەڵکی پەسندی بکەن و بەدوای بکەون؛ ئەم دیاردەیە لە ناو موسڵمانانداﺍ زۆر باو بووە.

دەڵێن سەید مووسا و سەید عیسا، کە دوو برا بوونە، لە ١٣٦٠، ئەم تەریقەتەیان لە کوردستانی باشوور داهێناوە و تا سەرەتای سەدەی ١٩ لە هەموو گۆڕەپانی کوردستان تاقە ڕێبازێکی سۆفیی بووە کە مریدی هەبووبێ. ناودارترین شێخەکانی قادری، لە سەدەی ١٩م، بەرزنجییەکان و سەیدەکانی نەهری و شێخەکانی تاڵەبان بوونە. هەرسێ خانەوادە، لە پەنای شێخایەتییەکەیانەوە داراییەکی زۆریان بۆ خۆیان گرد داوە. شێخ مەحموود بەرزنجی و جەلال تاڵەبانی دوو کەسایەتیی هەرە ناسراون کە لە بنەچەدا شێخی تەریقەتی قادری بوونە.

لە سەرەتای سەدەی ١٩م، مەولانا خالید لە هیندستان گەڕاوە و ڕێبازی نەقشبەندی لەگەڵ خۆی هێنابوو. مەولانا خالد خواپەرستێکی زۆر بە ناوودەنگ بوو، ڕێزی تایبەتی لە ناو خەڵکیدا هەبوو، بۆیە، هەر زوو بەزوو توانیی ڕێبازە تازەکەی خۆی بەناو خەڵکیدا بڵاو بکاتەوە و بەمەش تاڕادەیەکی زۆر جێی ڕێبازی قادریی گرتەوە و لاوازی کرد، ئەمەش چەند هۆیەکی هەبوو. سەیدەکانی نەهری و شێخەکانی بارزان ڕێبازی نەقشبەندییان هەڵبژارد و پەیڕەویان کرد. بەڵام یەک لەو هۆیانەی کە ڕێیان لە شێخ مەحموود گرت و نەیتوانی کورد هەموو یەک بکا، بۆ ئەوەی لە ١٩٢٠ـەکاندا، بە مەلیکی کوردستانی بزانن و پشتیوانیی بکەن ئەوە بوو کە زۆرینەی دانیشتوانی کەرکووک لایەنی شێخەکانی تاڵەبانیان گرت کە بەپێچەوانەی شێخ مەحموودی حەفید، ئەمانە بە دوای ڕێبازی قادری کەوتبوون. لەم سەردەمەش

شێخەکانی تاڵەبان هەر قادرینە و شێخەکانی بارزانیش تا ئێستاش نەقشبەندین.

قادرییەکان لە کاتی زیکر و تەهلیلەکردنیاندا حاڵ دەیانگرێ، واتە دەبوورێنەوە و لە هۆشی خۆیان دەچن. نەقشبەندی ئەمەیان نییە. هەندێ لە دەروێشەکان "ئیجازە"یان پێ دەدرێ، ئەوانە دەتوانن زەرگ و تیر و شتی تیژ لە جەستەی خۆیان ڕابکەن. نەقشبەندی ئەمەشیان نییە. ناوە ناوە یان خەلیفەکە یان شێخ بە خۆی بە دەنگێکی بەرز بانگ شادە دێنێ و دەڵێ: "لا إله إلا الله" واتە "لە خوا بترازێ هیچ خوایەکی دیکە نییە" و پاشان تەپڵ لێ دەدرێ و ئیتر حای و حوو و جەستە ڕاهەژاندنی توند دەست پێ دەکا و جەمانە و کەشیدە و مشکی لەسەر دەکرێتەوە و دەروێشان قژە درێژەکانیان دەکەنەوە و بە هەموو هێز و توانای خۆیان لەگەڵ (حەی ئەڵڵا) کردن سەریان ڕادەهەژێنن. کەسانێکی تر خۆیان وەبەر چەقۆ و شیر و زەرگ دەدەن و هەموو جەستەی خۆیان کون کون دەکەن. هەندێک شووشە دەجوون و قووتی دەدەن، ژار فڕ دەکەن، وایەری ڕووتی کارەبا بەدەستیانەوە دەگرن. سەیرە...هیچیشیان لێ نایێت!

دەروێشەکان باوەڕیان وایە کە شێخەکەیان بە "کەرامات"ی خۆی دەیانپارێزێ و ناهێڵێ ئازاریان پێ بگات، ئەمەش لە (بەرەکەتی) شێخ عەبدولقادری گەیلانییە و بۆ شێخەکەیان هاتووە. ئەو جۆرە زیکرکردن و حاڵگرتن و خۆ وەبەر شمشێر و زەرگ دانە، بێ ئەوەی هیچ ئازارێکیان بگاتێ، بۆ ئەوە دەکرێ تا بە دیاری بخەن کە ئیسلام ئاینێکی ڕاستەقینەیە و خوا پشتیوانی ئەوانە دەکا کە دەیپەرستن. لە لایەکی تریشەوە ئەو دەروێشە قادرییەی کە ئەم جۆرە کارانەش ئەنجام دەدا، دەڵێ بۆ ئەوەیە کە بزانن باوەڕی بە خودا هەیە و تەریقەتی قادرییش بە ڕاست دەزانێ و بەم جۆرەش پایەی ڕوحی خۆی لە ناو خەڵکیدا دەسەلمێنێ.

**قازی محەمەد (١٨٩٨– ١٩٤٧).** سەرکردەی ڕێزدار و سەرۆکی کۆماری کوردستان، پێشەوا قازی محەمەد لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی، کۆماری کوردستانی لە مەهاباد جاڕ دا. قازی محەمەد پیاوێکی زانا و سەرکردەیەکی ئاینی فرە خۆشەویست بوو. پێشەوا قازی هی ناوچەی مەهاباد بوو. براگەورەی ناوداری بنەماڵەیەکی گرینگی مەهاباد و فەرمانڕەوای دیفاکتۆی ناوچەکەش بوو.

سەرۆک کۆمار، بەڕێوەبەرایەتییەکی کارامەی هەبوو؛ پەروەردەی کردە ئەرکێک کە

دەبوو هەموو کەسێک بخوێنێ. قازی محەمەد هانی میدیا و چاپ و بڵاوکردنەوەی دا و ڕادیۆیەکی نیشتمانیشی دامەزراند. جوامێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دوژمنەکانیدا کرد و بە نیازپاکییەوە دانوستانی لەگەڵ حکوومەتی ئێران کرد. لە ڕاستیدا ڕووبەری کۆماری کوردستان لە دەوروبەری شاری مەهاباد پتر نەدەچوو، بەڵام کاریگەرییە مێژووییەکەی هەمیشەییە و ناشێ ببڕێتەوە. دووبەرەکیی ناو کورد خۆیان لە دەوری قازیش ڕەنگی داوە و باری ئابووریش زۆر شڕ بوو. سۆڤیەتییەکان فشاری نێودەوڵەتیی زۆریان لەسەر بوو بۆ ئەوەی چیتر یارمەتیی کۆماری کوردستان نەدەن. لە لایەکی تریشەوە ئێران نەوتی پێی نیشان دا، ئیتر سۆڤیەتییەکان هەموو یارمەتییەکان لە کۆماری کوردستان بڕی و پاشتر ئێران بە ئاسانی توانیی دووبارە کوردستان داگیر بکاتەوە و کۆمارەکە لەناو بباو لە ٣١ ئاداری ١٩٤٧یش پێشەوا قازی محەمەدی لە سێدارە دا.

مەلا مستەفا بارزانی بە هانای کۆماری کوردستانەوە چوو؛ قازی پلەی ژەنراڵیشی پێ دا. ئەگەر قازی محەمەد بە گوێی مەلا مستەفا بارزانی بکردایە، خۆی بە دەستی شای ئێرانەوە نەدەدا و لەگەڵ لەشکری بارزانیان بەرەو سۆڤیەت دەچوو و لەوێ وەک ئومێدێک بۆ گەلی کورد هەر دەما.

**قاسملوو.** سەیری "عەبدولرەحمان قاسملوو" بکە.

**قاڵی.** سەیری (مافوور) بکە.

**قزڵباش.** سەیری "عەلەوییەکان" بکە.

**قەرە قۆینلوو.** سەیری "ئاق قۆینلوو" بکە.

**قەرەسوو.** سەیری "مستەفا قەرەسوو" بکە.

**قەرەیلان.** سەیری "موراد قەریلان" بکە.

**قەڵای کرەک.** قەڵاتێکی سەربازیی گەورەیە، لە سووریا لە شاخەکانی عەلەوییەکانی نێوان حومس و تەرتوسە. فەرەنگە خاچپەرستەکان ئەو قەڵاتەیان گەورە کرد و ئەو ناوەیان لێی ناو کردیانە بارەگای خۆیان.

بە عەرەبی پێی دەڵێن "حصن الأکراد" واتە قەڵاتی کوردان. ڕەنگە کرەک خراپکراوی "أکراد"ی عەرەبی بێ، یان ڕەنگە هەر کورد بێ. ناوەکە ڕەنگە ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە پێشان کوردێکی زۆر لەم ناوچانەدا هەبووبن.

## ک

**کاردۆخییەکان.** زێنەفۆنی سەرکردە و مێژوونووسی یۆنانی لە کتێبی ئاناباسیس Anabasis باسی کاردۆخییان دەکا و دەڵێ گەلێکی سەربەخۆبوون، لە چیاکانی زاگرۆس دەژیان. لە ٤٠١ی پ.ز.، لەشکرە دە هەزارییەکەی زێنەفۆن سەرکردایەتیی دەکرد، لە کاتی پاشەکشەکردنی لە شاخەکانی وڵاتی کاردۆخییاندا کەوتن و لەوێ کاردۆخییەکان فرە دەردەسەریی گریکەکانیان دا و فرە زیانیشیان لێ دان. زۆربەی زانایە مێژوونووسەکان دەڵێن کاردۆخییەکان باپیرە گەورەی کوردن. سەیری کتێبی (دە هەزارەکە) بکە، ئەویش لە وەرگێڕانی وەرگێڕی ئەم کتێبەیە.

**کاکەییەکان.** زۆر لە عێراقییەکان بە پەیڕەوکارانی ئاینی "ئەهلی هەق" دەڵێن کاکەیی. سەیری (غوللات) بکە.

**کاڵکان.** سەیری "دوران کاڵکان" بکە.

**کامپی مەسعوود کورکماز.** کامپێکی گرینگی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو، لە دۆڵی بیقاع لە لبنان و لە سنووری سووریاوە نزیک بوو. سووریا ئەو کامپەی وەک هبوودییەک بۆ قایلکردنی دەسەڵاتدارانی تورک، پێشکێشی ئەنکارای کرد و لە ١٩٩٢ دای خست. ئەو کامپە بە ناوی مەسعوود کورکماز کرابوو؛ کورکماز یەکەم سەرکردەی لەشکری ئازادیی نەتەوەیی کوردستان بوو. ئەم لەشکرەش بەرەیەکی میللی «پ. ک. ک» بوو. هەرچەندە سووریا ئەو کامپەی داخست، بەڵام تا ئۆکتۆبەری ١٩٩٨، فەرماندارانی دیمەشق یارمەتییەکی زۆری پارتی کرێکارانی کوردستانیان دا. لە ١٩٩٨، تورک فشاری خۆیان لەسەر سووریا چڕوپڕتر کرد و حافز ئەسەدی سەرۆکی سووریاش، عەبدوڵڵا ئۆجەلان و گەریلاکانی لە وڵات وەدەرنا و پێوەندیی بە ڕێکخرای «پ. ک. ک» وە نەما.

**کامەران ئینان (١٩٢٩-      ).** کامەران ئینان سیاسەتوانێکی دیاری تورکی بە ڕەگەز کوردە. باوکی شێخێکی نەقشبەندی بوو نەفی کرابوو، دایکیشی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ڕزگار بووبوو. ئینان

دەرچووی زانکۆی جنێڤـە و دیپلۆمات بووە و مـاوەیەکی زۆریش ئەندامی پەرلەمـان بووە و لە ١٩٩٣، لە بەرانبەر سلێمان دیمیرێل پاڵێوراوی پۆستی سـەرۆکایەتی، بوو. زۆر بە پەرۆشـــەوە دژی جـێـبـەجـێکردنی پرۆژەی گـاپ بووە. بۆیە زۆر جــاران، حکوومـەتی تورکیـا ئاماژە بۆ کامـەران ئینان دەکا و وەک نموونەی بەڕەگەز کوردێک ناوی دێنێ کە توانیویەتی لە تورکیا بەرز بێتەوە.

**کانی خولام.** سەیری "تۆڕی زانیاریی کوردی ئەمریکی" بکە.

**کانی یەڵماز (فـەیسـەل دوملایجی).** کەسایەتییەکە زۆر دەڵێن سێیـەمین کەسایەتیی گرینگی ناو پارتی کرێکارانی کوردستـان بووە و تا دەسگیرکردن و زیندانی کردنی لە ١٩٩٤، لە بەریتانیا، بەرپرسی چالاکییەکانی «پ. ک. ک» بووە لە ئەوروپا. لە دوای ئازادکـردنی، دیسـان بۆ «پ. ک. ک» تێ هـەڵچـووەتەوە. گلەیی ئـەوە لە کـانی یەڵمـاز دەکرێ کـە لەو دەمـەی عەبدوڵڵا ئۆجـەلان لە ئەوروپا بوو، هێشـتا دەسـتگیر نەکرابوو، نەیتـوانی حـەشـارگـەیێکی بۆ پەیدا بکا. ئۆجـەلان لـە شوباتی ١٩٩٩دا گـیرا. پاشـتـر کانی یەڵماز دەسەڵاتی جارانی لە ناو ڕێکخراوەکەدا نەما.

**کاوە.** پارتێکی کوردیی توندوتیژی دژە سۆڤیەتی ماویست Maoist بوو. ئەو پارتە لە ١٩٧٠کـان و لە ١٩٨٠کـاندا لە باشـووری ڕۆژهـەڵاتـی تورکیا بۆ مـاوەی چەند سـاڵێک لەو کـردەوە توندوتیژانـەی کە دەیکرد پووشـی لە پشتی پارتی کرێکارانی کوردستـان بەسـتـا بوو. کـاوە بە نـاوی ئەو پاڵەوانە کـوردە ئەفسـانەییـیە کرابوو کە لە سـەردەمی ئیمپراتۆریەتی فـارسـی شۆڕشێکی دژی یەک لە دیکتاتۆرەکـان بەرپا کرد و ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕۆژی نەورۆزی سەری ساڵی کوردی یەکیان گرتەوە.

کاوە لە ١٩٧٦ بوو دامـەزرا، بەڵام پاش دوو ساڵ لە ناو خۆیدا لەسـەر مشـتومڕێکی دەربارەی بیـردۆزە (سـێ جـیــهــان)ەکـــەی چین، کـەرت بوو. لە دوای کـودەتـایە سەربازییەکەی ١٩٨٠ لەناو چوو.

**کرمانجی (بادینی).** یەکێکە لە دوو شێوەزارە سەرەکییەکەی کوردی؛ دیالەکتەکەی دیکەیان سۆرانییـە. هـەر یەک لە کرمـانجی و سۆرانی چەندین شێوەزاری لاوەکیی کوردیی دیکەی هەیە. دیالەکتـە لاوەکییـە گرینگەکـانی تری شێوەزاری کـرمـانجی ئەمانەن: بۆتانی و بایەزیدی و هەکاری و ئۆرفی و بادینیی ڕەوان.

لە تورکیا و سووریا و ناوچەی بادینان لە هەرێمی کوردستان لە عێراق و لە ناوچەی ورمێ و خوی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، لە ئێران و لە ئەرمەنیاو ئازەربایجان و جۆرجیا و سەرجەم وەڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران، لە هەموو ئەوانەدا کرمانجی شێوەزاری سەرەکییە. پتر لە ١٥ ملیۆن کورد بۆ پێوەندیکردنیان بەکاری دەبەن و ئەمەش نزیکەی نیوەی سەرژمێری گەلی کورد دەبێ.

لە هەوراز ٦ ملیۆن کەسیش بە دیالەکتی سۆرانی قسان دەکەن. ئەم شێوەزارە لە هەولێر و سلێمانی و کەرکووک و مەهاباد و مەریوان لە ئوستانی کوردستان لە ئێران بەکار دێ.

زازا (دیملی) و گۆرانی دوو شێوەزاری گرینگی دیکەی کوردینە. ژمارەی ئەوانەی قسەیان پێ دەکەن لە ژمارەی ئەوانیتر کەمترە. پتر لە ٤,٥ ملیۆن کورد دیالەکتی زازا بەکاردێنن. لە سەرەوەی ١,٥ ملیۆنێکیش شێوەزاری گۆرانی بەکار دێنن. زازا لە ئەوپەڕ سنووری باکوری ڕۆژئاوا بەکار دەهێندرێ و گۆرانیش لە ئەوپەڕ باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەبیسترێ.

کرمانجی و سۆرانی پێوەندییان بە چینە زمانەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێرانەوە هەیە؛ کەچی دیملی و گۆرانی دەچنەوە سەر گرووپە زمانەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئێرانەوە.

ئەو کوردانەی بە کرمانجی دەئاخێڤن ناتوانن بە ئاسانی لەگەڵ ئەوانەی بە سۆرانی قسە دەکەن لە یەکتری بگەن. هۆی ئەمەش ئەوەیە ک لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بە هۆی دابەشبوونی کوردستانەوە بە چڕی لە یەکتری جودا کراونەتەوە.

کرمانجی جیاوازیی لەگەڵ سۆرانی هەیە؛ کرمانجی نێرو مێ لێک دەکاتەوە، سۆرانیی نوێ ئەمەی نەماوە و هەردوو ڕەگەز بەیەک شێوە دەدوێنێ. ڕێزمانی زازا و گۆرانی لە ڕیزمانی کرمانجی و سۆرانی جودایە.

**کرماشان.** ناوی شارێک و ئوستانێکی ئێرانە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن. دانیشتوانەکەی ١,٥ ملیۆن دەبن و بە یەکسانی لە نێوان کوردی شیعە و سوننە و ئەهلی هەقدا دابەش بووینە. گۆرانی و فرە شێوەزاری دیکەی کوردی لەورە قسەیان پێ دەکرێ و زار کرماشانییان پێ یێژن. گەورە هۆزەکانی کرماشان بریتییە لە:

گۆران و کەلهوڕ و جاف و سنجابی. شوێنەوارەکانی کێوی بێستوون لە نزیکی ئەم شارەنە. نووسینە بزمارییەکانی cuneiform بێستوون کلیلی خوێندنەوەی تێگەیشتنی هەموو ئەو نووسینە بزمارەکیانەیە کە لە مێسۆپۆتامیادا دۆزراونەتەوە.

**کریستیانەکان.** (دیانەکان؛ فەلەکان). کەمینەی دێرینی کریستیانەکانن؛ لەگەڵ ئەو کوردانەدا بە یەکەوە دەژین کە هەر لەمێژەوە دەسەڵاتیان بەسەریاندا شکاوە. هەندێ جاران ئەو کریستیانانە لەگەڵ دراوسێیە موسڵمانەکانیان کەوتوونەتە ناکۆکییەوە و لەم سەردەمە نوێیانەدا فرەکەڕەت بە کۆڵەمی پێنجەم بەکار دەهێندرێن، بۆ ئەم مەبەستەش دەچن پێوەندی بە پارت و گرووپە سیاسییە لۆکاڵەکانەوە دەکەن و کار بۆ ئیمپریالیستە ڕۆژئاواییەکان دەکەن. لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەم دیانانە زۆریان چێشت و ژمارەیان بە ڕادەیەکی زۆر کەمی کردەوە.

بەر لەوەی ئەوروپاییەکان دەست بە چالاکییەکانیان بکەن و بۆ ئەوەی بیر و باوەڕی ئەو خەڵکە بگۆڕن، سێ گرووپی فەلە لە ناو کوردەکاندا دەژیان. یەکەمیان: سووریانییەکان بوون؛ ئەمانە سەربە دێری ئۆرتۆدۆکسەکان، یان یاقۆبییەکانی سووریایی بوون و لە ناوچەکانی تورعابدین و جزیرەی باکوری ڕۆژئاوای کوردستاندا دەژیان. ئەوانە بە زمانی ئارامی یان شێوەزارەکانی عەرەبی دەئاخاڤتن. دووەمیان: ئاشوورییەکان بوون. ئەمانە سەر بە دێرێکی نەستووری بوون کە زۆر لەوەی سەرەوە جیاواز بوو. ئەمانەش بە ئارامی قسەیان دەکرد و لە ناوەڕاستی کوردستان لە ناوچەکانی بادینان و هەکاری و ورمێی کوردستانی ئێستای ئێراندا دەژین. سێیەمین: ئەرمەنییەکان بوون. ئەمانە زمان و دێری کۆنی تایبەتی خۆیانیان هەبوو. ئەمانە گەورەترین گرووپی دیانەکانی کوردستانن.

**کلدانییەکان.** ئەو دیانانەن کە فرەنسییەکان لە سەدەی ١٦دا هێنایاننە سەر ڕێبازی کاتۆلیکی. لەمیانی شەڕی یەکەمی جیهانی کلدانییەکان زۆریان چێشت و پاشتریش بە هۆی کۆچکردنەوە ژمارەیان زۆر کەم بووەتەوە. کلدانی و ئاشوورییەکان وێکڕا کەمینەیەک لە باکوری عێراق پێک دێنن.

**کەرکووک.** شارێکی گەورەی کوردستانە و لەو شوێنەدایە کە خاڵی هێڵی ٤٧ , ٣٥ باکور و هێڵی ٤١ , ٤٤ی ڕۆژهەڵات بە یەکتری دەگەن و لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە

کێوەکانی زاگرۆس و لە ڕۆژئاواشیەوە ڕووباری سۆران و ڕووباری دیجلە و لە باشووریشەوە کێوەکانی حەمرینە و لە باشووری ڕۆژهەلاتیشیەوە ڕووباری سیروانە.

کەرکووک لە شوێنی شارێکی کۆنی خورییەکان و لەسەر پاشماوەی (ئەرەفە – عەرەفە)ی پایەختی ئاشوورییەکان دروست کراوە و کەوتووەتە سەر بەستی خاسە و مێژووی ئەو شارە لە ٥,٠٠٠ ساڵ کۆنترە. لە سەدەی ١٠ و ١١ی پ.ز. کەرکووک پایەتەختی ئاشووری بووە و گرینگییەکی تایبەتی هەبووە. چونکە کەرکووک قزگەیەکی ستراتیژیشی هەبووە، بۆیە هەمیشە مەیدانی شەڕی نێوان ئاشووری و بابلی و میدییەکان بووە. میدییەکان گەلێ جار شارەکەیان کۆنترۆڵ کردووە. ژمارەی دانیشتوانی لە ٢٠٠٣دا ٧٥٥,٧٠٠ کەس بووە. شارێکی پێترۆلیی دەوڵەمەندە، چەند ئیتنێکی عێراقی جیاوازی تێدا دەژین. کەرکووک لە سەر ئەو تخووبەیە کە عەرەب و کوردی عێراق لێک دەکاتەوە؛ بۆیە حکوومەتی عێراق هەرگیز لەگەڵ خواستی کورد نەبووە بۆ ئەوەی کەرکووک بخاتە سەر هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردییەوە. لە ڕێفراندۆمەکەی ١٩٢١، کەرکووک دەنگی دژی ئەوەدا کە فەیسەڵ لە عێراق ببێتە مەلیک. تا ئەو کاتەش کە لە ١٩٢٦، کۆمەڵەی نەتەوەکان کەرکووکی تەسلیمی عێراق کرد، تورکیا هەمیشە بە بیانووی ئەوەی کە بەشێکی ویلایەتی مووسڵی عوسمانی بووە، داوای دەکرد وەری بگرێتەوە. لە ١٩٦٠ـەکان و ١٩٧٠کاندا، کەرکووک گەورەترین گرفتی نێوان مەلا مستەفا بارزانی و حکوومەتی عێراقی بوو؛ نەیانتوانی لەسەری ڕێک بکەون. بارزانی قایل نەبوو چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ کێشەی کەرکووک بدۆزێتەوە. حکوومەتی عێراق باوەڕی وابوو ئەگەر کەرکووک بخاتە ژێردەستی کوردەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دووبارە نەفتی عێراق دەخاتەوە بەر دەستی ڕۆژئاوا؛ چونکە کورد پێوەندییان بە ڕۆژئاواوە هەبوو.

ئەگەر لایەنی مێژوویی ڕەچاو بکەین، دەبینین کە زۆربەی کورد لەم دواییانەی پاش دۆزینەوەی نەوت ڕوویان لە کەرکووک کردووە. سەرژمێری ١٩٤٧ ئەوە نیشان دەدا کە ڕێژەی دانیشتوانی کورد لە ناو کەرکووک تەنیا ٢٥ لە سەد و لە هەموو پارێزگایەکەش ٥٣ لە سەد بووە. لە ١٩٥٨، ڕێژەی تورکمان لە کەرکووک لە ڕێژەی کورد پتر بووە. سەرژمێری ١٩٦٥یش نیشانی دا ٧١,٠٠٠ کورد و ٥٥,٠٠٠

تورکمـان و ٤١,٠٠٠ عـەرەب لە ناو کەرکـووک هەبووە. لە ١٩٥٩، ئەندامـانـی حزبی شیوعی پتر لە ١٠٠ تورکمانیان لە کەرکووک کوشت.

لە دوای نسکۆی شـۆڕشی بـارزانی لـە ١٩٧٥، حکوومـەتی عـێـراق دەسـتـی بە تەعریبی کەرکووک کرد و خـانەوادە کوردەکانـی بە هێز لە کەرکووک دەردەکردن و لە شـوێنی ئەوان عـەرەبـی دەهێنا و تەگـەرەشی لە پێش ئـەو کوردانە دروست دەکرد کە لەوێ مـابوونەوە و نـەیدەهێـشت مـولّکیـان بەناو بکرێ. حکوومـەتی عـێـراق ناوی کـەرکـووکی بە فـەرمی گـۆڕی و ناوی تـەئمـیـمی لـێ نا؛ ئەو ناوگـۆڕینە بە نـاو بۆ یادکـردنەوەی خـۆمـاڵیکردنی نەوت بوو کـە لـە ١٩٧٢ کـردی. حکوومـەت ئەو شـار و شارۆچکانەشی لە کـەرکووک دابڕی کە دانیشتوانەکانیان کوردبوون و چەمچەماڵ و کەلار و کفریی خستە سەر سلێمانی و توزخـورمـاتووشی خسـتە سـەر تکریت. لەو دواییـیانەش کە سـەدام حـوسێن دەستی بە جینۆساید کـرد، هێشـتا ڕێگەی توندتر دژی کـورد گـیرا و وای لە کەرکووک کرد کە چیتر زۆرینەی کوردی تێدا نەمێنێ. لە دوای ڕووخـانی ڕژێمـی سـەدام حـوسێن لە ٩ی نیسـانی ٢٠٠٣وە، کـورد هـەوڵێکی زۆریان دا تا توانییـان بەندی ٥٨ لە یاسای بەڕێوەبەریی کاتیی تۆمار بکەن و پاشان دوای فشـارێکی زۆر توانیی ئەو بەندە بخـاتە ناو دەسـتـووری هـەمیشـەیی و بیکاتە بەندی ١٤٠ی تایبەت بە ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکووک و پێشبینی دەکرێ لە پێش کـۆتاییی ٢٠٠٧دا ڕیفـراندۆمـێک بکرێ بۆ ئـەوەی چارەنووسی شـارەکـە دیار بکرێ و کێشـەکە چارەسـەر ببێ. واتە عەرەبە هاوردەکان بچنەوە بۆ ئەو شـوێنانەی کە لێی هـاتوون و ئەو کـوردانەش کە حکوومـەتی بەعسی دەری کـردبـوون بگەڕێنەوە سەر زەوی و زاری خۆیان و ئیتر هیچ کێشەیەک لەو شارەدا نەمێنێ.

تورکـیـا لـەلای خـۆیەوەڕا فـشـاری زۆر دەکـا بۆ ئەوەی نەهێـڵـێ نە مـادەی ١٤٠ی دەسـتووری عێراقی جێبەجێ بکرێ نە عەرەبە تەعریبەکان بگەڕێنەوە بۆ شـوێنەکانی خـۆیـان و نە کـوردە ڕاگـوێزراوەکـانیش بتـوانن بێنەوە کـەرکـووک و ئەو زەوی و خانووانەی کـە لێیان زەوت کرابوو وەریان بگرنەوە و نە ڕیفراندۆمیش بکرێ. تورکیا دژوارترین دوژمنداری کورد لەو بابەتەدا دەکا.

**کـەریم خـانی زەند (١٧٠٥– ١٧٧٩)**. سـەرکردەی بنـەمـاڵـەی زەند بووە کـە هەر لە

١٧٥١ـەوەڕا تا ١٧٩٤، حوکمڕانی زۆربەی ناوچەی فارسی کردووە. زەندەکان لەو "لەک"ـانەن کە پێشتر لە خاکی خۆیان دەرکرابوون و ڕەوانی خوراسانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی فارس کرابوون، بەڵام پاشان هاتنەوە و خاکەکەی خۆیان وەرگرتەوە.

کەریم خان نەیویست نازناوی شا لە خۆی بنێ، بۆیە ناتۆرەی "وەکیلودەولە" واتە جێگری سەرۆکی بۆ خۆی هەڵبژارد. زۆربەی سەردەمی حوکمڕانیی ئەو پیاوە، وڵاتی فارس زۆر بە ئاسوودەیی و لە ئاشتیدا ژیا. شیرازی کردە پایەتەخت و چەندین تەلار و باڵاخانەی گەورەی لێ دروست کرد، کە هەندێکیان تا ئێستاش باسی گەوراتی سەردەمی ئەو گەورە پیاوە دەگێڕنەوە. لە ڕۆژانی کەریم خان، بازرگانی و پیشەسازیی دەستکرد و کشتوکاڵ گەشەیان سەند و فرە هانی بازرگانی دەرەکیشی دا. نموونەی پاشایەتیی کەریم خان لەسەر بنەمای ئەو نەریتە خێڵەکییە دامەزرابوو کە لە ناو ڕەوەندە لەک و لوڕەکاندا باو بوو. پاڵەوانێتی کەریم خان و شارەزایی لە بەکارهێنانی چەک و بایەخدانی بە خۆشگوزەرانی خەڵک، بووەتە بنەمایەک و چەندەها چیرۆکی فۆلکلۆریی جوانی لێ دروست بووە. کەریم خان بە نەساغیی وەرەم tuberculosis مردووە.

**کەسیرە یلدرم.** هاوسەری پێشووی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی «پ. ک. ک» بوو. لە ١٩٧٠کاندا شووی پێ کرد. کەسیرە یەکێک لەو کەسانە بوو کە پارتی کرێکارانی کوردستانیان دامەزراند. لە ١٩٨٧، تەڵاق درا. پاش ماوەیەکی کورت لە ماڵزیندانی کردن، توانیی ڕابکا و بچێتە وڵاتی سوێد و لەوێ بووە ئەندامێکی قەژین، کە گرووپێکی بچووکی بەرهەڵستکاری «پ. ک. ک»ی بوو. ڕاستە کە ئۆجەلان کەسیرەی ڕیسوا کرد، بەڵام کەسیرەش سەلماندی کە ئۆجەلان دان بە خواستەکانی مێیینەدا نانێ. کەسیرە یلدرم هیچ پێوەندییەکی بە حوسێن یلدرمەوە نییە.

**کەلهوڕ.** یەکێک لە گەورەترین خێڵەکانی کوردە، یان کۆنفیدراسیۆنێکی ئەو هۆزانەی ناوچەی کرماشانی ئێران و سنوورەکانی نێوان عوسمانی و فارسەکانە. لە ١٨٣٠یەکان هێشتا زۆربەی کەلهوڕ لەسەر ڕێبازی ئەهلی هەق بوون، بەڵام لە سەرەتای ١٩٠٠ـەکاندا، کە دەستیان پێ کرد ڕۆڵی گرینگ بگێڕن، هەموو ڕێبازی خۆیانیان گۆڕی و بوونە شیعە. لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم، داود خان، کە

ناوبانگی بە ڕێگری دەرکردبوو، ناودارترین سەرۆکی کەلهوڕ بووە. کە داود خان مرد کوڕە گەورەکەی و کوڕەزایەکانی لەسەر سەرۆکایەتیکردنی کەلهوڕ بووە ململانێیان و لە ئەنجامدا سامانی هۆزەکەیان بە فیڕۆ دا. سەیری (ئەشرەت) بکە.

**کەمال بورقای (١٩٣٧- )**. کوردێکی عەلەوی تورکیاییە؛ لە ١٩٧٤ پارتێکی نەرمڕۆی دوور لە توندوتیژی بە ناوی پارتی سۆشیالیستی کوردستان (پسک) دامەزراند. لەو کاتەوە سکرتێری پارتەکەیە. پسک داوای فیدرالیەکی تورکی-کوردی دەکا. لە ١٩٨٠وەڕا کە حکوومەتە تورکییەکەی لە ئەنجامی کودەتایەکی سەربازی هاتە سەر حوکم و ڕەگەزنامەی تورکیی لێ سەندەوە، بورقای لە بانشگە، لە سوێد دەژی. نکووڵی کرد و پێوەندی بە پەرلەمانی کوردستانەوە نەکرد، کە بەلای زۆرییەوە پارتی کرێکارانی کوردستان لە ١٩٩٥ لە بانشگە دایمەزراند. مەهدی زانای سەرۆکی پێشووی شارەوانیی دیاربەکر، هاوکارێکی نزیکییەتی. بورقای ئارەزووی وێژەی هەیە و چەند کورتەچیرۆک و ڕۆمان و هۆزانی نووسیونەتەوە.

**کەمالیزم (کەمالییەت)**. ڕێبازی فەرمیی دەوڵەتی تورکیایە و بە ناوی موستەفا کەمال ئەتاتورکی دامەزرێنەری کۆمارە تازەکەی تورکیا کراوە. ئەو کۆمارە لەسەر شەش کۆڵەگەی هزری کەمالیزمی دروست بووە. (کۆماریزمی، سێکولاریزمی و نەتەوەپەرستی، پۆپیولیزمی، دەوڵەت سالاری و شۆڕگیڕی)، هەر شەش بنەماکانن. دوای تێپەڕبوونی پتر لە ٦٠ ساڵ بەسەر مردنیدا، هێشتا تورکەکان ناتوانن بە هیچ شێوەیەک نە بیانگۆڕن نە ڕەخنەش لە ئەتاتورک بگرن، چونکە یاسا یاساغی کردووە و سزای توندی لێ دەکەوێتەوە و سوپای تورکیا خۆی بە پارێزەری ئەو بنەمایانە دەزانێ و دژی ڕەخنەگرانی هیچ نەرمییەک نیشان نادا. مستەفا کەمال وەک سەدام حوسێن وێنەی لە هەموو شوێنێکدا هەڵواسراوە و گۆڕەکەشی لە ئەنکارا بە هێمای کۆماری تورکیا دەناسرێ و هەمیشە پاسەوانی هەیە. هیچ کام لە کەسایەتییە سیاسییەکانی سەدەی بیستەم، لە دوای مردنیان، هێندەی مەستەفا کەمال بایەخی پێ نەدراوە، ئەمەش بەهۆی ئەو یاسایانەیە کە خۆی دای ڕشتوونە و کەس ناتوانێ هەمواریان بکا.

لە بواری پەیڕەوکردندا، کەمالیزم ڕێبازێکی تازەیە و تورکیا بە دەوڵەتێکی

یەکگرتوو دەزانێ و تەنیا یەک نەتەوەی تێدا دەناسێ و هیچ شوێنێکی بۆ نەتەوەی کورد و ناسنامەی کولتووریی ئەو گەلەی لەو کۆمارەدا نەهێشتووەتەوە. ئەو زاراوە بەدناوەی "تورکی چیا" کە بۆ ناولێنانی گەلی کوردی کوردستانی باکور بەکار دێ؛ بە هەڵسوکەوتێکی زۆر ناڕەوا دژی کورد لەقەڵەم دەدرێ و هەمیشە بە هۆیەوە ڕەخنەیەکی زۆر لە تورکیا دەگیرێ، سەرچاوەی ئەم ناتۆرە قێزەوەنە لە بنەماکانی کەمالیزمەوە هەڵقولاوە. دانیشتوانە بە ڕەگەز تورکەکانی تورکیا و دەزگای توندڕۆی سەربازیی تورکی پشتیوانیکردن و پاراستنی کەمالیزم بە ئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن و ئەمەش زیانێکی زۆری بە مافەکانی مرۆڤی تورکیا گەیاندووە و کۆسپی بۆ دروست کردووە و ناهێڵێ لە یەکێتیی ئەورووپادا پلەی ئەندامێتی وەربگرێ. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە پڕ پێوەندیی بە کەسایەتیی ئەتاتورک و ڕێبازی کەمالیزمەوە هەیە.

لەگەڵ ئەمەشدا، بە ڕواڵەت یەک لە ئامانجە هەرە سەرەکییەکانی کەمالیزم پیادەکردنی ڕادەیەک لە شارستانیی هاوچەرخە کە بۆ بوونە ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا پێویستە. بۆ ئەمەش تورکیا ناچارە دەبێ هەموو بنەماکانی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی جێبەجێ بکا. ئەگەر ڕەچاوی نەرمڕۆیی و تازەبوونەوەی کەمالیزم لە سالانی ڕابردوودا بکرێ، دەبینین هیچ هۆیەک نییە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە پێیان دەگوترێ کەمالیستەکان نەتوانن پشتیوانیی پرۆژەیەک بکەن ڕێگەیان بدا تا مەرجەکانی یەکێتیی ئەورووپا قەبووڵ بکەن، بەڵام وا دیارە ئەو کەمالیستە هاوچەرخانە لە مستەفا کەمال، کەمالی ترن.

**کەندال نەزان (١٩٤٩-      )**. زانایەکی فیزیای کوردە، لە ١٩٧١ـەوەڕا لە تورکیا دەرچووە و بە دوای وەدەستهێنانی مافەکانی کوردەوە عەوداڵە و بە ناودارترین ڕەخنەگری سیاسەتەکانی میریی تورکیایە کە دژی کورد پەیڕەویان دەکا. پێوەندیی نزیکی لەگەڵ حکوومەتی فەرەنسی هەیە، پێوەندییەکەی لەگەڵ خانمی دانیال میترانی هاوسەری سەرۆکی پێشتری فەرەنسا، فرانسوا میتران، پلەیەکی تایبەتی هەیە. چەندین ساڵە کەندال نەزان سەرۆکی ئینستیوتی کوردە لە پاریس، ئەو پەیمانگەیە یارمەتیی دارایی لە وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا و لە کۆمەڵەی چالاکیی فۆندز وەردەگرێ.

**کەنعان ئەڤرەن (١٩١٨-      ).** سوپاسالاری لەشکری تورکیا بوو کە لە ١٢ی سێپتێمبەری ١٩٨٠، کودەتایەکی سەربازیی لە وڵاتەکەی ئەنجام دا. ئەڤرەن بۆیە کودەتایەکەی کرد؛ چونکە ئایندەی تورکیا بە دەستی چەپڕەو و ڕاستەڕەوە توندڕۆییەکان، بە کوردیشیانەوە، خەریک بوو دووچاری مەترسیی گەورە دەهات.

کەنعان ئەڤرەن زۆر بە توندی هەڵسوکەوتی کرد، بەڵام ئەم جۆرە ڕەوشتەی بەبێ هۆ نەبوو، چونکە ئەگەر ئاوای نەکردایە ئەستەم بوو بتوانێ باری تورکیا ئارام بکاتەوە. لە ١٩٨٢، دەستوورێکی نوێ نووسراوە و ئەڤرەن لە ١٩٨٣ تا ١٩٨٩ بووە سەرۆک. ئەم دەستوورە نوێیە پێچەوانەی ئەو دەستوورە ئەوپەڕ لیبراله بوو کە لە دوای کودەتایە سەربازییەکەی لە ئایاری ١٩٦٠، سوپا دای ڕشتبوو. دەستوورەکەی ١٩٨٢ی ئەڤرەن نووسییەوە، مافی ئاخاڤتن و نووسینی بە کوردی لە هەندێ لە ویلایەتەکان یاساغ کرد. هەرچەندە حوکمی ئەڤرەن توندی و تیژییەکەی نێوان چەپڕەو و ڕاستڕەوەکانی لە تورکیا بڕاندەوە، بەڵام ڕاپەڕینەکەی پارتی کرێکارانی کوردستانی لە جاران توندتر نوێی کردەوە.

**کوردایەتی.** سیستەمێکی نوێ و پتەوە، کوردە ڕووناکبیرە نەتەوەپەروەرەکان ئەم بیرەی کوردایەتییان گەڵاڵە کرد و لە کۆتاییی ١٩٦٠ـەکان بە تەواوەتی چوارچێوەی کۆتاییان بۆی دانا و ڕۆژ لە ڕۆژ پتریش گەشە دەکا. سەرتاسەری گەلی کورد، بە هەموو پارت و لایەنە سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەزگا بێلایەنەکانیشیانەوە، پابەندی هزری کوردایەتینە. وشەی کوردایەتی لە دوو پارچە پێکهاتووە؛ "کورد" ناوە و "ایەتی"ش پاشگرە و هەردووک وێکڕا وشەیەکی هاوچەرخن کە زاراوە فەرهەمگییەکانی کوردییان یەک وشە دەوڵەمەندتر کردووە.

کوردایەتی لەسەر بنەمای بیرۆکەی کوردپەروەری و چالاکیی خەباتکردن، لە پێناوی ئازادیی گەلی کورد، دامەزراوە. کوردایەتی خەباتە لە پێناوی یەککردنی هەموو چین و گرووپەکانی کوردستان بۆ ئەوەی وێکڕا لە بن چەتری کوردستانێکی سەربەخۆدا کار بکەن. کوردایەتی هزرێکی نەتەوەپەروەری سێکولارە و مارکسیزم-لێنینیزم کاریان تێی کردووە. جێگیربوونی دانیشتوانە ڕەوەندەکان و گەورەبوونی شارەکان و پەیدابوون و گەشەکردنی چینی ناوەند و ڕووناکبیران و توکمەبوونی

سەرکردایەتییەکی سیاسیی هاوچەرخ و ئەو بایەخە زۆرە نێونەتەوەییەی کە لە دوای شەڕی کەنداوی ١٩٩١دا بە کێشەی کورد درا، ئەمانە هەموو تین و توانای کوردایەتییان فرەتر کرد.

ئەگەر دابەشکردنی کوردستان بەسەر تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا و ئەو بەش بەشەی ناوخۆش ڕەچاو بکەین دەبینین کە کوردایەتی تەنیا خەونێکە و بەدەستهێنانی ئاسان نییە. لەگەڵ ئەمەشدا کە هۆزانی هۆزانڤانە کوردەکان لە سەردەمی ئەحمەدی خانییەوە لەگەڵ شیعری ئەو شاعیرانەی ئەم سەردەمە بەراورد بکەین تێ دەگەین چۆن هەستی کوردایەتی پەرەی سەندووە؛ لە کاتێکدا کە خانی گلەیی لە پەرت و بڵاویی کورد دەکا و بە هۆیەکی بێ دەوڵەتی دەزانێ، دەبینین حاجی قادری کۆیی تیر و توانج لەو کوردانە دەدا کە قسەی بابیان نازانن و دەفەرمێ:

ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی
موحەققەق داکی حیزە بابی زانی

پاشتر لە سەرەتای سەدەی بیستەم، شاعیرێکی وەکوو دڵداری مەزن، هێندە فیکری کوردایەتی لەکنی پەرەی سەندووە تا ئەو ڕادەیەی کە چاو لە دوژمن سوور بکاتەوە و پێی بێژێ:

ئەی ڕەقیب!
هەرماوە قەومی کورد زوبان
نایشکێنی دانەریی تۆپی زەمان
کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە؛
زیندووە، قەت نانەوێ ئاڵاکەمان.

ئەم باوەڕە کوردایەتییە لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١- ١٩٧٥، پتر گەڵاڵە دەکا و هێندە بۆ پێشەوە دەچێ تا وا لە هۆزانڤانی کورد دەکا خەون بە سەربەخۆیی کوردستانەوە ببینێ و خۆی بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکا کە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دادەمەزرێ؛ بۆیە مەلا تەییبی دووشیوانی ١٩٠٤- ١٩٧٨ دەڵێ:

گەر ببینم سەربەخۆیی کورد و کوردستانەکەم
سەد هەزار کاوڕبەرانی مەنتکی قوربان ئەکەم

بێ ژمـــار حـــەیران و لۆلۆ و لاوکی پێ هـەردەڵێم
تا بمێنم بەزم و ڕەزم و ئەگلەنجە و سەیران ئەکەم..

ئەمە ئەوە نیشـان دەدا کە هزری کوردایەتی هەر لە پەرەسەندن و گەشەکردندایە و ئەم گەشەکردنەشی ئەنجامی هەر دەبێ، جا با دووریش بێ.

**کورد داغ (چیای کورد).** یەکێک لەو سێ ناوچە پچڕاوانەیە کە لە سووریا کوردی تێدا نیشـتـەجێن. ئەو تـاکە ناوچە شـاخاوییـە کوردییـە لە سووریایە و کـەوتووەتە باکـوری ڕۆژئاوای حـەلەب و تـەنیـا ٦٠ کـیلۆمـەتر لە ڕۆژهـەڵاتی دەریای سـپـیی ناوەڕاستـەوە دوورە. سنووری باکوری ناوچەکە وڵاتی تورکیایە. ٣٠٠,٠٠٠ کورد لەو ناوچەیەدا دەژین و شـارە سەرەکییەکەشـی (عافرین)ـە. جگە لە ڕێژەی زۆری باران، ڕووباری ئەفرینیش ناوچەکە ئاو دەدا.

**کوردسـتـان.** یەک لە ئوسـتـانەکانی ئێـرانە و تاکە ئوسـتـانیـشـە لە هەمـوو خـاکی دیرۆکی کوردی کە ئەم ناوەی هەبێ. کوردسـتـان واتای وڵاتی کـورد یان خاکی کورد دەبەخشێ. کوردستان بەشێکی بچووکی کوردستانی ئێران دەگرێتە خۆ. کوردەکانی ڕۆژهەڵات لە کرماشان و لە ئازربایجانی ڕۆژئاوا و ئیلام و لە هەمەدانیشدا دەژین.

هەرچەندە سنە پایەتەختـی ئوسـتـانی کوردسـتـانە، بەڵام ناوچە دەوروبەرەکـەشی هەر بە هـەمـان ناو دەناسـرێ. زۆریی دانیـشـتـوانی ئۆسـتـانی کوردسـتـان، کـوردی مـوسـڵـمـانی سـوننەنـە. هـەرچەندە پێشـان مـیـرەکـانـی ئەردەلان لەگـەڵ ئـەوە کـە شیعـەشبـوون، لە کوردستان باڵا دەستبوون، بەڵام هەر لە دێرزەمـانەوە شێخـەکانی تەریقـەتی نەقشبـەندی لە هەمـوان پڕتر قسـەیان ڕۆیشـتـووە و کاریگەرتـر بووینە؛ ڕەنگە ئـەمـەش لەبەرئەوە بووبێ کـە پێشـتـر پێـوەندییـان بە ئەهلی هەقـەوە بووە. زۆرینەی کـوردەکـانی ئەم ئوسـتـانە شـێـوەزاراوەی کـوردیی باشـووری ڕۆژهەڵاتی کـوردسـتـان بەکـار دێنن؛ ئەم دیالەکـتـە لە فـارسـی نزیکتـرە نـەک لە سـۆرانـی. لە ڕۆژئاوای ئەوان دانیشتوانەکە بە شێوەزاری گۆرانی دەئاخێڤن.

**کوردستانی سوور.** سەیری "لاچن" بکە.

**کورد عەلی.** سەیری "محەمەد فەرید" بکە.

**کوردی (زمانی کوردی).** کوردی به هەموو دیالەکتەکانی پێوەندیی به زمانه هیندۆ ئەورووپییەکانەوه هەیە؛ بۆیه لە دوورەوەڕا پێوەندیی به ئینگلیزی و فەرەنسی و سەرجەم زمانەکانی دیکەی ئەو کەرتەوه هەیە. فارسی لە هەموو زمانێک لە کوردی نزیکترە. هەرچەندە کورد لەگەڵ عەرەب و تورکان دراوسێیه و ئەو هەر سێ گەلە هاوئاینیشن، بەڵام زمانی کوردی تا ئەوپەڕ لە ڕەچەڵەکی ئەو هەردوو زمانەکانی دیکەوه جیاوازە.

چونکه گەلی کورد لە لایەنی سیاسی و جیۆگرافییەوه لە یەکتری جودا کراوەتەوە، بۆیه ئەو جودا کردنەوەیه کاریگەرییەکی زۆری لە زمانەکەش کردووە و فرە شێوەزاریی لێ پەیدا کردووە. ئەوەی جێی نیگەرانییه کە تا ئێستا هیچ ناوێکی فەرمی بۆ ئەو دیالەکتانه دانەندراوه هەیا بەیەک ناو بناسرێن. بۆ نموونه "زازا"و "دیمیلی" دوو ناوی یەک شێوەزاری کوردیین و سۆرانی و سلێمانییش دوو ناوی دیکەی یەک دیالەکتن. ئەوەی قورەکەی هێشتا تیرتر لە کورد گرتووەتەوه ئەوەیە کە زمانی کوردی به سێ ئەلفوبێی جیاواز سەواد دەکرێ: لە تورکیا به پیتی لاتینی و لە عێراق و ئێران و سووریا به ئەلفوبێی عەرەبی و لە یەکێتیی سۆڤیەتیش به ڕێنووسی سیریلی دەنووسرێتەوه. جگە لەمانه هەندێ حاڵەتی بچووکی دیکەش هەیە کە هیچ لەم شێوه نووسینانه به کار نابات. هەرچەندە به گشتی دەگوترێ کە کوردی دوو دیالەکتی سەرەکیی هەیە و ئەوانیش کرمانجی و سۆرانین و لەگەڵ شێوه زمانەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێرانی یەک بنچینەیان هەبووه و زۆرینەی کورد بەو زمانانه دەئاخێڤن، بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە گۆرانی و زازا (دیمیلی) زۆر لەو دوو زاراوانه دوورن و هەندێک به دوو دیالەکتی زمانێکی دیکەیان دەزانن و دەڵێن پێوەندییان به شێوه زمانەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئێرانەوه هەیە و ژمارەی ئەوانەی قسەیان پێ دەکەن لە ژمارەی ئەوانه کەمترە کە بۆ پێوەندیکردنی نێوان خۆیان، کرمانجی و سۆرانی بەکار دێنن. هەر یەک لە کرمانجی و سۆرانی چەند دیالەکتی بچووکی دیکەیان هەیە: بۆ نموونە؛ سۆرانی شێوەزاری سلێمانی و هەولێری و کەرکووکی و باڵەکایەتی و سابڵاغی و هی تریشی هەیە. کرمانجییش به هەمان شێوه، چەند دیالەکتێکی وەک زاخۆلی و ئۆرفەیی و بادینی هەیە. دەڵێن جیاوازیی نێوان کرمانجی و سۆرانی وەک ئەو جیاوازییەیه کە لە نێوان هەردوو زمانی فرەنسی

و ئیتاڵیدا هەیە؛ بەڵام من لەو باوەڕەدا نیم؛ چونکە پتر لە ٧٥ لە سەدی ڕێزمانی کرمانجی، وەک ڕێزمانی سۆرانییە و جیاوازییەکە وەک ئەوەی نێوان دوو زمانی جیاوازدا نییە. خۆ ئەگەر ئەو جوداییەش هەبێ هێندە گرینگ نییە؛ عەرەبی مەغریب، ئەگەر شێوەی ستاندەردی ڕەوانی عەرەبی نەبێ، مەحاڵە بتوانێ لەگەڵ عەرەبێکی یەمەنیدا لە یەکتری بگەن، هەر چەندە یەمەن قزگەی زمانی عەرەبی بووە. ڕەنگە کەسانێکیش هەبن کە دیالەکتەکانی سنە و کرماشان بە زمانێکی دیکەی کوردی بزانن و بڵێن ئەم دوو دیالەکتە لە فارسییەوە نزیکترە تا لە سۆرانی.

خۆ هێشتا دەتوانین بڵێین کە ئەم کێشە زمانەوانییە تەنیا دووچاری زمانی شیرینی کوردی نەهاتووە؛ بۆ نموونە لە چین، دوو شێوە زمان هەیە؛ "ماندەرین" شێوەی فەرمییە و "کانتۆنی"ش شێوەزارێکی دیکەیە و لەگەڵیدا بەکار دێ. لە جەرمەنستان "هۆخدویچە - جەرمانی ژووری" بە زمانی ستاندەردی ئەڵمانی دەناسرێ؛ کەچی هێشتا دوو شێوەزاری سەرەکیی تری هەیە و قسەیان پێ دەکرێ: هۆخدۆیچە و (پلاتدۆیچە جەرمانی ژێری) هەردوو شێوەزمانەکەنە. زمانی نەرویجیش دوو شێوەزاری فەرمی هەیە؛ "بوکمال" یان (ڕکسمال) واتە زمانی نەتەوەیی و "نینۆرسک"یش شێوەزاری نەرویجیی نوێیە و بە "لاندسمال زمانی دەشتێ"یش دەناسرێ. ئەگەر سەیری زمانی عەرەبییش بکەین، هەر لە عێراق بەتەنێ سێ جۆرە دیالەکت بەکار دێ: لەهجەی مووسڵ و دەوروبەری بەزۆری پیتی (ق) دەکەنە (غ) و (غ)یش دەکەن بە (ق)و پیتی قافیش زۆر بە کار دێنن. بەغدایی پیتی (ق) دەکەنە (گ) و شێوەزاری باشووری عێراقیش "شرووجی" دەستەواژەی "چا" زۆر بە کاردێنن. لەهجەی مووسڵ فرە وشەی کوردیی تێدایە و دەستەواژەی کوردی (یار دڵی) لە گۆرانییەکی فۆلکلۆری مووسڵ بە هەمان ناو، زۆر دیارە.

**کوردی فەیلی.** گرووپێکی ١٥٠,٠٠٠ کەسینە لە بنەڕەتدا هی کرماشانی ئێرانن. ئەمانە هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە لە عێراق دەژیان و زۆربەیان لە بەغداد جێگیر بووبوون؛ بەڵام ڕەگەزنامەی عێراقییان نەبوو. لە کۆتاییی ١٩٧٠کاندا، حکوومەتی عێراقێ بیانووی ئەوەی پێگرتن کە هاووڵاتی عێراق نەبوون و بەلایەنی کەمییەوە ٥٠,٠٠٠ یانی لە وڵات وەدەرنا.

لە ١٩٧٠کاندا کە کار بە بەیانی ئادار دەکرا، حکوومەتی عێراقێ نکووڵیی لەوە

کرد کە بە پێی بەندی ١٢ بەیانەکە، پۆستی بریکاری سەرۆک کۆمار بە پاڵێوراوی پارتی دیموکراتی کوردستان حەبیب محەمەد کەریم، بسپێرێ؛ چونکە کەریم کوردی فەیلی و بە ڕەچەڵەک ئێرانی بوو. بەمجۆرە سیاسەتی بەعەرەبکردن کە حکوومەتی عێراق بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کورد و باڵادەستکردنی عەرەبان پەیڕەوی دەکرد، ڕاستەوخۆ ڕووی لە کوردە فەیلییەکان بوو. کوردە فەیلییەکانیش وەک گەلێ کوردی دیکە لە ئێران بوونە پەناهەندە.

**کۆسرەت ڕەسووڵ عەلی.** گەورە ئەندامی پۆلیتبیرۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە، توانیی بە ئازایەتیی خۆی لە مەیدانەکانی شەڕدا خۆی بە کوردان بناسێنێ. لە کاتی کۆڕەوەکەی ١٩٩١، لە کۆڕێ، کۆسرەت بەرگرییەکی چاکی لە خاکی کوردستان کرد. لە نیسانی ١٩٩٣، کۆسرەت ڕەسووڵ، پۆستی سەرۆک کابینەی دووەمی حکوومەتی کوردستانی وەرگرت. پاشتر کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان، لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆی نێوان «پ. د. ک» و «ی. ن. ک»، کەرت بوو، کۆسرەت پۆستی سەرۆکی حکوومەتی سلێمانیی پێ سپێردرا. لە ٢٠٠١ کۆسرەت دەستی لە پۆستەکە کشاندەوە و بەرهەم ساڵح پۆستەکەی وەرگرت.

**کۆماری کوردستان لە مەهاباد.** هەرچەندە کۆمارێکی تەمەن کورت بوو، بەڵام هێمای بەرزی مکوڕبوون لەسەر سەربەخۆیی و ئازادبوون بوو. جاڕی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە ٢٢ی یەنایری ١٩٤٦دا درا و یەکێتیی سۆڤیەت یارمەتییەکی باشی دا، بەڵام ئەویش خیانەتی لێ کرد و لەگەڵ شای ئێران ڕێک کەوت و پشتی تێ کرد تا لە دیسێمبەری هەمان ساڵدا بڕووخێ و سوپای شا دووبارە کوردستان داگیر بکاتەوە. سەرکۆمار قازی محەمەد لە ٣١ی ئاداری ١٩٤٧ لە سێدارە درا و بە نەمردەکردنی سەرکردە و پێشەوا قازی محەمەد، حزبی دێمۆکراتی کوردستان (ئێران) لە چالاکی وەستا.

هەرچەندە تەمەنی کۆماری کوردستان گەلێک کورت بوو، بەڵام هێشتا فرە دەستکەوتی فرە گەورەی هەبوو. لە قوتابخانەکان خوێندن کرایە کوردی. زانایان دەستیان بە وەرگێڕانی کتێبان کرد. سۆڤیەتەکان چاپخانەیەکیان بە کۆمار بەخشی و بەو چاپخانەیە ڕۆژنامەیەک و مانگنامەیەکی کوردی چاپ و بڵاو کراوە.

یارمەتییەکی کەمی سەربازی لە لایەن سۆڤیەتەکانەوە بۆ کۆمار هات.

مشتومڕ لەسەر ئەوە هەیە ئایا قازی محەمەد کۆمارێکی سەربەخۆی دامەزراند یان هەر هەرێمێکی خودموختار بوو؛ چونکە کۆمارەکە تەنیا چەند شارێکی بچووکی وەک مەهاباد و بۆکان و نەغەدەی حوکم دەکرد. واتە هەموو کوردستانی ڕۆژهەڵاتیشی ئازاد نەکردبوو، نەخواستە بەشەکانی دیکەی کوردستان. لەگەڵ ئەمەشدا هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان، ئەگەر بە کەرەستەش نەبووبێ، لە دڵەوەڕا پشتیوانی کۆمارەکەبوون. پێشەوا مەلا مستەفا بارزانی بە هانای کۆماری کوردستانەوە چوو و لەوێ پلەی ژەنراڵی لە لەشکری کوردستان وەرگرت. لە سەدەی ٢٠دا، کۆماری کوردستان هێمای سەربەخۆیی گەلی کورد بوو. چاودێران هۆی ڕووخانی کۆماری کوردستان بۆ سێ فاکتەر دەبەنەوە؛ یەکەمیان، ئێران زۆر بە ڕشتی و بە توندی دژی ئازادیی کوردستان بوو. دووەم، یەکێتیی سۆڤیەت پتر یارمەتیی کۆماری کوردستانی نەدا. سێیەمیش، بەش بەشی و دووبەرەکی خودی کورد خۆی بووە.

لە ١٩٢٠ـەکان ڕەزا شا، ناوی شارەکەی کردە مەهاباد. پێشتر بە ساوادژ یان بە ساودژ بولاق دەناسرا. هەمیشە هەستی کوردایەتی لە شاری مەهاباد گڕدارتر بووە لەوەی کە لە شارە گەورەترەکانی وەک ورمێ لە باکور و سنە لە باشوور هەبووە. هەیە دەڵێ هۆی ئەمە ئەوەیە کە لەو دوو شارەدا کەمینە نەتەوەی دیکەی غەیرە کورد هەنە بۆیە هەستی کوردایەتییان تێدا لە شارەکانی تر لاوازترە. بەڵام ئەگەر وابێ دەبێ هەستی کوردایەتی لە کەرکووکیش لە شارەکانی دیکە کەمتر بێ، کەچی وانییە. هەرچی و هەر چۆن بێ، مەهاباد بێشکەی هەستی کوردایەتیی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە.

هونەرمەندی ناسراوی کورد حەمەی ماملێ لەو شارەدا بووە و هەر لەویش ژیاوە و گۆڕەکەشی هەر لەودایە.

**کۆمسیۆنی هلسنکی.** ئاژانسێکی سەربەخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانە، بۆ ئەوە دامەزراوە تا چاودێریی جێبەجێکردنی ئەو بنەماو دوا دەستپێشخەرییانەی مافەکانی مرۆڤ بکات کە لە بەندی دوایی Final Act کۆنفرانسی هلسنکی تایبەت بە

ئاسایش و هاریکاریدا هاتوونه. کۆنفرانسەکە لە ۱۹۷٥ کرا (پاشان ناوی بووە ڕێکخراوی ئاسایش و هاریکاری لە ئەوروپا OSCE)، چونکە تورکیا لە ڕێکخراوی OSCE ئەندامە، بۆیە کۆمسیۆنی هلسنکی بووە سەکۆیەک بۆ هەر کەس و هەر ڕێکخراوێک کە بیەوێ ڕەخنە لەو سیاسەتە بگرێ کە تورکیا بەرانبەر بە کورد پەیڕەوی دەکا و گوێی لە هەموو زانیارییەکانی سەبارەت بەم دۆسێیە دەگرێ و بڵاویشیان دەکاتەوە.

**کۆمەڵکوژی (جینۆساید).** واتای زمانەوانیی دەکاتە قەلاچۆکردنی تەواوی ڕەچەڵەکێک. ڕافایێڵ لێمکن زاراوەی جینۆسایدی وەک زاراوەیەکی تایبەتی بۆ پێناسەکردنی ئەو کۆمەڵکوژییەی بەکار هێنا کە تورکە عوسمانییەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانی لە دژی ئەرمەنییەکان کردیان.

لە دوای ئەو هەترەس atrocity ـانەی کە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا، نازییەکان دژی جوولەکەکان کردیان، کۆنگرەی ١٩٤٨ی تایبەت بە ڕێگەگرتن لە جینۆساید و سزاکانی، بە شێوەیەکی قانوونی جینۆسایدی پێناسە کرد، وەک هەر کردەوەیەک کە "بە مەبەستی لەناوبردنی بەشێک یان سەرتاپای نەتەوەیەک یان ڕەگەزێک، یان ئیتنێک، یان گرووپێکی ئایینی، بە نیازەوە" جێبەجێ بکرێ. ئەمە بەشێوەیەکی زەق لەگەڵ کێشەی کورد گونجاوە؛ چونکە پێناسە قانوونییە نێونەتەوەییەکەی جینۆساید لەناوبردنی گرووپێک دەگرێتەوە جا چ "سەرتاپای گرووپەکە بێ یان بەشێکی بێ". واتای ئەم دەستەواژەیە ئاوا ڕاڤە کراوە "ژمارەیەکی هێندە زۆر بێ کە ڕێژەیەکی هەموو گرووپەکە پێک بێنێ، یان هەر بەشێکی دیاری ناو گرووپەکە بێ، وەک ئەوەی سەرکردەکانیان بن."

شاڵاوی ئەنفالی عێراق کە لە دوای شەڕی ئێران – عێراق کراو ١٨٠,٠٠٠ کوردی کوشت؛ پەلامارە کیمیاییەکەی عێراق لە ئاداری ١٩٨٨، بۆ سەر هەڵەبجەی برد و ٥,٠٠٠ کوردی تێدا کوشت و ئەو هەوڵانەی کە تورکیش دەیدا بۆ ئەوەی بەزۆری زۆردار دانیشتوانە بە ڕەگەز کوردەکەی تورکیا بتاوێنێتەوە ئەمانە هەموو کردەوەی لەم چەشنەنە کە دەگونجێ بە گوێرەی ڕێککەوتنی جێنۆساید، بە ئاسانی بە کردەوەی کۆمەڵکوژی بناسرێن.

له ۱۹٥۹، عێراق بەبێ هیچ مەرجێک، ڕێککەوتنەکەی جینۆسایدی مۆر کرد. بۆیە، بە ڕواڵەت، هەر دەوڵەتێک کە هیچ مەرجێکی لە بەرانبەر بەندی ژمارە نۆی نەبێ و ئەو ڕێککەوتنەی مۆر کردبێ، دەتوانێ عێراق بێنێتە داداگای دادی نێونەتەوەیی. بەندی نۆیەم چۆنیەتیی بەگەڕخستنی ئەم جۆرە داواکارییانە ڕوون دەکاتەوە. ئەو مەترسی و کێشانەی کە لەم جۆرە دادگاییکردنە نێونەتەوەییانەدا پەیدا دەبن، تا ئێستا ڕێگەیان لە پرۆسەکردنی ئەم جۆرە کێشانە گرتووە. وڵاتە یەکگرتووەکان کەمتر لە هەموو وڵاتانی دیکە مەیلی ئەم جۆرە دادگاییکردنەی هەیە. چونکە بە خۆی کێشەی ناوخۆی ڕەگەزیی هەیە و لە دەستێوەردانی نێودەوڵەتی دەترسێ، بۆیە بۆ ماوەی پتر لە ٤٠ ساڵ، نکووڵیی لە مۆرکردنی ڕێککەوتنەکە کرد. تورکیا هەرگیز ڕێککەوتنەکەی مۆر نەکردووە.

ئەو قەسابخانانەی لە ۱۹۷۰کاندا، لە کەمبۆدیا، خومیر ڕووژەکان (خێمێرە سوورەکان) کردیان؛ ئەو کۆمەڵکوژییانەی۱۹۷۰کان و لە ۱۹۹۰ـەکانی ڕواندا، لە نێوان هوتوو و توتسییەکان و ئەو قەسابخانانەی کە سربەکان لە ۱۹۹۰ـەکاندا لە یوگوزلاڤیا کردیان؛ هەموو ئەمانە نموونەی تری جینۆسایدن کە لەم سەردەمەدا قەوماون. لە ئەنجامی ئەمانەدا، دادگا نێونەتەوەییەکان دروستبوون و ئێستا دەستبەکارن و گوێ لەو کێشانە دەگرن کە پێوەندییان بە هەترەسەکانی ڕواندا و یوگوزلاڤیای پێشووەوە هەیە. ئەو دادگاییەی دژی سەرۆکی سربیا، سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ بەڕێوە چوو، ڕێگە خۆش دەکا بۆ ئەوەی ڕۆژێک دادگایەکی هاوشێوە بۆ سەرانی ئەو ڕژێمانەشدا بکرێ کە کورد دەچەوسێننەوە و هەوڵی لەناوبردنی دەدەن، بۆ ئەوەی لەبری ئەو کردەوانە سزا بدرێن کە چەندەها ساڵە دژی کورد ئەنجامی دەدەن. سەیری "مافەکانی مرۆڤ" بکە.

**کۆمەڵە (۱۹٤۲– ۱۹٤٥).** پارتێکی سیاسیی کوردییە لە ۱۹٤۲، لە مەهاباد، لە ئێران دامەزرا. عەبدولڕەحمان زەبیحی بە سکرتێری کۆمەڵە دەستنیشان کرا. هەندێ کوردی عێراقی و کوردی تورکیایی تێدا ئەندامبوون. کۆمەڵە پەیڕەوی هەنگاوەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی دەکرد و جەختی لەسەر زمان و مافەکانی کۆمەڵایەتی کردەوە. لە نیسانی ۱۹٤٥، داوا لە قازی محەمەدی کرا کە ببێتە

سەرۆکی کۆمەڵە. قازی محەمەد مەلایەکی کوردی خەڵکی مەهابادی هێندە بەڕێز بوو کە کەس قسەی لە قسەی نەدەکرد. لە سێپتێمبەری ١٩٤٥، قازی محەمەد کۆمەڵەی تواندەوە و ئەندامەکانی بردە نێو پارتی دیموکراتی کوردستان، پاشان ناوەکەی بووە حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران. وا پێ دەچوو ئەم پارتە بە ئامۆژگاریی سۆڤیەت دامەزرابێ.

پاش یەک چارەکە سەدە لەم ڕووداوانە، پارتێکی دیکەی ئێرانی بە هەمان ناوی کۆمەڵە دامەزرا. سەیری (کۆمەڵە ١٩٦٩-      ) بکە.

**کۆمەڵە (١٩٦٩-      )**. کورتکراوەی ناوی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕانی زەحمەتکێشە. پارتەکە خۆی ئاوا هەڵدەخا کە لە ١٩٦٩، لەلایەنی قوتابییە چەپڕەوەکانەوە، لە تارانی ئێران دامەزرابێ. بەڵام تا کۆتاییی ١٩٧٨ و ڕووخانی شا خۆی ئاشکرا نەکرد. ئەو گرووپە چاو لە پارتی کۆمۆنیستی چینی دەکا و پشتیوانی لە جەماوەری شار و لادێیەکان دەکا. زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵە لە بنەماڵە دیارەکانبوون. عەبدوڵڵا موهتەدی، یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بووە و بۆ ساڵانێکی زۆر سەرکردایەتیشی کردووە.

کۆمەڵە و حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران دوو هێزی گەورەی نەرمڕۆی کوردی ئێرانی پێک دێنن کە بۆ مسۆگەرکردنی مافی خودموختاری بۆ گەلی کورد، دژی کۆماری ئیسلامی خەبات دەکەن. هەرچەندە هەردوو گرووپەکە زۆر سێکولاربوون، بەڵام کۆمەڵە فرە ڕادیکاڵتر و مارکسیتر بوو. کۆمەڵە هزری کوردایەتی بە بیرێکی تەسک دەزانێ.

کۆمەڵە لە دەوروبەری شاری سنە دامەزرا و هێزی هەبوو، کەچی حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران لە ناوچەی مەهاباد باڵادەست بوو. بۆ ماوەیەک ڕێنوێنییەکانی هەردوولا، کاریگەریی زۆریان لەسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی ئێران هەبوو، بەڵام لە ١٩٨٣وەڕا، ڕاونران و کەمتر لە جاران هێرشی پارتیزانی دەکەن، ئەگەر بشکەن، ئەوە لە بانشگەی باکوری عێراقەوەڕا پەلامار دێنن. هەرچەندە کۆمەڵە پێوەندی بە حزبی توودە (کۆمونیست)ی ئێرانەوە کرد و بووە بەشێک لەو حزبە، بەڵام هێشتا لە کوردستانی ئێران هەر بە کۆمەڵە دەناسرێ. ئەو

هەنگاوەی سەرانی کۆمەڵە، بناغەی حزبەکەیانی لە کوردستان هەڵتەکاند، چونکە نەیانزانی کە هزری کوردایەتی چەند لە ناو کوردی ئەو دەڤەرە قووڵەو چەندیش کاریگەریی هەیە.

لە ١٩٨٥، شەڕ لە نێوان کۆمەڵە و حزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانی بەرپا بوو، لە ئەنجامدا بە سەدان کەس کوژران. پاش ئەوەی چەند سیخوڕێکی ڕژێمی ئێرانی لە تەمووزی ١٩٨٩، لە ڤییێنا، عەبدولڕەحمان قاسملووی سەرۆکی «پ. د. ک»ی ئێرانیان کوشت، زۆری نەبرد گەورە سەرکردەیەکی کۆمەڵەش لە لارنەکای قیبرس کوژرا. تا ئەوکاتی کە کۆمەڵە خۆی لە تووده دوور خستەوە و ناسنامەی کوردایەتیی خۆی لە ١٩٩١دا وەرگرتەوە، کۆمەڵە پەراوێز و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش لە ئێران سەرکوت کرابوو.

**کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبه الأمم) League of Nations**. ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی بوو، لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بەمەبەستی پاراستنی ئاشتی دامەزرا. بەپێی دەستووری کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەرکی دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی ویلایەتەکانی مووسڵ و بەغداد و بەسرە بە بەریتانیای مەزن سپێردراو ئەویش بەمەبەستی ئابووریی خۆی لە یەکتری بەستانەوە و عێراقی ئێستای لێ پێکهێنان. ئیتر بەمجۆرە بەریتانییەکان دەسەڵاتی کوردستانی باشووریان بەژێر دەست کەوت.

لە ١٩٢٦، ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان ململانێی سەر مووسڵ نێوان تورکیا و بەریتانیای بڕییەوە و بە فەرمی دانی بە لکاندنی مووسڵ بە عێراقەوە نا. لەهەمان کاتیشدا کۆمسیۆنی بەدواداچوونەوەی نێونەتەوەیی کە ئەنجوومەنی کۆمەڵە دایمەزراند مەرجی ئەوەی دانا کە:- (دەبێ ڕیز لە ویست و ئارەزووی کورد بگیرێ و بەڕێوەبەرەکان و دادوەرەکان و مامۆستایەکان دەبێ هەموو لە هەمان ڕەگەزی دانیشتوان بن و زمانی کوردی وەک زمانێکی فەرمی لە هەموو چالاکییەکانیاندا بەکار بێنن.) هەرچەندە دواتر دەسەڵاتدارانی عێراق (یاسای زمانە ناوچەییەکان، قانون اللغات المحلية)یان دەرچوواند، بەڵام ئەم خواستانەی کورد هەرگیز لە پەیمانی ئەنگلۆ-عێراقی ساڵی ١٩٣٠دا، ڕەچاو نەکران. پەیمانەکە لە ١٩٣٢، سەربەخۆیی بە عێراق دا. هەرکە عێراق سەربەخۆیی وەرگرت، یەکسەر لە کۆمەڵەی نەتەوەکاندا بووە

ئەندام. عێراق لە ناو چینی یەکەمی وڵاتانی جیهانی سێیەم بوو کە لەو کۆمەڵەیە وەرگیرا.

**کۆن-کورد (کۆنفیدراسیۆنی کۆمەڵەی ڕێکخراوە کوردییەکان لە ئەوروپا).** چەترە ڕێکخراوێکە، سێبەر لە ١٢٩ ڕێکخراوی کۆمەڵە کوردییەکان لە سەرتاسەری ئەوروپای ڕۆژئاوادا دەکا. ئەو کۆنفیدراسیۆنانەی لە نۆ وڵاتدا کار دەکەن و کۆن-کورد پێک دێنن ئەمانەن: یەک-کۆم لە ئەڵمانیا و فەی-کۆم لە ئەوستێریاو فەک-بەل لە بەلجیک و فەی-کورد لە دانمارک و فەیکا-کوردستان لە فرەنسا و فەد-کۆم لە هۆڵندا و فەد-بری لە بەریتانیا و کوردستان-ڕادەت لە سوێد و فەکاریش لە سویسرا.

**کۆنگرا دێمۆکراسی و ئازادییا کوردستان (کاداک).** ناوی تازەی پارتی کرێکارانی کوردستانە؛ لە شوباتی ٢٠٠٢وەوە بەکار هات. گۆڕینی ناوەکە هێمای ئەوەبوو کە «پ. ک. ک» ویستی بە پارتێکی سیاسیی کوردی لە تورکیا بناسرێ و ڕێگەی پێ بدرێ تا لە پێناوی سەقامگیرکردنی دیموکراسی و دانانان بە مافە کولتوورییەکانی کورد لە تورکیا خەبات بکا. عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە زیندانەکەیەوەڕا بە سەرۆکی شانازیی کاداک هەڵبژێردراو دەستەی سەرۆکایەتیش کاروباری ڕۆژانەی بەڕێوە دەبا.

تورکیا تا ساڵی ٢٠٠٧یش هەر بە پیکی خۆی دەیژەنی و دەیگوت ناوگۆڕین بەس نییە بۆ ئەوەی کاداک بە پارتێکی یاسایی ڕەوا بناسرێ. تا کۆتاییی ٢٠٠٢، شتێک لە تورکیا بە دیار کەوت کە چاکسازی هێدی هێدی لەو وڵاتەدا خەریک بوو بەسەر پێ دەکەوت، چونکە تورکیا دەیەویست لە یەکێتیی ئەوروپا وەربگیرێ، بۆیە ناچار دەبوو ئەم چاکسازییانە لە یاسا و پەیڕەو و پرۆگرامی دەوڵەتدا بکا.

**کۆنگرا نەتەوییا کوردستانێ (KNK).** بە فەرمی لە ١٩٩٩، دامەزرا. دامەزرانی ئەو کۆنگرەیە بەمەبەستی ئەوە بوو کە ڕێکخراوێک بێ بتوانێ لە پەرلەمانی کوردستان لە بانشگە پتر جەماوەری کوردی بە دەوری خۆیدا کۆ بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی. پەرلەمانا کوردستانێ ل دەرڤەیێ وەڵات خۆی لە ناو ئەم کۆنگرەیەدا تاواندەوە. عیسمەت شەریف وانلی بە سەرۆکی ئەم کۆنگرەیە هەڵبژێردرا.

کۆمیتەیەکی ڕاپەڕاندنیش لە عەبدولڕەحمان جادرچی، زوبێر ئایدار، نادر نادرۆڤ، فیکری ئاهو، حاجی ئەحمەدی و نەبیل حەسەن پێک هێندرا. بارەگای کنک لە برۆکسل بوو.

کۆنگرا نەتەوییا کوردستانیش، وەک پەرلەمانا کوردستانێ ل دەرڤەیێ وەلات، ئەویش نەیتوانی کورد بۆ خۆی ڕابکێشێ؛ چونکە هەر بە ڕووی ئەو دیوی «پ. ک. ک» دەناسرا. لە ڕاستیدا، یەشار قایای سەرۆکی پەرلەمانا کوردستانێ ل دەرڤەیێ وڵات، دژی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانەکە بوو، هەر بۆیەش خۆی لە کنک دوور خستەوە و پێوەندیی پێیەوە نەکرد.

**کۆنگرەی نەتەوەیی کورد لە باکوری ئەمریکا (KNC).** گرووپێکە بەزۆری لەو پیشەوەرانە Professionals پێک هاتووە کە لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەژین، بەڵام هەندێکی کەنەدیشیان لەگەڵدا هەیە. کۆنگرەی نەتەوەیی کورد لە ١٩٨٩ دامەزراوە و خەباتێکی ئاشتییانە لە پێناوی کوردستانێکی یەکگرتووی سەربەخۆ دەکا و هەموو ساڵێک کۆنفراسی ساڵانەی خۆی ڕێک دەخا. هەر لە کاتی دامەزرانییەوە تا ئێستا، توانیویەتی بە شێوەیەکی بەرچاو کێشەی کورد بۆ خەڵکی وڵاتە یەکگرتووەکان ڕوون بکاتەوە و پشتیوانیی بۆ پەیدا بکا. پێوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ حکوومەتی هەرێمی کوردستان، لە کوردستانی عێراقدا هەیە. لە ٢٠٠٣، حیکمەت فیکرەت سەرۆکی بووە. سەرۆکەکانی پێشووی سامان شاڵی و فواد دەروێش و نەجمەدین کریم و ئەسعەد خێلانی بوونە. ماڵپەڕیشی ئەمەیە:

www. kurdishnationalcongress. org

**کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی (INC).** ڕێکخراوێکی بەرهەڵستکاری ڕژێمی سەدام حوسێن بوو، کە لە دوای شەڕی کەنداو، لە ئۆکتۆبەری ١٩٩١، بە فەرمی دامەزرا. بەشێکی یارمەتیی دارایی لە ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی CIA یەوە بۆی دەهات. کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی هەوڵی دا هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگەی عێراقی لە خۆ بگرێ. بەمجۆرە، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و گرووپە ئیسلامییە کوردییەکان ڕۆڵی سەرەکەییان لەو کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقدا گێڕا. ئەنجوومەنی سەرکردایەتی لە مەسعوود بارزانی و محەمەد بەحرولعلوومی

گەورە مەلای شیعەکان و لیوا روکن حەسەن مستەفا نەقیبی سوننە و گەورە ئەفسەری پێشانی سوپای عێراقی پێک هات. ئەحمەد چەلەبی، شیعە و، بانکەوان و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا لە بیرکاری، بە سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن هەڵبژێردرا، بەمجۆرە ئەو سەرپەرشتیی چالاکییەکانی ڕۆژانەی دەکرد.

ئامانجی فەرمیی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی رووخاندنی رژێمی سەدام و دامەزراندنی عێراقێکی فیدرالی و دیموکراتی بوو. پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان هەردووکیان لەو باوەڕەدابوون ئەگەر ئەو ئامانجانە جێبەجێ بکرێن، ئەوا کێشەی کورد لە عێراق چارەسەر دەبێ.

لە ١٩٩٥، کۆنگرە بە هاندانی ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی، ویستی پەلاماری بەغداد بدا. بەڵام کاتێک کە CIA پشتی لە کارەکە کرد، هەوڵەکە هەرەسی هێنا. لە سێپتێمبەری ١٩٩٦، بەدەستپێشخەری «پ. د. ک» سەدام حوسێن بۆ ماوەیەکی کورت خۆی خزاندە ناو شەڕی «پ. د. ک» – ی.ن.ک و هەلەکەی قۆستەوە و ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی لە باکوری عێراقبوون و دەستی گەیشتنێ، هەمووی گلدانەوە و ٩٦ کەسی لێ ئیعدامکردن. هەرچەندە پاشتر وڵاتە یەکگرتووەکان بە ساردی پشتیوانیی خۆی هەر لێ دەکرد، بەڵام ئیتر کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی هەرگیز وەک خۆی لێ نەهاتەوە. دووبەرەکی ناوخۆی کۆنگرەش هێشتا لە کاریگەرییەکەی کەمتر کردەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، لە دوای پەلامارە تیرۆریستییەکەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١، وڵاتە یەکگرتووەکان ویستی هەناسەی وەبەر INC بێنێتەوە؛ چونکە پەلامارە تیرۆریستییەکان واشنتنیان ناچار کرد کە شەڕ دژی تیرۆریزم جاڕ بدا و بە شێوەیەکی ئاساییش سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراقیان تێوە گلاند. لە دوای پرۆسە سەربازییەکەی بۆ ئازادکردنی عێراق لە ٢٠٠٣ کراو لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، بەغداد ئازاد بوو، کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی بۆ ماوەیەکی کورت چالاکیی سیاسی و یاسایی دیاری هەبوو، بەڵام پاشان ئیتر بەدەگمەن ناوی دێت و چونکە پشتیوانییەکی دیاری لە ناو عێراقیشدا نەبوو، بۆیە نەیتوانی پۆستێکی سەرەکی لە حکوومەتە هەڵبژێردراوەکەی وڵات بەدەست بێنێ. بە کردەوە INC نەماوە.

# ل

**لاچین.** پایەتەختی کوردستانی سوور بوو. لە ١٩٢٠ـەکان، سۆڤیەت بۆ ماوەیەکی کورت لە ئازەربایجان، کوردستانی سووری دامەزراند. ڕووبەری کوردستانی سوور ٥,٢٠٠ کیلۆمەتر دووجا دەبوو. سنوورەکەی ٤٠ کیلومەتر لە باشووری شاری دێرینی گەنجە "کرۆڤاباد"ەوە دوور بوو. لەوێوەڕا سنوورەکەی بەرەو باشووری ڕۆژئاواوە دەچوو تا خۆی لە ڕووباری ئاراس دەدا و دەگەیشتە سنووری ئێران و لەوێشەوەڕا بەرەو ڕۆژهەلات دەهاتەوە و خۆی لە هەرێمی ناگۆرنۆ قەرەباغ گیر دەکرد.

لە ناو سنووری ئازەربایجان، کوردستانی سوور هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی (ئویەز) بوو. جگە لە شاری لاچین، قوچە شاری کەڵباژێر و قوبادی و زەنگەنانیشی دەگرتەوە. بەرێوەبەرایەتی ناوچە لاوەکییەکانی قەرەقوشلار و کۆترلی و موراد خانی و کورد حاجیش لە ژێر دەسەڵاتی کوردستانی سووردا بوو. نزیکەی هەموو دانیشتوانەکەی کوردبوون. لە ڕۆژانی سەروەریدا، لاچین حکوومەتێکی کوردیی هەبوو. گوسی گازێڤ (یوسف حاجێڤ) سەرۆکی حکوومەتی کوردستانی سوور بوو. خوێندن لە قوتابخانەکان بە زمانی کوردی بوو، فەرمانەکان بە زمانی کوردی دەردەچوون. لە شووشە پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایان هەبوو، هەموو کتێبەکانی کوردی بوون؛ بە زمانی کوردیش وانەکان دەگوترانەوە؛ پەخشی ڕادیۆ بە کوردی بوو؛ وەرزنامەیەکی کوردی بە ناوی (سۆڤیەتسکی کوردستان) دەردەچوو. عەرەبی شەمۆ، ڕۆماننووسێکی ناوداری کوردی سۆڤیەت بوو، یارمەتیی پەرەپێدانی ئەلفوبێی کوردی دا. کوردە سۆڤیەتییە ناودارەکان ئەمانەبوون؛ جاسمی جەلیل و میهەیل ڕەشید و ئەتاری سەرۆ و ئوسیڤە بەکۆ و قاچاخی موراد و وەزیری نادری و ئەمینی عەڤداڵ و حاجی جوندی و سەمەدی سیابەند بوو. سەمەدی سیابەند پاڵەوانێکی یەکێتیی سۆڤیەت بوو.

لە ١٩٢٩، ئازەربایجان ئۆتۆنۆمییەکەی لە لاچین سەندەوە و لە ناوچەیەکی

ئۆتۆنۆمییەوە پلەکەی کەم کردەوە و کردییە پارێزگایەک (ئۆکروگ)و بەمجۆرە ئەزموونەکەی دەوڵەتی سۆڤیەتی کە تایبەت بوو بە خودموختاریی کورد، لەناو برد. ئەم کردەیە لە کاتێکدا بوو کە جۆزیف ستالین خەریک بوو ڕەنەی دیکتاتۆریی خۆی لە یەکێتیی سۆڤیەت گیر دەکرد. ئەو هەنگاوە لەوەوە هات تا پێوەندیی باشی خۆی لەگەڵ زۆرینەی ئازەریی ناو وڵاتی سۆڤیەت و لەگەڵ تورکیاش بپارێزێ. بەمەش ڕانەوەستا، بەڵکو لە ١٩٣٧، پارێزگایە کوردییەکەشی نەهێشت. زۆربەی کوردەکانی ئەوێ جاری یەکەم لە ١٩٣٧و بۆ جاری دووەمیش لە ١٩٤٤، لە شوێنەکانی خۆیان ڕاگوێزران. پاسپۆرتە سۆڤیەتییەکەی هەندێ لە کوردەکانیان گۆڕی و بە ئازەرییان تۆمارکردنەوە. ئەوانەی کە ڕەگەزنامەی کوردیی خۆیان وەرگرتەوە ڕووبەڕووی جیاوازیی ڕەگەزی بوونەوە. لەگەڵ ئەمەش، بەشی کوردی لە پەیمانگەی توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتی لە باکۆی پایەتەختی ئازربایجان، تا ١٩٦٠ لە کار نەخرا. کەچی خوێندنی کوردی لە ئامۆژگاکانی مۆسکۆ و لیننگراد و یەریڤان دانەخران و هەر مانەوە.

چونکە سەرژمێرییەکی ڕاست و دروست لەبەردەستدا نییە و چونکە ژمارەیەکیش لەناو گەلانی دراوسێیاندا تواونەتەوە، بۆیە ژمارەی تەواوی کورد لە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا نەزاندراوە، بەڵام وا خەملێندراوە کە سەرژمێری کورد لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوودا لە نێوان کەمتر لە ١٠٠,٠٠٠ تا هەوراز یەک ملیۆن بێ. زۆربەیان ڕەنگە لە ئازەربایجان بژین. جگە لەوێ کورد لە ئەرمەنیا، جۆرجیا، کازاخستان، قرگیزستان، ڕووسیا، ئوزبەکستان، تاجیکستان، تورکمانستان و چەند شوێنێکی تریشدا دەژین. دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، کوردی بەناوودەنگ نادر نادرۆڤ، کتێبێکی دەربارەی ژان و ئازارەکانی گەلی کورد لە سەردەمی ستالین بڵاو کردەوە.

**لالش (لالشا نووورانی)**. پیرۆزترین مەزاری کوردە ئێزیدییەکانە و لە ناوچەی بادینانی هەرێمی کوردستانە و نزیکەی ٦٠ کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری مووسڵە. لالش پەرستگایەک و گڵکۆی شێخ ئادی لێیە. شێخ ئادی گرینگترین کەسایەتی ئاینی ئێزیدییە.

**لەک.** گەورەترین هۆزی کوردە لە باشووری کوردستانی ئێران جێگیرن. هەندێک دەڵێن ناوەکە لە وشەی "لەک"ی فارسییەوە هاتووە کە دەکاتە ۱۰۰,۰۰۰و ئەوەش بۆ ئەوە هاتووە کە گوایا ئەو هۆزە لە سەرەتادا لە سەد هەزار خێزانێک پێک هاتووە. هەندێ جار لەک لەگەڵ لوڕ تێکەڵی یەکتری دەکرێن، ڕاستە هەردووکیان لە لایەنی سروشتی فیزیکییانەوە پێک دەچن، بەڵام لە ڕووی زمانەوانییەوە لە یەکتری جودا دەکرێنەوە.

هەرچەندە لەک ئێستا لە باکوری لوڕستان دا دەژین، بەڵام پێشتر لە باکووڕەوەڕا کۆچیان هێناوە و لەو ناوەدا نیشتەجێ بووینە. شەرەفنامە دەڵێ لەک چینی دووەمی خێڵەکانی کوردە و پێشتر هاووڵاتی بەردەستی فارس بووینە. لەک ئێستا پەیڕەوی ئاینی ئەهلی هەق دەکەن. سەردارە هەرە ناودارەکەی لەک، کەریم خانی زەند بووە. کەریک خان لە ۱۷۵۱ـەوەڕا تا ۱۷۹٤ فەرماڕەوای وڵاتی فارس بووە.

**لەیلا زانا (۱۹٦۱–        ).** خانمێکی کوردە، وەک ئەندامێکی پارتی کارکەرێن گەل (هەپ) لە ۱۹۹۱، بەئەندام پەرلەمانی تورکیا هەڵبژێردرا. لە کاتی سوێندخواردنی یاساییی پەرلەمانیدا، لەیلا زانا دەسرۆکی بە ڕەنگە نەتەوەیییەکانی کوردی لە سەرنابوو؛ کاتێک کە جاڕی دا و گوتی: "ئەز وێ سوندێ بۆ برایەتی دوو گەلی تورک و کوردا دخۆم" هەستی نەتەوەییی هەمووانی جووڵاندەوە.

لە ئاداری ۱۹۹٤، لەیلا زانا و پێنج ئەندام پەرلەمانی دیکە لە پارتی دیموکراسی کە لە جێی (هەپ) بوو، چەتارەی پەرلەمانییان لەسەر لادرا و دەستگیر کران. ئینجا لەیلا زانا، تاوانی بڵاوکردنەوەی پرۆپاگەندەی جوداخوازی خرایە ئەستۆ و حوکمی ۱۵ ساڵ زیندانی بەسەردا درا. کێشەی خانمی زانا بووە کێشەی سەرەکیی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤی کورد. دوای پتر لە ٥ ساڵ لەیلا زانا لە سەرەتای هەزارەی سێیەم لە زیندان ئازاد کرا. لەیلا زانا هاوسەری مەهدی زانایە.

**لبنان.** لەگەڵ هاتنی ئەیوبییەکان، لە سەدەی ۱۲، کورد لە لبنان جێگیربوون. پاشتریش چەند گرووپێکی دیکەی کورد ڕووی لەو وڵاتە کرد. زۆربەی ئەو شەپۆلانەی کۆچبەرانی کورد لە ئەنجامی سیاسەتی ڕاگوێزان بووە کە کاربەدەستە عوسمانییەکان دژی کورد پەیڕەویان کردووە. ئەو کۆمەڵە کوردانە زوو لە ناو کۆمەڵی

گەورەتری لبنانییان تواونەتەوە. جەنبۆلاتییەکان باشترین نموونەی ئەو کوردانەنە کە ئێستا سەرکردەی دورزییەکانن. ئەوانی تریش سایفییەکانی تەڕابلس و میربییەکانی عەککار و عیمادییەکانی جەبەل لبنان و حەمییەکانی بەعلەبەکینە.

ئێستا لە نێوان ٧٥,٠٠٠ تا ١٠٠,٠٠٠ کورد لە لبنان دەژین. ئەو کوردانە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بە چەند شەپۆلێک کۆچیان بۆ لبنان کرد. شەپۆلی یەکەم لە دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی ١٩٢٠و لە ترسی سەرکوتکاریی تورکەکان، نیشتمانی خۆیانیان لە ناوچەی ماردین/ تورعابدین بەجێ هێشت و لە لبنان خۆیان گرتەوە. شەپۆلی دووەم لە سووریاوەڕا هات. کوردی سووریا لە ترسی ئەو سەرکوتکارییە بێ ئەندازەیەی لە دوای ١٩٥٨ دژیان دەستی پێ کرد، پەنایان بۆ لبنان برد. لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییش، شەپۆلێکی دیکەی کوردی تورکیا ڕووی لە لبنان کرد. بە گشتی کوردەکانی لبنان دووەم گەورەترین گرووپی غەیر عەرەبن؛ تەنیا ئەرمەنییەکان لەوان زۆرترن.

هەموو کوردە لبنانییەکان موسڵمانی سوننەنە و سەر بە چەندین خێڵ و گرووپی کۆمەڵایەتیی جیاوازن، جا بەڕەچەڵەک یان دەچنەوە سەر گرووپی گوند یان سەر بە هەرێمە ڕەسەنەکانیانن. زۆریان هەمیشە پەرۆشی ڕەگەزنامەی لبنانییان هەیە؛ چونکە پێیان نادرێ. چونکە کوردەکانی لبنانی بزووتنەوەیەکی سیاسیی کاریگەریان نییە کە بتوانێ داکۆکی لە مافەکانیان بکا؛ بۆیە زۆربەیان لە بارێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی نالەباردا دەژین و بە هۆی شەڕی ناوەخۆی لبنانەوە لە ١٩٧٥ تا ١٩٩١ لە ئاستێکی زۆر خراپدا دەژیان.

کوردەکانی لبنان، فرە کەڕەت دەبنە قوربانیی دەستی ڕکبەڕکێ و پەراوێزکردن و توندوتیژییەوە. چونکە ڕەگەزنامەیان نەبووە، نەیانتوانیوە خاوەنی موڵک وماڵی خۆیان بن. یاسا بەشێوەیەکی یەکسان پارێزگارییان لێ ناکا. مافی دەنگدانیان نەبووە. لە کاری گشتیش دوور خراونەتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا کوردەکانی لبنان خەریکن بە ڕادەیەکی باش ڕەگەزنامەی لبنانی وەردەگرن و باری گوزەرانی خۆشیان باش دەکەن.

**لوڕ.** بەشێکن لە گەلی کورد و ئەوانیش لەگەڵ یەکێک لە شەپۆلەکانی کۆچی

کوردان لە باکورەوەڕا هاتوونە و لە ناو شاخەکانی زاگرۆس جێگیر بووینە. لە ئێران ئوستانێک بە ناوی لوڕستان هەیە و زۆرینەی دانیشتوانەکەی لوڕی کوردن. زۆرینەی لوڕ پەیڕەوی ڕێبازی شیعە دەکەن کە ڕەنگە ٧٠٪ بن و ٢٠٪یشیان پەیڕەوی دینی ئەهلی هەق دەکەن و ئەوەی ماوەش کە ڕەنگە لە ٨٪ ڕەت نەدەن موسڵمانی سوننەنە. لە سەرەتای سەدەی ١٩م، دینی لوڕەکان ئاڵۆزوپاڵۆز و شێواو بوو، کەس نەیدەزانی چ ئاینێک پەیڕەو دەکەن، بۆیە محەمەد عەلی میرزا بە ناچاری ناردی هەندێ مەلای زانای هێنا ئەو ناوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە موسڵمان بکەن.

چەند سەدەیەکە هەوڵی ئەوە دەدرێ کە لوڕ لە کورد جودا بکەنەوە. شەرەفنامە لە ١٥٩٦، باسی دوو بنەماڵەی لوڕی لەگەڵ بنەماڵە دیارەکانی کورد دەکا و دەڵی بنەماڵەی شاهانە بووینە و سەربەخۆیی تەواویان هەبووە.

زۆربەی وشەکانی شێوەزاری لوڕی، هێشتا هەر کوردینە؛ بەڵام دەربڕە pro-nunciation و ڕێزمانی فارسینە. لوڕی دوو شێوەزاری جودای هەیە؛ لوڕی گەورە؛ بەختیارییەکان ئەم دیالەکتە بەکار دێنن و لوڕی گچکەش خودی لوڕەکان خۆیان بەکاری دەبەن. بەختیارییەکان خێڵێکی لوڕینە. ئەمانە وەک جمگەیەکن کە کورد و لوڕ بەیەک دەگەیەنن.

پیاوانی لوڕ بە ڕیش زلی ناوبانگیان هەیە و هەندێ جار لوڕستان بە "گۆمڕی ڕدێن" ناوزەد دەکرێ. لە سەرەتای ١٩٢٠ـەکان، بە بیانووی بە شارستانیکردنی لوڕەکان، ڕەزا شای پەهلەوی، بۆ ئەوەی نیشتەجێیان بکا، هێزی لەدژ بەکارهێنان.

بابەتاهیری هەمەدانی ٩٣٥–١٠١٠، گەورە شاعیری کوردی لوڕە و لە شیعرێکیدا دەفەرمێ:

بە خەنجەر گەر دەرارەند دیدەکانم
بە ئاتەش گەر بسوزەند ئیستخوانم
ئەگەر بەر ناخونانم نەی بگوویەند
نەگیرەم دڵ ز یارێ میهرەبانم

واتە:

به خەنجەر گەر دەربێنن دیدەکانم
به ئاگر گەر بسووتێن ئێسقانم
ئەگەر بێ و لەتلەتم کەن پارچە پارچە
هەڵناگرم دەست لە یاری میهرەبانم

**لێبوردنی نێونەتەوەیی Amnesty International** (AI). ڕێکخراوێکی تایبەتی ناحکومیی نێونەتەوەییە؛ بۆ ئەوە کار دەکا ڕێگە لە حکوومەتەکان بگرێ و نەهێڵێ هەندێک لە بنەمای مافەکانی مرۆڤی گەلەکانیان بە ترسناکترین شێوە پێشێل بکەن. لە ١٩٦١ دامەزراوە. گەورەترین ئامانجی لێبوردنی نێونەتەوەیی ئەوەیە کە هەموو زیندانییانی ویژدان ئازاد بکا؛ دادگاییکردنێکی ڕاست و ڕەوا بۆ زیندانییانی سیاسی مسۆگەر بکا؛ سزای کوشتن و ئەشکەنجەدان و هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێکی ناشایستە و توندوتیژی دژی زیندانییان نەهێڵێ؛ هەموو جۆرە ئیعدامێکی بێ دادگاییکردن ببڕێتەوە. بەمجۆرە ئامنێستی ئینتەرناشناڵ لەمێژە باشترین پشتیوانی لە مافەکانی مرۆڤی کوردی کردووە و دەکا. هەر لەبەرئەمەشە ئەو حکوومەتانەی کە گومانی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤی کوردیان لێ دەکرێ، ڕەخنەی توند ئاراستەی ئەم ڕێکخراوە دەکەن. لێبوردنی نێونەتەوەیی کاری بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو پێشێلکارییانەی مافەکانی مرۆڤ کرد کە هەندێ ڕێکخراوی کوردی ئەنجامیان دا؛ وەک ئەوەی لەمیانی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ناوەڕاستی ١٩٩٠ـەکاندا لە باکوری عێراق ڕووی دا. ئامنێستی ئینتەرناشناڵ لە ١٩٧٧ پاداشتی نۆبڵی لە بواری ئاشتی پێ درا.

## م

**مـەدام مـیـتـران (١٩٢٤-      )**. زۆربەی ڕۆژنامـە کـوردییـەکـانی لە دوای ڕاپەڕین دەردەچوون، بە نازنـاوی (دایکی کـورد) ئامـاژەیان بۆ دانیـال مـیـتـران دەکـرد. خـانم دانیـال هـاوسـەری سـەرۆکی پێشـتـری فـرەنسـا، فـڕانسـوا مـیـتـیـڕا بوو. مـاوەیەکی زۆر بەرگـریی لە مـافـەکـانی کـورد و داکـۆکـیشـی لـە کـێشـە ڕەوایەکـەی کـرد. لەمـیـانـی کـۆڕەوەکـەی ١٩٩١، دانـیـال هـانی فـڕانـسـوای مـێـردی دا بۆ ئەوەی پشـتـیـوانی لەو پەناهەندە کوردانە بکا کە لە چنگی دڕندەییی سەدام حوسـێنی ولاتیان چۆڵ دەکرد. خانمی دانیال میتران لە ڕادەبەدەر پشتیوانی ئەنستیوتی کوردی لە پاریس کرد.

**ماردین (مێردین)**. شـارێکی خنجـیلانـەی شـاخـاویی کـوردسـتـانی باکـورە و لەلای باشـوورەوەڕا کـەوتـووەتە سـەر سنووری ولاتـی سـووریـاوە و بەشی باکـوری جـزیری بۆتـان پێک دێنێ. زۆرینـەی هـەرەزۆری دانـیـشـتـوانەکـەی کـوردن، بەلام عـەرەب زمانـیشـیـان لەگەڵدا دەژی. چەندین ساڵ بوو ناوچەی ماردین بە پێی یاسای عورفی تورکـان حـوکم دەکـرا. ناوچەی مـاردین مـەڵبەندێکی چالاکـییـەکـانـی گـەریلای پارتـی کرێکارانی کوردستان بوو.

**مارگرێت جۆرج (؟   -١٩٦٦)**. لە ١٩٦٠ـەکـاندا، ژنە پێشـمـەرگـەیەکی ئاشـووری بوو؛ ناوبانگی بەوە دەرکـرد کە سـەرلقی پێشـمـەرگـە نێرینەکـان بوو. پێشـمـەرگـەکـانی تر وێنـەی مـارگـرێتـیـان لە بەیرەی خـۆیـانـدا هـەڵدەگـرت، ئـینـجـا بـۆ بەرەکـانـی شـەڕ دەڕۆیشتن؛ بـاوەڕیان وابوو کـە وێنـەی ئەو ئافـرەتە لـە دەسـتـی دوژمنیـان دەپارێزێ. مارگرێت بووە پەریی خەونـی کوڕانی کورد. دەڵێن پاش ئەوەی داوای کرد پۆستێکی سەرکردایەتی بدرێتێ، کوژرا.

**مافەکانی مرۆڤ**. بریتییـە لەو ئازادییە شەرعییە نێونەتەوەیی و لەو سەروەرییانەی کـە هـەر تاکـە کەسـێک، بە هۆی مـرۆڤـبـوونـی هـەیەتی. هـەرچـەنـدە گـەلێ کـولتـوور و شـارسـتـانی چەندین بیرۆکـەیان دەربارەی بەهـای ڕاسـتـەقـینە و شـەرەفی مرۆڤـیـان گـەشـە پێ کـردووە، بەلام بـنچـیـنـەی پێناسـەی هـاوچەرخی مـافـەکـانی مـرۆڤ لەو

بەڵگەنامە ڕۆژئاواییانەی وەک جاڕدانی مافەکانی مرۆڤDeclaration of Human Rights و دۆکیۆمێنتی هاووڵاتی Citizen ١٧٨٩، لە فرەنسا و یاسای مافەکان Bill of Rights و ١٧٩١ لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا هاتووە. بەریتانیای مەزن لە ١٨١٥ دەستی پێ کرد بازرگانی کۆیلە بنبڕ بکا. ئەو پەیمانانەی ئاشتی کە شەڕی یەکەمی جیهانییان بڕییەوە، پارێزگاریی دانیشتووانی بن دەسەڵاتی کۆمەڵەی نەتەوەکان League of Nations و کەمینەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەورووپای مسۆگەر کرد و ڕێکخراوی کرێکارانی نێونەتەوەییش International Labour Organization بنەماکانی کارکردنی نێونەتەوەیی بە دیار خست.

بەڵگەنامەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەروازەیەکی نوێی لە پێش پاراستنی مافەکانی مرۆڤ کردەوە کە ئەمەش پێوەندییەکی ئاشکرای بە کوردەوە هەیە. بەندی یەکەم بڕیتییە لە ئامانجی ئەم ڕێکخراوە نێونەتەوەییە کە: (هانی بەهێزکردنی مافەکانی مرۆڤ و ڕیزگرتن لەو مافانە دەدا و پشتیوانی لە بنەماکانی ئازادی بۆ هەموو کەسێک دەکا، بێ ئەوەی ڕەچاوی جیاوازی ڕەگەزی یان ڕەچەڵەک یان زمان یانیش ئاین بکا.) بەندی ٥٥یش هەمان بابەت دووبارە دەکاتەوە، کەچی بەندی ٥٦ جاڕی ئەوە دەدا کە: (هەموو ئەندامەکان پەیمان دەدەن، چ بە تەنیا بێ یان چ وێکڕابن، بە هاوکاری لەگەڵ ئەم ڕێکخراوەدا بۆ ئەوە کۆشش بکەن تا ئەو ئامانجانەی لە بەندی ٥٥دا هاتووە، هەموویان جێبەجێ بکەن.) هەرچەندە بڕگەی یاسای ناوخۆی بەندی ٢(٧) وا ناڵێ، بەڵام ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان UN Charter کراوە وا ڕاڤە دەکرێ کە کۆسپ لە پێش نەتەوە یەگرتووەکان دروست ناکا تا لێکۆڵینەوە لەو پێشێلکارییانەی مافەکانی مرۆڤ بکا کە وڵاتانی ئەندام دژی هاووڵاتییان دەیکەن.

لێرە شایستەیە باسی جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤیش بکەین کە لە ١٠ی دیسێمبەری ١٩٤٨، بە تێکڕای دەنگی ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکان دەرچووە. هەرچەندە پەیمانە نێونەتەوەییەکانی تایبەت بە مافە شارستانی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان International Covenants on Civil and Political Rights and on Economic, Social and Cultural Rights ،

له بنەڕەتدا هەر بڕیارێک بوو، دەرچوو، بەڵام پاشان بووە یاسایەکی نێونەتەوەیی زۆربەی بەشەکانی جاڕدانی مافەکانی مرۆڤی جیهانی لە خۆ گرتوو و لە ١٩٧٦ بەکار کەوت هەموو ئەو وڵاتانەی کە بەڕاستیان ناسیوە دەبێ پەیڕەوی بکەن.

لەوەتی شەڕی دووەمی جیهانییەوە ژمارەیەکی دیکەی پەیمانەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ بوونەتە یاسای نێونەتەوەیی. لەوانە لە ١٩٤٨، پەیمانی ڕێگەگرتن و سزادانی جینۆساید و لە ١٩٦٥یش پەیمانی نێونەتەوەیی بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرەکانی جوداکاریی نەژادی و لە ١٩٧٩ش پەیمانی نەهێشتنی هەموو شێوەکانی جوداکاری دژی ئافرەت و لە ١٩٨٤یش پەیمانی دژی ئەشکەنجە و هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێکی دڵڕەقانە و نامرۆڤانە و بێ بەهاکردن و سزادان؛ ئەمانە هەموو دەسەڵاتی یاسایان وەرگرت. هەر یەکێک لەو پەیمانە نێونەتەوەییانە پێوەندیی ئاشکرای بە کێشەی کوردەوە هەیە.

لە ١٩٩٩، سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ بە تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی کردبووی ڕاپێچی دادگای نێونەتەوەیی کرا. ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم دادگایەی دامەزراند بۆ ئەوەی لەو ڕووداوانە بکۆڵێتەوە کە لە ١٩٩١ـەوەڕا لەسەر خاکی یۆگوزلاڤیای جاراندا کرابوون. ئەمە ئەوە نیشان دەدا کە هەمان جۆرە پرۆسە دەشێ بە شێوەیەکی یاسایی لە دژی سەدام حوسێنیش بکرێ، جا ئەگەر سیاسیش نەبێ، دەشێ بەهۆی ئەو تاوانانەی کە لە ماوەی ساڵانی فەرماندارییەکەی لە دژی کوردی کردووە، دادگایی بکرێ؛ شاڵاوەکانی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە نموونەی زەقی ئەو تاوانانەن.

ئەگەر ئەو ئاستەنگانە لە بەرچاو بگرین کە لە جیهانێکی فرە چەشنی، فرە کولتووردا، لە پێش جێبەجێکردنی یاسا نێونەتەوەییەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤدا هەنە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دەشێ پەیمانە نێونەتەوەییەکان لە ئاستێکی هەرێمیدا بە شێوەیەکی ئاسانتر لەم یاسا نێونەتەوەییانە جێبەجێ بکرێن. بۆ نموونە، ئەنجوومەنی ئەورووپا ئێستا ٤١ دەوڵەتی ئەندامی هەیە و تورکیاش یەکێکە لەو ئەندامانەی. لە مێژووەکی زووی سەرەتای دامەزرانییەوە، ئەنجوومەنی ئەورووپا پەیمانی ئەورووپیی بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی

نووسییەوە و لە ١٩٥٣ بەکار کەوت. لەوکاتەوە تا ئێستا چەندین پرۆتۆکۆل و ڕێککەوتنی لاوەکی خراوەتە سەری و لە ئەنجامدا هەموو یاسا هەرێمییە نێونەتەوەییەکانی تایبەت بەو مافە بنەڕەتییانەی مرۆڤی گرتووەتەوە کە لە جاڕی نێونەتەوەیی مافەکانی مرۆڤدا هاتوون و هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئەورووپا دەبێ بە ناچاری ملکەچی بن. کۆمسیۆنێکی مافەکانی مرۆڤی ئەورووپی ئەو مافانەی مرۆڤ دەپارێزی و گوێ لەو سکالایانەش دەگرێ کە دژی وڵاتانی ئەندامی ئەنجوومەنی ئەورووپا دەکرێن و پاشان ڕەوانی دادگای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤیان دەکا. جگە لە دەوڵەتان، تاکە کەس و کۆمەڵ و ڕێکخراوە ناحکوومییەکانیش دەتوانن سکالای خۆیان لەکن ئەو کۆمسیۆنە بکەن. بڕیارەکانی دادگاکە پابەندکارن binding؛ بۆیە دەشێ کۆمیتەی وەزیرانی ئەنجوومەنی ئەورووپا جێبەجێیان بکا. لە ١٩٩٩، دادگا بڕیاری لە سێدارەدانی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی ڕاگرت کە پێشتر تورکیا بە تاوانی خیانەت بە سەریدا سەپاندبووی. لە ٢٠٠٣ش دادگاکە داوای لە تورکیا کرد تا سەرلەنوێ ئۆجەلان دادگایی بکاتەوە.

پڕۆژەی مافەکانی مرۆڤی کوردی لە بەریتانیای مەزن، ئەم بەندانەی خوارەوەی پەیمانی ئەورووپی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤی دەستنیشان کردووە کە لەگەڵ کێشەی کوردی لە تورکیادا دەگونجێن: مافی ژیان؛ قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدان؛ قەدەغەکردنی کۆیلەیی و سوغرە؛ مافی ئازادی و ئاسایش؛ مافی دادگاییکردنی ڕەوا؛ ئەشکەنجەی دوور لە یاسا، نابێ هەبێ؛ مافی ڕیزگرتن لە تایبەتمەندییەکانی تاکە کەس و ژیانی خێزانی؛ ئازادیی بیرکردنەوە و نیهاد و ئاین؛ مافی هاوسەرگیری؛ مافی چارەسەرکردنێکی کاریگەریی نەخۆشی؛ قەدەغەکردنی جوداکاری؛ بۆ هەندێ ئامانجی دیاریکراو نەبێ، نابێ هیچ ڕێگەیەک لە کەس بگیرێ؛ لێکۆڵینەوەکردن لە هەموو کێشەکان و دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتییانە بۆیان؛ ئەگەر پێشێلکردنی پەیمانەکە، برینداری لێ کەوتەوە پێویستە بە شێوەیەکی گونجاو بریندارەکە چارەسەر بکرێ و قەرەبووشی بدرێتەوە؛ پاراستنی سامان؛ مافی پەروەردەکردن؛ مافی هەڵبژاردنی ئازاد؛ قەدەغەکردنی زیندانیکردن لەبەر قەرداری؛ ئازادیی بارکردن؛ قەدەغەکردنی ڕاگواستنی نەتەوەکان؛ قەدەغەکردنی دەرکردنی

بەکۆمەڵی بێگانە؛ نەهێشتنی سزای کوشتن؛ پاراستنی ئەو بیانیانەی ڕادەگوێزرێنەوە؛ مافی تێهەڵچوونەوە لە کێشەکانی تاوان؛ قەرەبووداندنەوەی ئەوانەی بە هەڵە سزادەدرێن؛ مافی دوو جار دادگایی نەکردن یان دوو جار سزا نەدان؛ مافی یەکسانیی لە نێوان هاوسەران. تا ئێستا دادگا لە گەڵێک کێشەی کوردانی دژی تورکیای کۆڵیوەتەوە و بڕیاریشی لەسەر داون و ئێستاش چەند هەزار کێشەی دیکە هێشتا لە ژێر پرۆسە دانە و چاوەڕێی بڕیار دەکەن. ئاشکرایە کە ئەو پرۆسە یاساییەی ئەنجوومەنی ئەوروپا بۆ سەپاندنی مافەکانی مرۆڤ ڕێکی خستووە، بواری زۆری بۆ بە دواداچوونی کێشەی کوردی لە تورکیا ڕەخساندووە.

جگە لەو پەرەپێدانەی کە لە یاسای نێونەتەوەیی و هەرێمیدا کراوە، یاسای هاوچەرخی نێونەتەوەیی زۆری دەربارەی کێشەی کورد پێیە؛ لەوانە هەندێک دەکەونە بەر ڕێساکانی یاسای نەرم Soft، یان یاسا بەو شێوەی کە ئێستا هەیە یان ئەو یاسایەی کە پێویستە لە ئایندەدا ببێ بە مەرجێ ئەو یاسایەی کە ئێستا کاری پێ دەکرێ؛ دانی پێدا بنێ. یاسای نەرم ئاماژە بۆ ڕێنوێنییە سەرەکییەکانی بەڕێوەبردن و بڕیار و ئاگادارییەکان دەکا؛ وەک ئەوانەی ئێستا لە شێوەی یاساکانی ژینگە و ئابووریی نێونەتەوەیی پەرەیان پێ دراوە، بەڵام هێشتا بە فەرمی کەس پێیانەوە پابەند نییە، لەگەڵ ئەمەشدا خۆ هەر گرینگیی سیاسی و یاسایی بەرچاویان بۆ ڕێنوێنییکردنی هەنگاوی سیاسی هەیە و لە ئایندەشدا سەرەتایەک بۆ ملکەچبوون بە ڕێسا نێوەنەتەوەییەکان، لە شێوەی پەیمانی لاوەکی یان یاسا نەریتییەکان، دادەنێن. نموونەی تایبەتی یاسای "نەرم"ی نێونەتەوەیی کە پێوەندیی بە کێشەی کوردەوە هەبێ بیرۆکەی مافی چارەی خۆنووسین و مافەکانی کەمینەکان و گەلە ڕەسەنەکان و ئیلتزاماتە یاساییە ناپابەندکارەکان کە یاسای کۆتایی هلسنکی لە ١٩٧٥ سەپاندوویەتی و ئەو بەیانانەی کە بە مەبەستی بەدواداچوونییەوە دەرکران و دەستێوەردانی مرۆییش دەگرێتەوە.

دەستێوەردانی مرۆیی خەریکە ڕێگەیەکی یاسایی بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی هەرکاتێک کە لە وڵاتێکدا بە شێوەیەکی خراپ مافەکانی مرۆڤ پێشێل کران، ڕێگە بە لایەنی سێیەم بدا تەنانەت هێزی چەکداریش بەکاربێنێ، بۆ ئەوەی بچێتە ناوەوە و

پێشێلکارییەکە ڕابگرێ. ڕەنگە چوونی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتیی ولاتە یەکگرتووەکان بۆ ناو خاکی باکوری عێراق بۆ ئەوەی لە دوای هەرەسهێنانی ڕاپەڕین و کۆڕەوی نیسانی ۱۹۹۱، کوردان بپارێزێ، نموونەیەکی ئەم شێوە دەستێوەردانە بێ. بڕیارە بێ پێشینەکەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٥ی نیسانی ۱۹۹۱، "سەرکوتکردنی دانیشتوانی سیڤیلی عێراقی...لە ناوچە کوردنشینەکاندا" ڕیسوا و سەرکۆنە کرد و "دەرئەنجامەکانیشی هەڕەشە لە ئاشتی نێونەتەوەیی و ئاسایشی هەرێمەکە دەکا" و داواشی کرد؛ "کە عێراق...دەمودەست سەرکوتکاری ڕابگرێ." بڕیارەکە لەسەر ئەوەش مکوڕ بوو؛ (کە عێراق یەکسەر ڕێگەی ڕێکخراوە نێونەتەوەییە مرۆییەکان بدا تا بچنە ناوەوە و یارمەتیی هەموو ئەوانە بدەن کە لە سەرتاسەری عێراق پێویستیان بە یارمەتیدان هەیە) و داواشی کرد کە؛ "سکرتێری گشتی...هەموو سەرچاوەکانی بەردەستی خۆی بەکار بێنێ، بە هەموو ئاژانسەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانیشەوە، بۆ ئەوەی یارمەتییە هەنووکەییەکان بگەیێنێتە پەناهەندەکان." ئەمە یەکەم جار بوو لە دیرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئاوا بە ڕاشکاوی باسی کێشەی کورد بکا.

ولاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی، پشتیان بە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ژمارە ٦٨٨ بەست و ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفۆرت و ناوچەی دژە فڕینیان دامەزراند، تا هانی کورد بدەن بگەڕێنەوە ماڵەکانیان و لە هەڕەشەکانی سەدام حوسێنیشیان بپارێزن. لە ۱۹۹۷یشدا، ناوی ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفۆرت گۆڕا و بووە ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکورOperation Northern Watch تا ئاداری ۲۰۰۳ ڕۆژانە ۸۰ جار فڕۆکە شەڕکەر و فڕۆکەکانی پشتیوانی لە بنکەی ئاسمانیی ئینجەرلیک، لە ویلایەتی ئەدەنەی باشووری تورکیاوەڕا هەڵدەستان و ڕۆژانە دەهاتن، بۆ ئەوەی نەهێڵن بەغداد لەشکری خۆی دووبارە بێنێتەوە، بە ئاسمانی کوردستاندا دەفڕین.

پەیماننامە سەرەتاییەکانی مافەکانی مرۆڤ جەختیان لە سێ پلەی مافەکانی مرۆڤ کرد. یەکەم پلە، جەختیان لەسەر مافە تاکەکەسییەکانی وەک ئازادیی قسەکردن و کۆبوونەوە، کرد. لە پلەی دووەم بایەخی بەو مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی

و کولتوورییانه دا که ناشێ مرۆڤ دەستیان لێ هەڵگرێ. سێیەم جۆریان پێوەندییان بە مافە هاوبەشەکانی نەتەوەوە هەبوو، بۆ نموونە مافی ئەوەیان هەبێ بە ئاشکرا سامان و سەرچاوە سرووشتییەکانی خۆیان ڕێک بخەن. کوردە نەرمڕۆ و لایەنگرەکانیان لەو باوەڕەدانە کە ڕەنگە پشتیوانیکردنی مافەکانی مرۆڤ، لە خەباتی چەکداری کاریگەرتر بێ.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوەش بزانین کە هەندێ جار کورد خۆی مافەکانی مرۆڤی کورد و گەلانی تریشی پێشێل کردوون. لەمیانی شەڕی ناوەخۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ١٩٩٤– ١٩٩٨، بێ ژمار مافەکانی مرۆڤ پێشێل کران. لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی ١٩٩١ دژی سەدام حوسێنی، لە نێوان ٤٠٠–٧٠٠ سیخوڕی سەر بە دەزگاکانی هەواڵگریی بەعسی، دوای دەستگیرکردنیان لە سلێمانی، بێ دادگاییکردن ئیعدام کران. شەرەفکوژیش هێشتا وەک کێشەیەک هەر ماوەتەوە. سەیری (ئامنێستی ئینتەرناشناڵ و هیومەن ڕایتس ووچ) بکە.

**مافوور.** وەک ئەوەی چۆن فرە جار نەریت و هونەرە جوانەکانی کورد؛ بە گۆرانی و موزیکیەوەش، بە ناوی تورک یان فارس یان عەرەب هەڵدەدرێن، بەهەمان شێوەش گەلێ جار مافوور و قاڵی و لباد و بەڕ و جاجم و لاکێش و بەرماڵ و دووگورد و ڕەشماڵ و سەراندازی کوردییش، ئاوەژوو دەکرێن و بە دەستڕەنگینی تورک و فارس و عەرەب لە پێشانگە نێودەوڵەتییەکان نیشان دەدرێن و کوردیش دەبێ هەر ئاخی بەدەورەوە بکێشێ. ئەم ڕەوشتە دژی مافەکانی مرۆڤە؛ چونکە هاوکارییەکانی کوردی لە شارستانیەتی مرۆڤدا، نەک هەر پشتگوێ دەخا، بەڵکو ڕاستییەکەشی ئاوەژوو دەکا وەک ئەوەی کە کورد بوونی لە دنیادا نەبێ وایە.

زۆر لەو گەڕیدانەی لە سەدەی ١٩دا بە کوردستاندا تێ پەڕیون، زۆر بە بایەخەوە باسی ئەو ڕایەخانەی کوردەوارییان کردووە کە لەمیانی گەشتەکانیاندا وەبەر چاویان کەوتوونە. زۆربەی ئەو قاڵی و مافوورانە ئافرەت دەیانچنن، کەچی بەڕ و جاجم و بەرماڵ جۆلای پیاو دروستیان دەکەن. مافوور و لباد لە خوری دروست دەکرێن و جاجم و ڕەشماڵ لە مووی بزن دروست دەکرێن و دووگورد (بەرماڵ)و بەڕ

دەشێ لە خوری یان لە موو دروست بکرێن. مافووری پێشان زۆر لەو مافوورانە تەسکتربوون کە لەم سەردەمە کارگەکانی مافوور چنین لە هەولێر و لە هەندێ شاری تری ڕۆژهەلاتی کوردستان دەچندرێن. سەرەنداز دەبێ لە ١٠ پێ کورتتر نەبی و تەنیا سێ یان چوار پێش بەرین دەبێ. بەلام هەندێ سەرەنداز تا ٢٥ پێ درێژ دەکرێتەوە ئەمانە لە دیوەخان و کۆچکی گەورە پیاوان ڕادەخرێن. ئەم قالییە باریکانە یەک یان دوو مێرابیان بۆ دەکرێ. کەچی مافووری فارسی یان مافووری تورک، سێ مێرابیان هەیە. ڕۆخەکانی مافووری کوردی فرە ڕەنگە و وەک هی مافووری تورک و هی فارسەکان نییە و بەم شێوە لە یەک جودا دەکرێنەوە. هەردوو سەر و بەری مافووری کوردی ڕیشدارە و جوانییەکی تایبەتی بە ڕایەخەکە دەدا کە نە ڕایەخی تورکی نە هی فارسی ئەم جوانییەیان نییە. گوفکی مافووری کوردی درێژە، بۆیە ئەم مافوورە ڕەسەنە کوردییانە تایبەتمەندییەکی خۆیان هەیە و ئەوانەی مافووری چاکیان لە دیوەخان و مالەکانیان ڕاخستووە، فرە پێیانەوە شانازی دەکەن.

هەندێ جۆرە نەخشی تایبەتی لە زۆربەی قالیی کوردیدا دووبارە دەبێتەوە: بۆ نموونە: هەشت ئەستێرە؛ ئاسک یان مامز؛ کیسەل؛ ماسی؛ نێرگز؛ مرواری؛ چوارگۆشە؛ گول؛ درەختی سەروو، ئەمانە وێنە هەرە زۆر جار دووبارەبووەکانی سەر مافووری کوردینە. زۆر جار مافوورچن ئەم نەخش و نیگارانە وەک تەلیسم و نزاکاری دەنەخشێنێ بەو مرازەی لەگەل ڕاخستنی مافوورەکە خێروبێر ئەو مالە بگرێتەوە کە لێی ڕادەخرێ. زۆربەی ڕەنگەکان لە مالەوە کابانانی چاک خورییەکانیان ڕەنگ دەکرد. مەنجەلێک ئاویان دەکولاند و ڕەنگی پێویستیان دەناوی دەکرد و تێکەلیان دەکرد و پاشان تا ماوەیەکی باش خورییەکەیان دەناو ڕەنگاوەکەدا دەکولاند. کە قالییەکە کۆن دەبوو ڕەنگی دەگۆڕاو سپی هەلدەگەڕا.

جۆری قالیی کوردەواری ئێستا وەک جاران گرانبەها نییە؛ چونکە حکوومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، زۆربەی گوندەکانیان کاول کردووە و ئەم پیشەسازییەش بە گوندەوە بەندە، بۆیە لە کوردستانی باشوور ڕەچاو دەکرێ دوای ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان، جۆری مافووری کوردەواریش وەک جارانی لێ بێتەوە و مافووری ڕەسەن دووبارە بازاڕەکانی کوردستان و دنیاش بڕازێنیتەوە.

هزری ساده و ساکار و فره ڕەنگی مافوورەکان؛ لەگەڵ ئەو هەڵە هونەرییانەی کە لە دیزاینی مافوورەکاندا دەکرێ وایان کردووە کە هێشتا لە ناو خەڵکیدا پتر بڵاو ببنەوە. ویلیەم ئیگڵتن لە کتێبی (سەرەتایەک بۆ مافوور و چنینەکانی دیکەی کوردەواری) An Introduction to Kurdish Rugs and Other Weavings لە ١٩٨٨، توێژینەوەیەکی جوانی بۆ ڕوونکردنەوە و ڕاڤەکردنی مافووری کوردەواری پێشکێش کردووە.

**ماهر جایان (١٩٤٦-١٩٧٢).** لە ١٩٦٠ـەکان و ١٩٧٠کاندا، سەرکردەی ناوداری چەپڕەوی شۆڕشگێڕی تورک و نموونەی باڵای عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان بووە. جایان بە ڕەگەز کورد بووە و سەرکردایەتیی پارت و بەرەی ئازادیی گەلی تورکی "تورکیا خەلق کولتوور و پارتیسی ڤە جەبەهسی"ی کردووە. ئەو ڕێکخراوەش لە "گەنج دەڤ"ـەوە پەیدا بووە. جایان هاریکاریی لەگەڵ دەنیز گەزمزی سەرکردەی ناوداری چەپڕەوی شۆڕشگێڕی تورکی کردووە. پاش ئەوەی جایان ڕێ ئاسانی ڕفاندنی باڵیۆزی ئیسرائیلی لە ئەنکارا کرد؛ لە ئەنجامی پێکدادانێک لەگەڵ هێزی ئاسایشی تورک لە ٣٠ی ئاداری ١٩٧٢ لە گوندی قزڵدەرەدا کوژرا.

**ماوەت.** شارۆچکەیەکی سەر بە پارێزگای سلێمانییە و لە دووریی ٣٠ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەو شارەوەیە و زۆر لە سنووری ئێرانەوە نزیکە. لە دوای یاخیبوونی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە مەلا مستەفا بارزانی، لە ١٩٦٤، ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی، کە سەرۆکایەتیی ئەو یاخیبوونەیان دەکرد، بارەگای پۆلیتبیورۆی پارتی دیموکراتی کوردستانیان لەو شارۆچکەیە گیر کرد. کە بارزانی ئاماژەی بۆ پۆلیتبیرۆی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکرد بە "ئیمپراتۆریەتی ماوەت" ناوی دەبرد.

**محەمەد سنجار (؟ -١٩٩٣).** ئەندامێکی پەرلەمانی تورکی سەر بە لیستی دیموکراسی پارتیسی (دەپ) بوو. لە ٤ی سێپتێمبەری ١٩٩٣و لە کاتی خۆپێشاندانێکی گەورە لە شاری باتمانی کوردستانی باکور، بە ڕۆژی ڕووناک تیرۆر کرا. کوشتنی محەمەد سنجار یەکێک بوو لەو زنجیرە تیرۆرکردنانەی کە سەرکردە

کورده ئاشتیخوازەکانی کوردستانی باکوری گرتەوە و ئەم تاوانەش وەک تاوانەکانی تر، لە ئەستۆی کۆنتراکانی حزبوڵلای تورکییەوە شەتەک درا. کۆنتراکانی حزبوڵلای تورکی باڵێکی ڕاستڕۆی دەستەی بکوژی حزبەکەبوو، حکوومەتی تورکیا پشتیوانیی دەکرد بۆ ئەوەی لەمیانی شەڕی دەوڵەتی تورک لەگەڵ گەریلاکانی «پ. ک. ک» گەورە سەرکردە کوردەکان لەناو ببا.

سنجار ئەندامێکی پارتی کرێکارانی گەل "هەپ"ی لایەنگری کورد بوو؛ لە ۱۹۹۱ بەئەندامی پەرلەمان هەڵبژاردرا. هەپ لە ۱۹۹۰ لە شێوەی پارتێکی یاسایی کوردی دامەزرا و وەک ئەندامێکی پارتی سۆشیاڵ دیموکراتی ئەرداڵ ئینۆنۆ ئەندامێتیی پەرلەمانی وەرگرت. کە دادگای دەستووری تورکی لە تەمموزی ۱۹۹۳، پارتی "هەپ"ی داخست، پارتەکە بە ئاسانی ناوەکەی خۆی کردە "دەپ" و بۆی تێهەڵچووەوە.

هەرچەندە چونکە محەمەد سنجار، ئەندامی پەرلەمان بوو، دەبوو دەوڵەت پرسەی بۆ ڕێک بخا، بەڵام حکوومەتی ئەنکارا ئەوەی نەکرد و ڕێی بەئەندامانی "دەپ"یش نەدا بچن لە پایەتەختی وڵات پرسەی بۆ دابنێن. هەر لە پێش تیرۆرکردنی بوو کە دەوڵەتی تورک پاسەوانەکانی لە محەمەد سنجار سەندبووەوە. دەڵێن عەلادین کانات کە پێشتر ئەندامێکی پارتی کرێکارانی کوردستان بووە و پاشان لێی یاخی بووە و بووەتە جاش و سیخوڕیی بۆ تورک کردووە و بەرپرسی تیرۆرکردنی دوژمنانی حکوومەتی تورک بووە، ئەو ڕۆژەی محەمەد سنجار لە باتمان کوژرا لەو ڕۆژیدا عەلادین کانات لە شاری باتماندا بیندراوە. بکوژانی محەمەد سنجار هەرگیز نەگیران و کێشەکەشی بە قێزەوەنترین کێشەی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا، دەزاندرێ.

**محەمەد شەریف پاشا ( ۱۸٦٥– ۱۹٥۱).** لە بنەماڵەی بابانی باشووری کوردستان بووەو لە کۆتاییی سالانی حوکمداری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا سەرکردەیەکی کورد بووە و لە ئاستی جیهاندا ناسراو بووە. لە وڵاتی سوێد نوێنەری عوسمانییەکان بووە و لەو یەکەم ڕێکخراوە کوردییە نەتەوەپەروەرەدا ئەندام بووە کە لە سەرەتای سەدەی ۲۰ـەم لە ئەستەمبوڵ دامەزراوە. ژەنراڵ شەریف پاشا، ناسیاری باشی لە ناوەوەی کوردستاندا نەبووە.

شەریف پاشا پشتیوانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی کردووە؛ ئەم سوڵتانەش لە حوکم دەرکراو؛ لە دوای کودەتایەکەی بۆ گەڕانەوەی سوڵتان لە نیسانی ۱۹۰۹، لە دژی کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتن کرا و سەرنەکەوت، شەریف پاشا حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو و لە ئەنجامدا ناچار بوو لە وڵات نەمێنی و رابکا.

لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، شەریف پاشا ڕاژەگوزاریی خۆی بۆ بەریتانیا لە میسۆپۆتامیا دەربڕی، بەڵام بەریتانییەکان لە دەویان داوە. پاشان چوو لە ڤێلا هەرە قەشەنگەکەی لە باشووری فرەنسا دانیشت. لە ئایاری ۱۹۱۹، پێشنیازی کرد بەریتانییەکان بیکەنە میری کوردستانێکی سەربەخۆ، بەڵام چونکە پشتیوانی لە ناوەوەی کوردستاندا نەبوو، بۆیە بەریتانییەکان ئەو پێشنیازەشیان ماندەل کرد.

پاشتر شەریف پاشا سەرۆکایەتیی شاندی کوردی لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس کرد بۆ ئەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی کۆتایی پێ بێنن. شەریف پاشا لەو کۆنفرانسە هاریکاریی شاندی ئەرمەنییەکانی کرد و توانی کێشەکە کەمێک بۆ پێشەوە ببا. شاندی ئەرمەنی، بە سەرۆکایەتی بوغوز نوبار پاشا بوو. لە ۲۰ی نۆڤێمبەری ۱۹۱۹، شەریف پاشا و بوغوز پاشای ئەرمەنی وێکڕا پێشنیازێکیان پێشکێشی کۆنفراسەکە کرد بۆ ئەوەی دوو دەوڵەتی ئەرمەنی و کوردی دابمەزرێن و پاشان سنووریان دیاری بکرێ. کە تایبەتمەندییەکانی ڕێککەوتنەکە جاڕدران، هەردوو شاندی کوردی و ئەرمەنی فرە نیگەرانبوون، چونکە ئەو چارەسەرە مامناوەندییانەی کرابوون، هەڵوێستە نەتەوەیییەکانی هەردوو لایان پشتگوێ خستبوون. جگە لەمە، شەریف پاشا ویستی لەگەڵ عوسمانییەکان دانوستان بکا و ئەمەش وای لە هاوپەیمانان کرد کە چیتر متمانە بە شەریف پاشا نەکەن و ناچار بوو دەست لەکار بکشێنێتەوە و کورد لەو کۆنفرانسە بێ نوێنەر مانەوە کە خواستەکانیان بە کۆنفرانسەکە بگەینی و لەلایەکی تریش کەمالییە تورکەکان لە تورکیا جێ پێی خۆیانیان توند کرد و ئەمەش هێشتا کێشەی کوردی پتر بۆ دواوە برد.

**محەمەد فەرید کورد عەلی (١٨٧٦– ١٩٥٣)**. بە یەکێک لە گرینگترین نووسەرانی هەموو مێژووی سووریا دەناسرێ. باوکی کورد عەلی کورد بوو، بەڵام دایکی چەرکەس بوو. لە تورکی و لە عەرەبی ڕەوان بوو، زمانی فرەنسیش لە قەشە لازارییەکان لە دیمەشق فێر بوو. کورد عەلی بە شێوەیەکی قەشەنگ یاریی بە وشە دەکرد و نوکتەدان بوو، قسەزانی وەک خۆیشی کەم هەبووە. شێوازی نووسینەکانی ئەمانە هەموو بە دیار دەخەن.

لە ١٩٠٥، لە قاهیرەی پایەتەختی میسر، گۆڤاری "المقتبس"ی دەرکرد. دوای هاتنەوەی بۆ دیمەشق لە ١٩٠٨، بێ ڕاگرتن "ئەلموقتەبەس"ی دەرکرد تا عوسمانییەکان لە ١٩١٤ دایان خست. لە ١٩٠٨، سەردانی فرەنسای کرد و لەوێ مەیلی کەوتە سەر ئەکادیمییای فرەنسی Academe Frances. لە سەردانێکی ئیتاڵیا لە ١٩١٣، ماوەیەکی لە کتێبخانەی پرنس لیۆن کایتان Prince Leone Caetani بەسەر برد و لەوێ Annali dell Islam فێری جۆرە شێوەیەکی لێکۆڵینەوە و نووسینی کرد کە هێشتا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا نەبوو. هەر لەو کتێبخانەیەش بوو کورد عەلی زۆربەی ئەو دۆکیومێنتانەی کۆ کردەوە کە پاشان کتێبە بەهادارەکەی مێژووی سووریای بە ناوی "خطات الشام" (نەهامەتییەکانی شام) نووسییەوە.

دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کورد عەلی بە سکرتێری گشتیی کۆمیتەی پەروەردەی گشتی دامەزرا. لەوێوەڕا توانی "ئەلئەکادیمییە عەرەبیە" بڵاو بکاتەوە. ئەو دوو ماوەیە نەبێ کە دوو جار وەزیری پەروەردەی گشتی بوو، دەنا زۆربەی ژیانی سەرۆکی ئەم بڵاوکراوەیەی کرد. سەیری "ئەدەب" بکە.

**مەحموود عوسمان (١٩٣٨–     )**. نوژدارە و ماوەیەکی دووورودرێژیشە وەک سیاسەتمەدارێکی کوردستانی باشوور ناسراوە. لەمیانی شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٦٠ـەکان و ١٩٧٠کاندا، گەورە یاریدەدەری مەلا مستەفا بارزانی و دکتۆری تایبەتیشی بوو. دکتۆر مەحموود عوسمان ڕۆڵێکی سەرەکی لە دانوستانەکەی بەیانی ئاداردا هەبوو. ئەو بەیانە گرینگە دەبوو، لە چواچێوەی خاکی عێراقدا، ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی کوردستانی باشوور مسۆگەر بکا.

لە دوای پیلانە نەگریسەکەی جەزایر و هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٧٥، دکتۆر

مەحموود عوسمان، وڵاتی بەجێ هێشت و لە ئەوروپا جێگیر بوو. لەوێ، بە نووسین، ڕەخنەی توندی ئاراستەی مەلا مستەفا بارزانی کرد. پاشتر پارتێکی تایبەتی خۆی دامەزراند و ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان/ کۆمیتەی ئامادەکاریی لێ نا. پێشان لە دیمەشق نیشتەجێ بوو، پاشان لە ١٩٧٨ بۆ کوردستانی باشوور هاتەوە. ساڵی پاشتر پێوەندی بە ڕەسووڵ مامەندەوە کرد و پارتی سۆشیالیستی کوردستانیان لە عێراق، دامەزراند.

لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١، کە هاوپەیمانان ناوچەی ئارام و دژە فڕینیان دامەزراند، مەحموود عوسمان یەک لەو سەرکردە کوردانە بوو کە لەگەڵ هاوڕێیەکانی دیکەی، دانوستانیان لەگەڵ سەدام حوسێندا کرد. دانوستانەکە هەرەسی هێنا و پاشتر دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردی لە کوردستانی باشوور دامەزرا. لە هەڵبژاردنەکانی ١٩ی ئایاری ١٩٩٢، دکتۆر مەحموود عوسمان خۆی بۆ سەرۆکایەتیی هەرێم کاندید کرد، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر لە دوای مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانیدا هات. ڕاستی ئەوەیە مەلا عوسمان عەبدولعەزیزیش، کە پاڵێوراوی ئیسلامییەکان، لەوی پتر دەنگی هێنا. جا سەرکردەی بێ لایەنگر ناچار بوو ڕوو لە بانشگە بکاتەوە و بچێ لە بەریتانیادا بژی و لەوێوەڕا وەک ستێتسمانێکی کوردی کارامە، جوامێرانە و بێ ماندووبوون ڕۆڵی چاکسازی لە سیاسەتی کوردیدا بگێڕێ.

**مستەفا پاشای میران.** پاشای سوارانی حەمیدییە بووە. کە میلیشیایەکی کورد بوو و سوڵتانی عوسمانی عەبدولحەمیدی دووەم لە دوا ساڵانی حوکمی عوسمانیدا دایمەزراند. مستەفا پاشای میران دوا سەرۆک خێڵی میرنشینی بۆتان بووە کە لە ١٨٩٠دا پلەی پاشایەتی وەرگرتووە. مستەفا پاشا هێندە هێزی پەیدا کرد کە لە کاتێکدا توانی سەربەخۆیی لە عوسمانییەکان بەدەست بێنی و لە دەوروبەری ناوچەی جزیرەی ئێستادا، حکوومەتێکی سەربەخۆی کوردی پێک بێنێ.

**مستەفا قەرەسو (حوسێن عەلی).** یەک لە سەرکردە دێرینەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانە. لە دوای کودەتایە سەربازییەکەی ١٩٨٠، مستەفا قەرەسو، چەند جارێک لە تورکیا، زیندانی کرا. لە ١٩٩٠ـەکان ئەندامی پۆلیتبیرۆی «پ. ک. ک»ی بوو. لە دوای گرتنی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرکردەی «پ. ک. ک» لە ١٩٩٩، قەرەسو بووە

ئەندامێکی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی کە بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ئۆجەلان دامەزرا.

**مستەفا کەمال ئەتاتورک (١٨٨١- ١٩٣٨).** لەسەر کەلاوگەی دەوڵەتی عوسمانی لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، کۆماری تورکیای دامەزراند. ئەتاتورک ڕێکخەری ڕێبازی ڕەگەزپەرستانەی تورکە. بە مەبەستی تاواندنەوەی گەلی کورد، کەمال ئەتاتورک سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستانەی لە دژی کولتوورو نەریت و بوونی کورد داڕشت و تا ئێستاش حکوومەتەکانی تورک هەر پەیڕەوی دەکەن.

مستەفا کەمال لە شەڕی یەکەمی جیهانی، وەک سەرکردەیەکی عوسمانی، لە شەڕی گالیپۆلی ناوی دەرکرد. لە دوای شەڕەکەش نێوانی لەگەڵ سوڵتانی تێک چوو. زیرەکانە دژی ئەو لەشکرە یۆنانییەی وڵاتەکەی داگیر کردبوو، سەرکردایەتی شەڕی سەربەخۆیی تورکیای کرد. لە ١٩٢٣ سیستەمی خەلافەتی هەڵگرت و لە ١٩٢٤یش خەلیفایەتی لادا. ئامانجی سەرەکیی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییی تورکی بوو، بۆ ئەوەی لەوێوەڕا "بگاتە کاروانی شارستانی". ئەو چاکسازییانەی ئەو کردی؛ سیستەمێکی سێکولاری سەپاند و سیستەمی ئاینیی هەڵگرت؛ ڕێنووسی عەرەبیی قەدەغە کرد و، نووسینی بە پیتی لاتینی سەپاند. فێس (کڵاوی عوسمانییەکان) لە سەرنانی لادا. ناتۆرە Surnameی لەبری ناو بەکار هێنا، دانی بە مافەکانی ئافرەتان دانا. لە بواری سیاسەتی دەرەوەش ڕێبازی ئاشتی و بێلایەنیی پەسند کرد.

بۆ ئەوەی چاکسازییەکانی خۆی بسەپێنێ، هەستا دەوڵەتێکی یەکگرتووی دامەزراند و لەو دەوڵەتەدا کوردی بە مەترسییەک دانا کە هەمیشە هەڕەشە لە یەکپارچەییی تورکیا دەکا و دەیەوێ تورکیا نەهێڵێ و پارچەی بکا. لە ١٩٢٥، شۆڕشی شێخ سەعیدی بە توندی دامرکاندەوە و ژمارەیەکی فرە کوردی لە زێدی خۆیان ڕاگوێزانەوە و بەرەو ڕۆژئاوا بانشیکردن. لەم کردەوە ڕەگەزپەرستانەشی دوو مرازی هەبوون؛ یەکیان کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد بوو لە باکوری کوردستان و دووەمیشیان بۆ ئەوە بوو پاشتر خۆیان بتاوێنەوە. فەرمانێکی دەرکرد و بەپێی فەرمانەکە هەموو قوتابخانە و ڕێکخراو و چاپەمەنی و کۆمەڵە و حوجرەی فەقێیانی کوردی قەدەغە کرد. چونکە ئەو حوجرانەی فەقێیان دوا سەرچاوەبوون کە بتوانن

کورد پەروەردە بکەن. لە ۱۹۲۰یەکان، بنەما بنەڕەتییەکانی کەمالیزمی ڕێبازی ڕەگەزپەرستی تورکی پەیدا کرد کە ئیتر جێی بۆ هزری کوردی لەو وڵاتەدا نەهێشتەوە و هەردوو وشەی "کورد" و "کوردستان"ی سڕییەوە و زاراوە قێزەوەنە ڕەگەزپەرستانەکەی "تورکی چیا"ی بۆ ئاماژە بە کوردکردن بەکار هێنا. ئەم ناوەش بووە یاسایەک هەموو کردەوەیەکی دژی کوردی لە پەنایەوە دەکرا. بۆیە لە کن کوردان، کەمال ئەتاتورک بە زەلامێکی ڕەگەزپەرست دەناسرێ.

**مسکین**. ئەو ناتۆرەیە بەو سەپانە کوردانە دەگوترا کە زەوی خۆیانیان نەبوو، خودان هۆز نەبوون و بەرفەرمانی ئاغەکانبوون. بۆیەش ئەو ناتۆرەیان بەکاردێنا، چونکە زاراوەکە لە بنەڕەتدا واتای "نەداری" و "هەژاری" و "بێنەوایی" دەبەخشێ. جاری وا دەبوو هەندێ مسکین بە زیرەکایەتیی خۆیان دەبوونە سەرکار و جێی متمانەی براگەورە و سەرپەرشتی مسکینەکانی دیکەیان دەکرد. سەیری "گۆران" و "ڕایات" بکە.

**مەدرەسە (حوجرەی فەقێیان)**. ئەم مەدرەسە دینییانە نەک هەر لە سەرتاسەری کوردستان هەبووە و لە هەندێ شوێن تا ئێستاش هەر ماوە، بەڵکو لە تورکیا و ئێران و پاکستان و گەلێ وڵاتی ئیسلامیدا هەنە. حوجرەی فەقێیانی کوردستان جگە لەوەی کە شەریعەتی ئیسلام و زمانی عەرەبی تێدا گوتراوەتەوە، مەڵبەندی هزری ڕەسەنی کوردایەتی بووە و زۆربەی سیاسەتمەدارە کوردەکانی سەدەی بیستەم لەو حوجرانەدا خوێندوویانە و بیریان لە بارودۆخی گەلەکەیان کردووە و شۆڕشیان بەرپا کردووە. یەکەم کەس کە هەستی بە مەترسی ئەو حوجرانەی فەقێیانی کوردستان کرد، مستەفا کەمال ئەتاتورک بوو، بۆیە لە ۱۹۲۵، لە دوای سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران، بڕیاری داخستنی هەموو ئەو مەدرەسانەی دا.

هەر گوندێکی گەورە بۆ ناوی خۆی حوجرەیەکی فەقێیانی ئاوەدان دەکردەوە. مەلایەکی دوازدە عیلمی بۆ دەگرت کە بتوانێ دەرس بە فەقێیەکانی بڵێ و خواردنی هەموو فەقێیەکان بە خۆڕایی خەڵکی گوندی دابینیان دەکرد. ژنێک خزمەتی فەقێیانی دەکرد، پێیان دەگوت "داپیرە" یان "داپیری فەقێیان".

فەقێ لە سەرەتادا سێ پلەیان هەبووە؛ سووختە... بەو قوتابییانە دەگوترا کە تازە

دەچوونە بەر خوێندن؛ موتەعەلیق... لە سووختە پتری خوێندبوو، بەڵام نەگەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە بتوانێ مەلایەتی بکا. موستەعید... ئەمە پلەی هەوارزی خوێندنی ئیسلامیی مەدرەسەکان بوو، موستەعید هەبوو مەلا بوو، وانەی بە سووختە و مەتەعەلیقەکان دەدا. پاشان موستەعید ئیجازەی وەردەگرت و دەبووە مەلا و ئەویش ئەگەر زیرەک با، دەیتوانی مەدرەسەی خۆی هەبی و دەرس بە فەقێیان بڵێ. هەموو مەلایەک بۆی نەبوو ئیجازە بە فەقێیان بدا و تەنیا مەلای شارەزا و دووازدە عیلم دەیتوانی ئەم ئیجازانە بدا. هەندێ گوندنشین تا نەیانزانیبا مەلا لە کن کێ ئیجازەی وەرگرتووە، لە گوندەکەیان جێیان نەدەکردەوە و نوێژیان بە دوادا نەدەکرد. لەم ساڵانەی درەنگی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، پلەی موتەعەلیق نەما و هەر دوو پلەی سووختە و موستەعید تا کۆتاییی حەفتاکانی سەدەی بیستەم لە هەندێ گوندی کوردستانی باشوور هەر مابوون. ڕەنگە تا ئێستاش ئەو مەدرەسانە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات هەر مابن و دەرسیان تێدا بخوێندرێ.

سووختەکان هەر ڕۆژێ سێ جاران بە ناو ئاواییدا وەردەبوون بۆ ئەوەی ڕادبە "خۆراکی فەقێیان" لە ماڵان کۆ بکەنەوە. سووختە هەبوو ١٦ قاپ خواردنی ویکڕا بە هەردوو باڵ هەڵدەگرت و دەیهێناوە، ئەمانە ناوبانگیان لە ئازایەتیدا دەردەکرد. سووختە کە دەچووە بەر دەرگەی ماڵێک، هیچ زەنگێک نەبوو لێی بدا تا پێی بزانن کە ڕادبە هاتووە؛ بۆیە بە دەنگێکی بیستراو بانگی دەکرد:- "ڕادبە، ڕەحمەتتان لێبێ" یان "ڕادبە، ڕەحمەتو لێ بێ" و ئیتر خواردنەکەیان بۆ دەهێنا. هەمیشە ئەو لادێییە کوردانە باشترین خۆراکیان بە فەقێیان دەدا.

ئاهەنگی ئیجازەدان یەکێک بوو لە ئاهەنگە هەرە سازەکانی گوندی کوردستان. چەندین شانۆنامە و نوواندن و ئاهەنگی خۆشیان بۆی ساز دەکرد. جارێکیان لە مەدرەسەی شەقڵاوەی کوردستانی باشوور موستەعیدێک ئیجازە وەردەگرێ، لە ئاهەنگەکەدا شانۆنامەیەک پێشکێش دەکرێ. ئەو شانۆگەرییە بەمەبەستی دادگاییکردنی باوکی میرانی سدیق بەگی شەقڵاوە دەبێ. ئەو میرە گەورەی ئەوسا کە ئەندامێکی پەرلەمانی عێراقی بووە دێنن. فەقێیەک حوکمە دەدا. حوکمەکەی ئەوە دەبێ کە ناوەندی حەسیرێکی شڕ کون بکەن و بە ملی میرانییەوە هەڵی بواسن و

بەناو شەقلاوەیدا بگێڕن چونکە میر ماوەیەکە خواردنی خۆشی بۆیان ساز نەکردووە. میر لەو فەرمانە ئازادی نابێ تا بەڵێن دەدا کە بەرخێک بۆیان دەکوژتەوە خواردنیان بۆ ساز دەکا، ئینجا ئازاد دەکرێ. هاووڵاتییان لە چەندین گوندەوەڕا لەو ئاهەنگانەدا بەشدارییان دەکرد و دەهاتنە ئەو گوندەی ئیجازەکەی لێ دەدراو ئامادەی ئەو بۆنە گەورە و پیرۆزانە دەبوون.

**مەد تیڤی MED- TV**، وێستگەیەکی تەلەڤزیۆنی لایەنگری پارتی کرێکارانی کوردستان بوو. لە ١٩٩٥، لە بەریتانیا و پاشتر لە بەلجیکەوەڕا بەرنامەکانی خۆی بۆ کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەورویا پەخش دەکرد. مەد تیڤی بەناوی میدی باپیری کوردەوە کرابوو.

چونکە مەد تیڤی بە دیالەکتە جودایەکانی کوردی و بە زمانی تورکی و ناوە ناوەش بە زمانی عەرەبی و زمانی سیریلیش بەرنامەکانی خۆی پەخش دەکرد بۆیە ژمارەیەکی زۆر هاوسۆز و بینەری هەبوو. لە لایەکی تریشەوە چونکە مەد تیڤی یەکەم کەناڵی تەلەڤزیۆنی نەتەوەیی بوو کە بە شێوەزاری کرمانجی باکور بەرنامە کولتووری و سیاسی و نووچەکانی پەخش بکا و بە دڵی بینەرانی قسە بکا و ئەو هەست و نەستەیان بۆ دەرببڕێ کە پێشتر نە دەوێران بیڵێن و نە گوێشیان لێ بووبوو، بۆیە کاریگەرییەکی زۆر تایبەتی لە ناو کۆمەڵی کوردەواری بەگشتی و کوردستانی باکوردا بەتایبەتی هەبوو. پێش لە دەستگیرکردنی لە شوباتی ١٩٩٩، عەبدوڵڵا ئۆجەلان پڕجاران بە تەلەفۆن پشکدارییی پرۆگرامێت وێ تێڤێی دکر. پاشان لە بن فشاری تورکیا و بە گومانی ئەوەی کە هانی توندوتیژی دەدا، مەد تیڤی، ڕێگەدانی پەخشی پرۆگرامەکانی لێ وەرگیراوە و لە ٢٢ی ئاداری ١٩٩٩ بۆ دواجار داخراو بەمەش دەنگێکی دیکەی کورد خنکێندرا.

خنکانی دەنگی مەد تیڤی، یەکجارەکی نەبوو؛ چونکە زۆری نەبرد لە شوێنی ئەو میدیا تیڤی (MEDYA- TV) دەستی بە پەخشەکانی خۆی کرد. ئێستاش کورد گەلێک کەناڵی تیڤیی سەتەلایتیان هەیە؛ لەمانە؛ کوردستان تیڤی، هی پارتی دیموکراتی کوردستانە؛ کوردسات، هی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە؛ ئەم دوو کەناڵە لە سەرتاسەری جیهان وەردەگیرێن و پەخشەکانیان جگە لە ئەورویا و

ڕۆژهەڵاتی ناڤین ئەمەریکاو ئوستراڵیاش دەگریتەوە. کەناڵی ڕۆژهەڵات هی کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە؛ کەناڵی ڕۆژ هی کوردەکانی باکورە؛ زاگرۆس هەر ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەورووپا دەپۆشێ.

**مەروانییەکان.** ئەو بنەماڵە کوردە فەرمانڕەوایە بوو کە لە ٩٨٤ـەوەڕا تا ١٠٨٣، هەر لە دیاربەکرەوە بگرە تا دەگەیشتە سووریا و عێراقیش هەموویان حوکم کردووە. فەرماندارەکانی ئەو بنەماڵەیە پتر بە ئیسلامەتی و بە بنەماڵەکەیانەوە ناسراون نەک بەوەی کە لە ئیتنی کورد بووبن. زۆر لەگینە کە زۆر لە هاووڵاتییانی بەرفەرمانی مەروانییەکان فەلە بووبن. بە تایبەتیش لە دانیشتوانی دیاربەکر کە زۆر دیانی لێ بووە.

یەکەم سەرۆکی ناوداری ئەو بنەماڵەیە ناوی "باغ" بووە. بەڵام مەروانییەکان ناوی ئەو کابرایەیان هەڵگرتووە کە خوشکی باغی لەکن بووە و ناوی مەروان بووە. مەروانی زاوای باغ ئاشەوان بووە. سێیەم کوڕی مەروانی ئاشەوان و خوشکی باغ، کە ناوی ناسر دەعوە ئەحمەد بووە، مەروانییەکانی تا ئەوپەڕ بەهێز کردووە. ناسر دەعوە لە ١٠١١ تا ١٠٦١ حوکمی کردووە و لەو ماوە درێژەدا زۆر ژیرانە توانیویەتی وڵاتەکەی لە سێ دەسەڵاتی دراوسێی دوور ڕابگری و نەیهێشتووە نە سوڵتانی بوەیهی و نە خەلیفەی فاتمی و نە ئیمپراتۆری یۆنانی زەفەر بە وڵاتەکەی ببەن. بە پێی ئەو بەڵگەنامە نووسراوە مێژوویییانەی کە لە دیاربەکردا دۆزراونەتەوە، دیوەخانی ناسر دەعوە هەمیشە ئاپۆڕەی زانایان و شاعیرانی تێدا هەبووە و چەندین پرد و قەلاتیشی لە سەرتاسەری وڵاتدا دروست کردووە.

لە کۆتاییدا تورکەکان وڵاتی مەروانییەکانیان داگیر کردووە و شارستانییەتییەکەیان تەفروتونا کردووە. مەروانییەکان یەکێک لەو پێنج بنەماڵانەن کە شەرەفخانی بەتلیسی لە شەرەفنامەدا باسی بنەماڵەی مەڕوان دەکا و دەڵێ سەربەخۆ بوو "نە یەخسیری عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو".

**مەهدی (محەمەدی مەهدی).** بە پێی هزری مەسیحی و ئیسلام و پێشتریش بە گوێرەی بیری زەردەشتی کەسێک بە ناوی "ساوشیانت" پەیدا دەبێت. ڕاستی بالادەست دەبێت، هەمیشە بۆ یەکجارەکی چاکە سەردەکەوی و ململانێی نێوان دوو

ئایدیۆلۆژیای ناکۆکی چاکە و خراپە کۆتایی پێ دێت. بە گوێرەی بیری ئیسلام محەمەدی مەهدی لە پێش دنیا خرابوون دەردەکەوێ و حوکمی ئیسلام لە هەموو دنیا بەرپا دەکا. هەرچەندە بیرۆکەی ئیمامی مەهدی لێڵ و ئاڵۆزە، بەڵام ئەم جۆرە کەسایەتییە دەبێ پێوەندی بە شۆڕشێکەوە هەبێ، چونکە بێ شۆڕش ئەمە ئەنجام نابێ. لە هەردوو سەدەی ۱۹ و ۲۰دا، چەند شۆڕشێکی کوردی هەڵگیرسان و سەرکردەی ئەو شۆڕشانە لەلایەنی لایەنگرەکانیانەوە بە مەهدی دەناسران. شێخ عەبدولسەلامی بارزانی یەکەم و محەمەد بارزانی لە سەدەی ۱۹ بە ئیمامی مەهدی ناسران و لە سەدەی ۲۰یش، شێخ ئەحمەد بارزانی کە شۆڕشی کرد هەندێ لە موریدەکانی بە کەسایەتییەکی پیرۆزیان زانی. شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانیش لە ۱۹۲۵، بە هەمان شێوە باوەڕی پێ دەکرا کە شۆڕشێکی خواوەندانە بێ. لە بەرانبەری ئەمەشدا هەندێ لە سەرکردە دیندارەکانی تورکیا مستەفا کەمال ئەتاتورکیان بە "دەجال" لە قەڵەم دەدا و دەیانگوت:– "ئەوە دەجالە لە پێش هاتنی محەمەدی مەهدی پەیدا بووە."

**مەزلووم کورکماز (مەحسوون) (؟ –۱۹۸٦).** یەکەم سەرکردەی ئەنیا ڕزگارییا نەڤاتا کوردستانێ بووە. بەرەی ڕزگاریی گەلی کوردستان لە ئاداری ۱۹۸۵ دامەزراوە بۆ ئەوەی ببێتە بەرەیەکی میللی و وەک دەزگای پڕۆپاگەندە بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان کار بکا. لە دوای عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی «پ. ک. ک»، کورکماز کەسی دووەم بووە. کورکماز لە ۱۹۸٦ لە شەڕدا کوژرا و لە دوای کوشتنی کامپی مەشقکردنی دۆڵی بیقاع لە لووبنان بە ناوی ئەو کرا.

**مەزن (مازن).** نازناوێکە هەندێ جار بۆ ڕێزلێنانی گەورەی گوند بەکار دێ. ئاغە لە مەزن پڕتر دێتە بەکارهێنان.

**مەسعوود بارزانی ( ۱۹٤٦–   ).** سەرۆکی کوردستان و گەورەی بنەماڵەی بارزان و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ١٦ی ئابی ۱۹٤٦ لە شاری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هاتووەتە دنیاوە. ئەوەش هەر ئەو ڕۆژە بووە کە باوکی و چەند کەسێکی دیکە «پ. د. ک» یان دامەزراندووە. تا مەلا مستەفا بارزانی باوکی لە ۱۹٥۹، لە یەکێتیی سۆڤیەت هاتەوە، مەسعوود لە ماڵی باپیرێکی دەستڕۆیشتووی

ژیاوە، کە زێبارییە. بارودۆخی سیاسی، مەسعوود بارزانیی ناچار کرد کە خوێندنی دواناوەندی بە شێوەیەکی تایبەتی تەواو بکا.

مەسعوود بارزانی لە ١٩٧٦ تا ١٩٧٩ لەگەڵ باوکی لە بانشگە، لە ولاتە یەکگرتووەکان ژیاوە. لە ١٩٧٩، کە حەمەرەزا شای پەهلەوی ڕووخا و مەلا مستەفا بارزانی باوکیشی فەرمانی خودای بەجێ گەیاند، مەسعوود هاتەوە ئێران. ڕەنگە ئەو ساڵە زووانەی ژیانی وایان لێ کردبێ ببێتە جوامێرێکی وریا و هەمیشە پەیڕەوی هەڵویستێکی پارێزگار بکا. ڕەنگە واشیان لێ کردبێ کە متمانە بە ولاتە یەکگرتووەکان نەکا و ئەو پلە و پایەو سامانەی بۆی ماوەتەوە بە مافێکی خۆی و خزمەتکردنی گەلەکەشی بە ئەرکێک بزانێ کە لە ئەستۆی دایە و جێبەجێی دەکا.

چەند ساڵ بوو جەلال تاڵەبانی ڕکەبەری سەرەکیی مەسعوود بارزانی بوو. لەوەتی لە ١٩٩٢، حکوومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا، بارزانی و تاڵەبانی پێوەندییەکی هاوپشکی - ڕکبەڕکێیان هەبووە. لە سەرەتادا وا پێ دەچوو لە نزیکەوە لەگەڵ یەکتری کار بکەن. بەڵام لە ١٩٩٤ تا ١٩٩٨، هەردووکیان شەڕێکی ناوخۆی خوێناوییان لە دژی یەکتریدا کرد. لە سێپتێمبەری ١٩٩٦، بارزانی بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ سەدام حوسێنی قێزەوەن هاوپەیمانی کرد و پاشان لەگەڵ تورکیا بووە هاوپەیمان بۆ ئەوەی تاڵەبانی نەتوانێ زەفەری پێ ببا.

لە سێپتێمبەری ١٩٩٨، ولاتە یەکگرتووەکان هاتە ناوبژیوانیی هەردوو سەرکردەی کورد و ئاگربەستێکی پێکردن. لەوکاتەوە بارزانی و تاڵەبانی هەنگاوی گەورەیان بۆ بەپێشخستنی گەلەکەیان هاوێشتووە، لە پێناوی خۆشگوزەرانیی گەلەکەیان، ڕیزەکانیان یەک کردووە و ئەرکی زۆر ستراتیژییان ڕاپەڕاندووە. لە پایزی ٢٠٠٢، توانییان پەرلەمانی یەکگرتووی کوردستان پێک بهێننەوە، بۆ ئەوەی، لە عێراقی پاشی سەدام، باشتر پشتیوانیی کێشەی حکوومەتی فیدرالی کوردی بکا. لە سەروبەندی ئەو هەڕەشانەی کە ولاتە یەکگرتووەکان بۆ داگیرکردنی عێراق و لادانی سەدام حوسێنی دەیکردن، بارزانی و تاڵەبانی، وێکڕا، ڕۆڵێکی گەورەیان لە کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقدا گێڕا کە لە ١٤-١٧ی دیسێمبەری ٢٠٠٢، لە لەندەن کرا. لە شوباتی ٢٠٠٣، بارزانی ولاتە یەکگرتووەکان و تورکیای ئاگادار کردەوە لەوەی کە

کوردە عێراقییەکان بەرهەڵستی هەر هەوڵێکی تورکیا دەکەن ئەگەر بیەوێ، لە ئەنجامی ڕێککەوتنێکی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان، کوردستانی عێراق داگیر بکا. کە تورکیا بڕیاری دا بەشداری لە توانستی شەڕەکەی وڵاتە یەکگرتووەکان نەکا، ئەو وریا-کردنەوەیەی بارزانی، مشتومڕێکی زۆری پەیدا کرد.

بارزانی لە ۲۰۰۵ بە سەرۆکی کوردستان هەڵبژاردرا و لەو کاتەوە وەک سەرۆکێکی کورد پتر لەوەی کە سەرۆکی پارتیکی کوردی بێ، ڕەوشت لەگەڵ هاووڵاتییان و ڕێکخراوە سیاسییەکانی وڵاتدا دەکا. بارزانی هەمیشە جێی متمانەی گەل بووە و قسەکانی ئەو نەک هەر لە کوردستان، بەڵکو لە سەرتاسەری دنیادا بە بایەخەوە وەردەگیرێن. لە ۲۰۰٤، بۆ یەکەم جار، سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان، جۆرج بووش، لە ئۆوڤەڵ ئۆفیس، لە کۆشکی سپی، بە فەرمی و بە سیفەتی سەرۆکی کوردستان، پێشوازی لە مەسعوود بارزانی کرد و ستایشی حیکمەتی ئەو سەرۆکەی کرد.

**مەسعوود یەڵماز (١٩٤٧-    )**. یەکێک لەو سیاسییە دەگمەنە تورکانەی ئەم سەردەمە بوو کە پێ دەچوو بیەوێ دان بە هەندێ لە مافەکانی کورد بنێ، بەڵام پاشان لە ژێر فشاری سیاسیدا، ناچار پاشگەز بووەوە. مەسعوود یەڵماز لە ١٩٧١ لە کۆلێژی زانیارییە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنکارا دەرچووە و پلەی ماستەریشی لە کۆڵنی ئەڵمانیا وەرگرتووە. لە دوای ئەوەی لە ١٩٨٧دا، تۆرگوت ئۆزال پۆستی سەرۆکی تورکیای وەرگرت، مەسعوود یەڵماز لە جێی ئۆزالی پۆستی سەرۆکی پارتی دایکی نیشتمانی وەرگرت. سێ جار پۆستی سەرۆک وەزیرانی تورکیای وەرگرت، بەڵام هەر سێ جار، ماوەکانی کورتبوون.

لەو کاتەی لە ١٩٩٦دا، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بوو، مەسعوود یەڵماز پەیمانی دا کە کێشەی کورد لە تورکیا بە ڕێبازی سیاسی چارەسەر بکا. جەختی کردەوە کە باری نائاسایی لە کوردستان لادەدا و پشتیوانیی مافە کولتوورییەکانی تاکە هاووڵاتییانی کورد لە بەکارهێنانی زمان و پەروەردەدا، دەکا. گوتیشی دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتییە ناوخۆییەکان لە باکوری کوردستان بەهێز دەکەم. لەگەڵ ئەمەشدا، یەڵماز ڕاپۆرتی "تۆب"ی بە ڕاپۆرتێکی "سی ئای ئەی"ی ناوزەد کرد.

له هەموو قسەکانی مەسعوود یەڵمازی بە ناوبانگتر، ئەو قسەیە بوو کە لە کاتی کاندیدکردنی تورکیا بۆ بوونە ئەندام لە یەکێتیی ئەوروپا لە دیسێمبەری ١٩٩٩دا کردی. یەڵماز ڕوونی کردەوە کە پێویستە تورکیا، بۆ ئەوەی لە یەکێتیی ئەورووپادا وەربگیرێ، دەبێ دان بە مافەکانی کورد دابنێ و گوتی: "ئەو ڕێگەیەی بۆ ناو یەکێتیی ئەوروپا دەچێ، بەناو دیاربەکردا ڕەت دەبێ." دیاربەکر (ئامەد) پایەتەختی باکوری کوردستانە. بەڵام لە بن ئەو هەموو فشارە سیاسییانەدا، یەڵماز لە قسەکانی خۆی پاشگەز بووەوە. دوای بەزینە لە ڕادەبەدەرەکەی پارتی دایک لە هەڵبژاردنەکانی ٣ی نۆڤێمبەری ٢٠٠٢، لە بەرانبەری پارتی داد و گەشەکردن (ئاق پارتیسی)، مەسعوود یەڵماز دەستی لە پۆستی سەرۆکایەتیی پارتەکەی کشاندەوە.

**مەکتەبی سیاسیی «پ. د. ک»** بەشێکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو کە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی زاوای سەرۆکایەتییان دەکرد و دژی مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی «پ. د. ک» ڕاوەستان. باڵەکەی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی نموونەی ئەو باڵە ڕووناکبیرتر و چەپڕەوترەبوون کە تازە لە ناو بزووتنەوەی نەتەوەییی کوردیدا پەیدا بووبوو. بەڵام بارزانی پتر نوێنەرایەتیی چینی خێڵەکی و پارێزگارانی دەکرد. پێوەندیی نێوان ئەو دوو گرووپە بە پێی کات و بەرژەوەندییەکان دەگۆڕا؛ هەندێ جار هاریکار و جاریتر شەڕ و کوشتار لە نێوانیان ڕووی دەدا. لە کۆتاییدا بارزانی سەرکەوت و توانی مەکتەبی سیاسی لە سنوور ئاودیوی ئێران بکا. پاشان ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لە کردەوەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و پێوەندییان بە بارزانی کردەوە. لە ناوەڕاستی ١٩٦٠کاندا، بارزانی بووە ئەو سەرکردە تاکەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردایەتی کە کەس نەبوو ئیتر ملی لەبەر ملی بنێ.

کە شۆڕشەکەی مەلا مستەفا بارزانی لە ١٩٧٥، نسکۆی هێنا، ئیتر دەستەی پۆلیتبیرۆی «پ. د. ک» دووبارە هاتەوە مەیدان و لە ١ حوزیرانی ١٩٧٦، جەلال تاڵەبانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی دامەزراند. هەر لەو کاتەوە تا ئێستا، «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» بووینە دوو هێزی بەرانبەر و وێکڕا لە ناو کۆڕ و کۆمەڵی کوردی عێراقدا خەبات دەکەن.

**مەلا.** پێشنوێژی ئیسلامی سوننەیە. مەلا ڕێنوێنیی هەموو جۆرە خواپەرستییەکانی موسڵمانان دەکا و ڕێزێکی تایبەتی لە ناویاندا هەیە. تا دوای پێکهێنانی عێراقیش، مەلا ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردستان بووە و هەر گوندێکی کوردستان مەلایەکی لێ بووە. مەلا جگە لە پێش نوێژیکردن و مارەبڕین و تەلقیندانی مردوو، منداڵانی گوندیشی فێری خوێندن و خوێندنەوە کردووە؛ هەندێکیان بایەخیان بە نووسینیش داوە. پرۆگرامی خوێندنی مزگەوت کە مەلا بەڕێوەی دەبرد، لە خوێندی قورئان و ڕێزمانی عەرەبی "النحو والصرف" و قسەکانی پێغەمبەر پێک دەهات. بە شێوەیەکی گشتی مەلا ڕۆشنبیرترین کەسی هەر ئاواییەک بووە. مەلا سێ جۆریان هەبوو؛ "کۆلکە مەلا" ئەمەیان لە خوێندن سەر نەکەوتبوو، بەڵام کەموزۆرێک خوێندەواری هەبوو. "مەلای پێشنوێژ" ئەمانە لە گوندە بچووکترەکان دەژیان و پێشنوێژییان بۆ لادێییەکان دەکرد و پتر نەدەچوون؛ چونکە لە باریان دانەبوو. "مەلای ١٢ عیلم" ئەمانە جێی تایبەتییان لە ناو کۆمەڵدا هەبوو، قسەیان دەڕۆیشت، فەتوایان دەدا، گوتاری ڕۆژی هەینییان دەخوێندەوە، ناکۆکییەکانی نێوان خەڵکیان چارەسەر دەکرد و میراتیان دابەش دەکرد، مەسرەتیشیان بۆ بەسەر دەچوو، بە کورتی کەس قسەی لە قسەیان نەدەکرد. هەرچەندە مەلا مستەفا بارزانی مەلایەتی نەکردووە، بەڵام هێشتا ناودارترین مەلای کوردی سەدەی بیستەمین بووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مەلایەتی جێی شانازیی کورد بووە. شایانە بزانین کە زۆربەی سەرکردەکانی شۆڕشەکانی کورد تا کۆتاییی سەدەی ٢٠ـەم هەموویان مەلا بووینە یان لە مەلایەتییان خوێندووە.

**مەلا مستەفا بارزانی (١٩٠٣ – ١٩٧٩).** مەلا مستەفا بارزانی ناودارترین سەرکردەی کوردی سەدەی ٢٠ـەمە. لە کوردستانی باشوور، ناوی مەلا مستەفا بارزانی هێمای بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کوردە لە ئاستی کوردستانیش پاڵەوانێکی ئەفسانەیی هەموو گەلی کوردە. سەرکردەیەکی سروشتی بوو، وای دەکرد بە سۆزەوە دڵسۆزی بی. کەسایەتییەکی بەهێز و ئازا بوو. لەبەر گەشەکردنی لە ڕادەبەدەری هەستی نیشتمانپەروەری و کوردایەتیی، بارزانی هەرگیز لە چوارچێوەی سەرۆکایەتی دەرنەکەوت و هەمیشە کوردی بەرەو هەوراز برد. هەندێ

له بەرهەڵستکارەکانی بە ئاغەیەکی کۆنەپەرستیان دادەنا. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەو خەباتەی ئەو کردی، تا ئەوپەڕ هەستی نەتەوەپەروەریی کوردایەتی لە باوەش گرت و ئەو باوەڕەی کە ئەو دروستی کرد لە سەدەی بیست و یەکەمینیش بێوچان هەر گەشە دەکا و ناوەستێ.

مەلا مستەفا بارزانی هێشتا مەلۆتکە بوو کە عوسمانییەکان لەگەڵ دایکی زیندانییان کردن و شێخ عەبدولسەلامی دووەمی، برا گەورەشیان لە شەڕی یەکەمی جیهانی، بە تاوانی لایەن نەگرتنیان، لە سێدارە دا. بارزانی سێ ژنی هێناوە و ١٠ کوڕ و چەند کچێکی هەبوو. حەمایل خان خێزانی سێیەمیەتی؛ لە خێڵی زێبارییە. زێباری پێشتر دوژمنی بارزانییان بوون. حەمایل خان، لە پەنا پەردەوە، دەسەڵاتێکی زۆری هەبووە. دایکی مەسعوود بارزانی؛ سەرۆکی ئێستای پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی کوردستانە.

مەلا مستەفا لە سەرەتای ١٩٣٠یەکان، پشتیوانیی شێخ ئەحمەدی کاکی کرد و بە هەردووکیان نەیانهێشت ئاشوورییەکان لە خاکی بارزانییەکان نیشتەجێ بکرێن و لەوەوە ئیتر ناوی دا. شەڕ هەڵگیرسا، بەڵام لە کۆتاییدا هەردوو برا بارزانییەکان خۆیان بەدەستەوە دا و زیندانی کران. لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانی، بارزانی لە ماڵزیندان ڕای کرد و دەستی بە بەرهەڵستکاری حکوومەت و خێڵە لایەنگرەکانی حکوومەتی کردەوە. هەرچەندە بارزانی لە سەرەتادا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام لە کۆتاییدا ناچار کرا دەربازی ناو سنووری ئێرانێ ببێ و لەوێش لە کۆمارە تەمەن کورتەکەی مەهابادی کوردستان پلەی ژەنراڵی وەرگرت. بارزانی بووە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردی (پاشتر بووە پارتی دیموکراتی کوردستان). «پ. د. ک» پێشتر لە عێراق لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ دامەزرا بوو.

کە کۆماری کوردستان لە کۆتاییی ١٩٤٦دا ڕووخا، بارزانی خۆی بەدەستەوە نەدا و سەرکەوت و مەلحەمەیەکی لە پاشەکشە تۆمار کرد و بە خۆ و بە چەند لە باشترین چەکدارەکانی خۆی گەیاندە یەکێتیی سۆڤیەت. لەبەر ئەوەبوو کە هەندێک نەیارەکانی بارزانی بە "مەلای سوور" ناوزەدیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی نەبووە شیوعی. لە دوای ڕووخانی حوکمی پاشایەتی لە ١٩٥٨ لە عێراق، بارزانی گەڕاوە بەغدا و هەر

زوو جێ و شوێنی دیاری سەرۆکایەتی خۆی گرتەوە.

بارزانی، لە ١٩٦١، شۆڕشێکی تازەی دژی میری بەرپا کرد و هەموو حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی ئەو سەردەمی عێراقی لاوازکردن و توانی سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بێنی و سەربەخۆییەکی دیفاکتۆی بۆ چەندین ساڵ پاراست. بارزانی لەمیانی ئەو ساڵانەی سەرهەڵدانیدا، بووە پسپۆری شەڕی گەریلای ناوچە شاخاوییەکانی وڵاتەکەی. بارزانی دژی هێزەکانی مەکتەبی سیاسی «پ. د. ک»، کە دوو هەڤاڵەکەی پێشووی؛ ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی، شەڕی کردو بەزاندییانی. ئەوەبوو لە کۆتاییی ١٩٦٠ـەکاندا، بارزانی بووە سەرکردەی کورد و کەس نەبوو سەری دڵسۆزی و ڕێز و نەوازش بۆ پلە و پایەی پێشەوا بارزانی نزم نەکا.

لە ١٩٧٠، بەیانی ئاداری لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا مۆر کرد. دەسەڵات بە دەستی حزبی بەعس بوو، سەدام حوسێن دەسەڵاتی هەرە باڵای حوکمەکەی دەگێڕا. بەیانی ئادار پەیمانی ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینەی بۆ کورد پێ بوو. لە کۆتاییدا، دەرکەوت هەنگاوەکەی حزبی بەعس تەنیا تاکتیک بووو بەڕاستی نەیویست چارەسەرێکی دادپەروەرانەی کێشەکە بکا. لە لایەکەوە بەهێزبوونی بەعسییەکان و لە لایەکی ترەوەش ئەو خەیانەتەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران لە بارزانییان کردو هەموو یارمەتییەکیان لێی ڕاگرت کە پێشتر بارزانی بەتەواوەتی پشتی پێ دەبەستا؛ وای لە حکوومەتی عێراق کرد ئەو گەڕە شەڕە بباتەوە کە لە ١٩٧٤ دەستی پێ کرد و لە ئاداری ١٩٧٥ کۆتایی هات و هەرەسی یەکجارەکی بە شۆڕشی ئەیلوول هێنا.

نائومێدی و نەساغی بارزانییان ناچار کرد ڕوو لە بانشگە بکات. بارزانی خەمی گەورەی خۆی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان برد و لەوێ لە ئاداری ١٩٧٩ماڵئاوایی یەکجارەکی کرد. بارزانی لە سەرەتادا لە ئێران بەخاک سپێردرا، بەڵام پاشان لە ١٩٩٣، تەرمەکەی بۆ خاکی خۆی، خاکی کورد هێندراوە و لە بارزان نێژرا. هەموو کوردی هەموو کوردستان ئەوپەڕ سۆز و دڵسۆزییان بۆی دەربڕی و هەر لە زێوەڕا تا دەگاتە گڵکۆی لە بارزان ئاپۆرەی بێ ژماری کورد بە تاجەگوڵینە و بە فرمێسکەوە دوا پێشوازی و ماڵئاواییان لەو سەرکردەیان کرد کە چرۆی ئومێدی سەربەخۆیی لە

دڵ گەشاندنەوە و بە یەکجارەکی ئاسۆی ئازادیی کوردی ڕوون کردەوە. هەر لە سەردەمی مەلا مستەفا بارزانییەوە تا دنیا مابێ، هەموو کوردێک قەرداری ئەو پێشەوایە مەزنەیە.

لە سەردەمی خەباتی بارزانیدا، لەبەر ئازایەتی و نەترسیی ئەو کەڵەپیاوە، زۆربەی میدیای ڕۆژئاوایی بە "پڵنگی کوردی Kurdish Tiger" ناوزەدیان دەکرد.

**مەلای جزیری ( ١٤٠٧– ١٤٨١).** بە ناوی (شێخ ئەحمەدی نیسانی)ش دەناسرێ و هەندێک بە ناودارترین شاعیری سەردەمانی زووی کوردی دەناسن. دیوانی مەلای جزیری پتر لە ٢,٠٠٠ هۆنراوەی لە خۆدا گرتووە و نموونەی ڕێبازی سۆفیگەریی فارسییە و هەمیشە شێخ و مەلایەکان ئەوپەڕ ڕێزی لێ دەگرن. میر محەمەدی موکسی کە بە فەقێ تەیران ناسراوە، موریدێکی مەلای جزیری بووە و سەردولەکەیەکی بە سۆزی دەربارەی گیان ئافەرینی سەیدایێ خۆ ڤەنڤیسییە. جگە لەمە چەند نووسینێکی تریشی هەیە؛ لەوانە "مێژووی شێخی سەنعان". مەلای جزیری پڕ متمانەی بە شیعرەکانی خۆی بووە و بە خوێنەران دەڵێ ئەگەر شیعری ئەو بخوێننەوە پێویست ناکا بچن شیعری حافیزی شیرازی سەیر بکەن؛ بۆیە دەڵێ:

ئەگەر لولوی مەنشور ژ نەزمێ تە دخازی

وەرە شیعری ملێ بن، تە بە شیراز چ حاجەت؟

واتا:

ئەگەر مرواریی شیعری تا ئەوپەڕ بەرزت دەوێ

وەرە حەڵقەی شیعری من، چ پێویستیت بە شیراز؟

سەیری "وێژە" بکە.

**مەلیک.** نازناوێکە بە واتای (شا) یان (پاشا) دێ. هەر لە دێرزەمانەوە کورد ناتۆرەی مەلیکیان بەکار هێناوە و لە حەسەنکێف چەندین مەلیکیان هەبووە کە لە دوای یەکتری فەرمانداریی وڵاتیان کردووە.

**مەم و زین.** شا چیرۆکەشیعری کوردییە؛ لە سەدەی ١٧ هۆزانڤانێ مەزنێ کورد، ئەحمەدی خانی دای ناوە. چونکە پێشەکییەکەی مەم و زین فرە ئاماژە بۆ هزری

کوردایەتی دەکا، بۆیە لە ئاستێکی جیهانیدا ئەو شاکارەی خانی بە سروودێکی نەتەوەییی گەلی کورد دەناسرێ: خانی لەو سەردەمی زوودا دەستی لەسەر برینی گەلی کورد داناوە و کولکی دڵی کوردانی دیار کردووە و فەرموویەتی:

گەر دێ هەبوا مە ئیتیفاقەک
ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەک
ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
هەمیان ژمەڕا دکر غولامی
تەکمیل دکر مە، دین و دەوڵەت
تەحسیل دکر مە، عیلم و حیکمەت

واتا:-

(ئەگەر لە ناو خۆ، هەموومان ڕێک باین؛
وێکڕا ملکەچی تاک سەروەرێک باین
ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
سەرتاپایانمان دەبووە خولامی
دین و دەوڵەتمان بۆ خۆ ڕێک دەخست
عیلم و حیکمەتمان دەخوێند بست بەبست).

لەو دەمی کە ئەحمەدی خانی بیری لە کوردایەتی کردەوە و ویستی نەتەوەکەی هۆشیار بکاتەوە، ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، لە ئیسلامەتی بترازێ هیچ ئەزموونێکی لەم چەشنە هزرە نەتەوەپەروەرییەی نەبووە؛ بۆیە زۆر لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە هزری کوردایەتی یەکەم هزری نەتەوەیی بووبێ لەو ناوچەیەدا سەردەر بکا.

مەم و زین لە پتر لە ٢٦٥٠ بەیتی دووانە پێک هاتووە. باسی خۆشەویستییەکی تراژیدیی دڵتەزۆک دەکا. هەندێ کەس مەم و زین لەگەڵ ڕۆمیۆ و جولیێتی شەکسپیر و هیتریش لەگەڵ لەیلا و مەجنوونی عەرەبی و هەشە لەگەڵ شیرین و فەرهادی بەراورد دەکەن. بەڵام لە ڕاستیدا مەم و زین لە هەمووان جیاوازە و هەمووشیان دەگرێتەوە.

مەم و زین بۆ زمانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و فرەنسی وەرگێڕدراوە.

**مەهدی زانا (١٩٤١-       ).** کوردێکی باکوری کوردستانە و لە ناو پارتی سۆشیالیستی کوردستان، لە تورکیا، هاوکاریی چالاکییەکانی کەمال بورقای کردووە و سەرۆکی پێشانی شارەوانیی ئامەد (دیاربەکر) بووە. لە سەرەتای ١٩٨٠کاندا بە گومانی ئەنجامدانی چالاکییە جوداخوازییەکان، زیندانی کراوە، بەڵام تاوانی پشکداری لە کردەوە توندوتیژەکانی نەخراوەتە ئەستۆوە. بۆیە ئەمنستی ئینترناشینال کۆششی لە پێناو ئازادکردنیدا کردووە. لە ١٩٩١دا بە پێی بەندەکانی لێبوردنێکی سەرۆک تورگۆت ئۆزال ئازاد کرا. پاشان دووبارە بەند و دیسانیش ئازاد کراوە و ئینجا ناچار لە تورکیا دەرچوو. مەهدی زانا هاوسەری لەیلا زانایە.

**مەولانا خالید (١٧٧٨- ١٨٢٦).** ئەو کوردە بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا تەریقەتی نەقشبەندیی بۆ کوردستانی عێراق هێنا. مەولانا خالید لە عێلی جافی شارەزووری بوو و لە شاری سلێمانی مەلایەتی دەکرد. شێخ عوبەیدوڵڵای تەریقەتە قادرییەکەی پێ دابوو. کە تەمەنی گەیشتە ٣٠ ساڵ، مەولانا خالید سەفەری هیندستانی کرد (ئەمە کارێکی زۆر نائاسایی بوو). لەوێ لە دەلهی لە بەردەستی شاعەبدوڵڵای دێهلەوی ناسراو بە سالح غولام عەلی، خوێندی. وا پێ دەچێ سوودێکی بێ پایانی لەو سەفەرەی کردبێ.

دوای ئەوەی مەولانا خالید ئیجازەی تەریقەتی وەرگرت گەڕاوە بۆ نیشتمان و ژمارەیەکی زۆری خەلیفەی بۆ خۆی پەیدا کرد. ئەو موریدانەی خێرا تەریقەتی نەقشبەندییان لەسەر حیسابی تەریقەتی قادری بڵاو کردەوە. گوتوویانە مەولانا خالید لە ئایندەی دەزانی و دەیتوانی مرۆڤ لە کۆسپ و تەگەرە بپارێزی و پێوەندی بە ڕۆحی مردووانەوەش بکا. ئەم کەرامەتانەی لە هەموو شتێکی قادری ڕەتیان دابوو. لە ڕاستیدا زۆر لە مریدەکانی قادری، تا گەیشتە شێخ عەبدوڵڵای نەهریش کە شێخی مەولانا خالید بوو لە تەریقەتی قادری، هەموو لە ڕێبازەکەی خۆیان وەرگەڕان و هاتنە سەر ڕێبازی نەقشبەندی. مەولانا خالید هەمیشە وەک یەکێک لە پیرۆزترین پیاوچاکی کورد دەمێنێتەوە.

**موخابەرات.** دەزگای نووچەگریی بەعسییەکانی عێراق و سووریا بوو. موخابەراتی

حکوومـەتی بەعـسی عـێراق بە شـێوەیەکی پڕ دژوار گـەلی کوردی سـەرکوت کـرد. زاراوەی "المخـابرات" وشـەیەکی عـەرەبیـیـە واتـای (هەواڵگری) یان (نووچەدزی) دەبەخـشـێ؛ چونکە کـارەکە بێ ئاگاداریی پێـوەندیدار دەکرێ. لە هەولێـر دەزگـای "مـوخـابـەراتی ناوچەی باکـور"ی لێ بوو، لە ڕاپەڕین، لە سـەعـاتـی ٥ی بەیانـی تا سـەعاتی ٢ی پاش نیـوەڕۆ بەرگـریی کـرد و تەسلیـمی دەسـتی جـەماوەر نەبوو. کـە گیراش ٤٧ی جاشی کورد لەسەر بانەکەیەوەڕا بەرگرییـان لەو دەزگایە دەکرد و دیل کران.

**مـوراد قـەرەیلان (جـەمـال).** چەند سـاڵ سـەرکـردەیەکی دەسـەڵاتداری پارتی کرێکارانی کوردسـتان بوو. لە ١٩٩٠ـەکان قەرەیلان ئەندامێکی سەرکردایەتیی «پ. ک. ک»ی بوو و سـەرکـردایەتیی سـوپای ڕزگـاریی کـوردسـتـانی لە هـەردوو ناوچەی بۆتان و ئامەددا، کرد. دوای گرتنی عەبدوڵڵا ئۆجـەلان لە ١٩٩٩، قەرەیلان بەئەندامی ئەنجـوومـەنی سـەرکـردایـەتیی هـەڵبـژاردرا بۆ ئەوەی لەگـەڵ ئەندامـەکـانی تری ئەنجوومەن کارەکانی ئۆجەلان ڕاپەڕێنن.

**مووسـا عـەنتـەر (١٩٢٢).** ڕووناکبیر و نووسـەرێکی ناوداری کوردی تورکیـایە، لە سێپتێمبەری ١٩٩٢ دا کوژرا. وەک ئەوەی بڵێی ئاشکرایە کە ئەندامێکی حزبوڵڵا کوشتی. ئەم حزبوڵڵایە گرووپێکی نهێنی بوو، حکوومەتی تورکیا بەخودانی دەکرد و ئەو هاووڵاتییە کوردانەی تیرۆر دەکرد کە گومانی پشتیوانیکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان و کێشەی نەتەوەیی کوردیان لێ دەکرا.

**موعەممەر قەزافی (١٩٤٢-      ).** ئەفسـەرێکی سـوپا بوو لە ١ی سێپـتـێمبـەری ١٩٦٩ لە لیبیا کودەتایەکی لەشکریی ئەنجام دا و پاشایەتی لەو وڵاتە لە ناو برد و لەو کـاتەوە تـا ٢٠٠٧ هێـشـتـا هەر سـەرۆکـایەتیی ئەو وڵاتە دەکـا. قـەزافی وەک لیبیاییەکان ناوی دەبەن، کابرایەکی ڕادیکاڵی دەمدەمییە. هەندێ لە عەرەبەکان زۆر لایەنی دەگرن، بەڵام لیبییەکان خۆیان هێندە سۆزداری نینە. هەرچەندە پشتیوانی گـەلێ نەتەوە و گـەلی ژێردەست دەکـا و ناوە ناوەش یارمـەتیـیـەکی کـەم یان زۆریان دەدا، بەڵام هەرگیز ڕا و بۆچوونێکی دیار و ڕێبازێکی نەگۆڕی نەبووە.

قـەزافی تاکـە سـەرۆکی عـەرەبە کـە زۆر بە ڕاشکاوی داوا دەکـا کـورد دەوڵـەتی

سەربەخۆی خۆیان هەبێ. لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، لە کاتێکدا نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی تورکیا سەردانی وڵاتەکەی دەکرد، قەزافی گوتی کوردی کوردستانی باکور ئەوانەی لە ژێر دەستی تورکیان دەبێ دەوڵەتی سەربەخۆیان هەبێ؛ ئەم ڕاگەیاندنە هەرایەکی لە تورکیا پەیدا کرد.

هەرکە لە شوباتی ١٩٩٩ش تورکیا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانی لە کینیا دەستگیر کرد، قەزافی ڕاگەیاندنێکی درێژی بڵاو کردەوە، تیایدا تورکیای لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەراورد کرد و گوتی کە ئەم هەڵوێستەیان وەک هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانییە کە کاتی خۆی ویستی شۆڕشی گەلی عەرەبی دابمرکێنێتەوە؛ بەڵام نەیتوانی. ئینجا نووسیی: "بۆ هەموو برا کوردەکانم...ورە بەر نەدەن، دڵگران نەبن، چونکە هەرچەندە دوژمنانتان پتر خوێنتان بڕێژن هێندە پتر ئاگری شۆڕشی کورد خۆشتر دەکەن. نکووڵی کردنی مافی سەربەخۆیی گەلان، کردەیەکە هێمای نەزانییە و واتای کرچوکاڵی و خۆپەرستی و نەشارەزایی لە مێژوو دەگەیەنێ."

**موکری.** کۆنفیدراسیۆنێکی بەهێزی هۆزەکانی کورد بوو، چەندین ساڵ لە ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ لە ناو ئیمپراتۆریەتی فارسیدا حوکمی کردووە. لە ١٦٢٣، موکرییەکان پشتیوانیی سەفەوییەکانیان کرد و هاتن وێکڕا بەغدادیان داگیر کرد و لە دەستی عوسمانییەکانیان دەرهێنا. موکرییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر، باشترین سوارچاکیان خستە بەر فەرمانی شای ئێران کە ئەگەر ئەوان نەبانا هەرگیز ئەو سوارچاکانەی بەدەست نەدەکەوت. لە ١٩٠٠، موکری دابەشی سەر دوو هۆز بوو؛ ئەوانیش دیبوکری و مامەش بوون. سەیری (عەشیرەت) بکە.

**مۆساد.** ئاژانسی نووچەگریی دەرەکیی ئیسرائیلییە. دوژمنانی کورد گەلێ جار دەڵێن مۆساد یارمەتیی کوردی داوە؛ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کە مۆساد پتر زیانی بە کورد گەیاندووە لەوەی کە هەرگیز سوودی هەبووبێ. لە ١٩٩٩ مۆساد یارمەتییەکی سەرەکیی میتی تورکی دا ئینجا توانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە کینیا دەسگیر بکا.

**میدیا-تیڤی.** سەیری (مەد-تیڤی) بکە.

**میدییەکان.** گەلێکی هیندۆ ئەورووپی دێرینبوونە، زمانیان زۆر لە زمانی ئاڤێستاوە نزیک بووە. گومان لەوەدا نییە کە میدییەکان لە کوردستان و هەمەدان و تەهران و ئازەربایجاندا ژیاون و ئەمە وای لە گەلێک لە مێژوونووسان کردووە دڵنیابن کە میدییەکان باپیرەگەورەی کورد بووینە. لە نێوان سەدەی ٨ـەم تا سەدەی ٦ـەمی پ.ز. خاوەن دەسەڵات و بەهێز بووینە و لە ٦١٢پ.ز. میدییەکان بە سەرۆکایەتیی کەیخوسرەو هاوپەیمانێتی بابلییەکانیان کردووە و وێکڕا پەلاماری ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییان داوە و لەناویان بردووە. ئینجا ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیان دامەزراندووە. سنووری ئەو ئیمپراتۆریەتە لە کەنارەکانی دەریای ڕەش و هەرێمی ئاران (کۆماری ئازەربایجان)ـەوە تا ناوەڕاستی ئاسیا و ئەفغانستان چووە و ڕۆژئاوای ئێران و باکوری عێراقی ئێستاشی لە خۆ گرتبوو، بەڵام ئەو ئیمپراتۆریەتە زۆری نەخایاندووە. لە ٥٥٠ پ.ز. کۆرۆشی گەورە لە شەڕێکدا شا ئاستیاگی شای میدییەکانی کوشتووە و ئیمپراتۆریەتی فارسی دامەزراندووە. پێ ناچی لە ناو میدییەکان خوێندەواری هەبووبێ؛ چونکە بە قسەی شوێنەوارناسان، میدییەکان هیچ نووسراوێکی تایبەتی خۆیانیان لە پاش بەجێ نەماوە کە باسی خۆیان بکەن.

زۆربەی مێژوونووسان لەو باوەڕەدانە کە کورد بەرەچەڵەک لە نەوەی میدیانە. تەنانەت مێژووناسی ناوداری ڕووسی ڤلادیمیر مینۆرسکی پشتیوانیی ئەم بۆچوونە دەکا و بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانیشی بۆ دێنێتەوە. کەچی زانای زمانی کوردی، مەکێنزی ئەم بۆچوونە پەسند ناکا و بەڵگەی جیننناسی genealogy ئەوتۆی بۆ دێنێتەوە کە میدییەکان بە زمانێکی باکوری ڕۆژئاوای ئێران ئاخاوتوونە؛ کەچی کورد بە زمانی باشووری ڕۆژئاوا قسە دەکەن. بەڵام ئەوەی کە گومانی لێ ناکرێ ئەوەیە کە میدییەکان توخمێکی گرینگ و ڕەسەنی باپیرانی کوردی ئەمڕۆنە.

**میرنشینەکان.** ئەو هەرێمە کوردیانەبوون کە زۆر لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتیان هەبووە. ئەو میرنشینانە لە ١٣٠٠ـەکاندا هەبووینە و دوا میرنشینیشیان لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩دا لە ناو چووە. فەرمادارەکانیان گەلێ جاران ناتۆرەی میر، یان شا، یان بەگیان هەبووە. ئەردەلان و بابان و بەتلیس و بۆتان و هەکاری و

حەسەكێف، هەموو نموونەی ئەو میرنشینە كوردیانەن. شەرەفنامە، كە شەرەفخانی بەتلیسی میری پێشووی میرنشینی بەتلیس نووسیویەتەوە، مێژوویەكی تێروتەسەلی بنەماڵەی ئەو فەرماندارانەیە كە تا كۆتاییی ۱۵۰۰ـەكان فەرماداریيان كردووە.

بوونی ئەو میرنشینە كوردییانە، لە ڕۆژانی پێش پەیدابوونی دەوڵەتە نەتەوەیییەكاندا، بەرپەرچی قسەوقسەڵۆكی ئەو كەسانە دەداتەوە كە دەڵێن هەرگیز هیچ دەوڵەتێكی كوردی سەربەخۆ نەبووە. هەركە میرنشینەكان لە سەدەی ۱۹دا نەمان، ئیتر شێخەكان دەستیان پێ كرد جۆرێك دەسەلاتی سیاسیی میرەكانی پێشان بەكار بێنن.

**میسل (مووسڵ).** شارێكە لەسەر پاشماوەكانی نەینەوا، لە هەردوو قەراخی ڕووباری دیجلە دروست كراوە. مووسڵ سێیەم گەورەترین شاری عێراقیە و پتر لە ۲ ملیۆن كەس لەو شارەدا دەژین. تا كۆتاییی ساڵەكانی سەدەی ۲۰ـەمیش، زۆربەی دانیشتوانی پارێزگای مووسڵ كوردبوون. بەڵام پاشان دوای ئەو گۆڕانكارە سیاسی و كۆمەلایەتییانەی كە بەسەریدا هات، دیمۆگرافیای شارەكە گۆڕا. لە دوای ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰، میری ناوچەی دهۆكی لێ كردەوە و پارێزگایەكی لێ پێك هێنا و خستییە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی كوردستان. پاشتریش بەعسییەكان سیاسەتی تەعریبیان دژی دانیشتوانی شەنگال و ئێسفنی و تا نزیك دهۆكیش بەكار هێنا و بەم چەشنە تەرازووی دانیشتوانەكەی بەلای عەرەبەكاندا كەوت.

پێش دامەزراندنی عێراق لە ۱۹۲۱، ویلایەتی مووسڵ هەبوو. ئەو ویلایەتە عوسمانییە، كەركووك و هەولێر و سلێمانی و دهۆكیشی دەگرتەوە و سنوورەكەی تا كێوی حەمرین دەچوو. زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتوانەكەشی كوردبوون. لە دوا ڕۆژەكانی شەڕی یەكەمی جیهانی، هێزەكانی بەریتانیای مەزن ویلایەتی مووسڵیان داگیر كرد و عوسمانییەكانیان لێ وەدەرنا. پاشان نێردراوی باڵای بەریتانیا، پێرسی كۆكس، مكوڕ بوو كە ویلایەتە كوردییەكەی مووسڵ، لەگەڵ دوو ویلایەتە عەرەبییەكەی باشوور، ویلایەتی بەغداد بەزۆرینەی سوننەوە و ویلایەتی بەسرەی بە عەرەبی شیعەوە، بئاخنێتە ناو قەوارەیەكی سیاسیی تازە و ناوی لێنا عێراق. لە دوای ئەوەش ئەنجوومەنی كۆمەڵەی نەتەوەكان بڕیارێكی لە بەرژەوەندی بەریتانیا

دەرکرد و ویلایەتی مووسڵی بەزۆرینەی کوردەوە هاوێشتە بەر دەستی بەریتانییەکان و ئەوانیش لە ناو عێراقیان ئاخنی.

چەند مەرجێک لە پێش سەلماندنی ئەو کردە خراپەدا هەبوو؛ یەکێکیان ئەوەبوو کە هەر کاتێک کورد بیەوێ، ڕاپرسی بکا و مافی ئەوەشی هەبێ کە لە عەرەبی عێراق جودا بێتەوە، بەڵام کە زۆر هات..قەواڵە بەتاڵە، ئیتر خاک و گەلی کوردیان لە باشووری کوردستان، لە بن دەستی عەرەبان دانا و بە پێچەوانەی حوکمی مێژوو و ڕاستی جیۆگرافی و دیمۆگرافی هەموو شتێکیان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان ڕاپەڕاند.

**میلان.** ئەفسانەیەکی کۆنی کورد هەیە دەڵێ:- "هەموو خێڵ و هۆز و تیرە و بنەماڵە کوردەکان بە ڕەچەڵەک لە دوو هۆزی بنەڕەتی پەیدابوونە؛ یەکەمیان میلان و دووەمینیشیان زیلان بووە. میلانەکان لە باشوورەوەڕا هاتن و زیلانەکانیش لە ڕۆژهەڵاتەوەڕا هاتن و لە کوردستان جێگیربوون و لەگەڵ یەکتر تێکەڵبوون و کوردیان لێ پەیدا بوو". گەلێ عەشیرەت هەیە ئێستاش باوەڕیان وایە نەوەی یەک لەو دوو گرووپەنە. لە سەرەتای سەدەی ٢٠ـەم، ئیبراهیم پاشا سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنێکی میلان بوو، کە لە باشووری ڕۆژئاوای کوردستانی باکور، لە ناوچەی غازی عەنتاب و دەوروبەری بوو.

**میللەت.** ئەو زاراوەیە لەگەڵ سەرکەوتنی ئیسلام و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی پەیدا بوو. میللەت هەموو ئەو نەتەوانەی دەگرتەوە کە باوەڕیان بە ئیسلام بوو، بۆیەش لە سێبەری ئەو یاسایە کەمینە نەتەوەییەکان تووشی سیاسەتی جیاوازیی ڕەگەزی نەدەهاتن و زۆر لە مافە کولتووری و کۆمەلایەتییەکانیان پارێزراو بوو. زاراوەی میللەت تا کۆتاییی دەوڵەتی عوسمانی هەر مابوو، هەر هەمان مانای ئەو گەلانەی دەدا کە موسڵمانبوون و لەبن ئالای دەوڵەتی ئیسلامی دەژیان.

لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە کۆتاییی شەڕی یەکەمی جیهانی و دامەزرانی دەوڵەتە هاوچەرخەکان، واتای ئەم زاراوەیە گۆڕا و ئێستا میللەت بە مانای گەل، نەتەوە، قەوم، قیلە دێت.

**میللی گوڤەنلیک کورولو (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی)**. لە تورکیا، گەلێ جاران وەک بالاترین دەسەلات ڕەوشت دەکا. ئەو ئەنجوومەنەی ئاسایشی تورکە هەر لە سەرەتاوە گەورەترین دەستەی سەرکوتکردنی کورد بووە و هەمیشە گەورەترین تەگەرە بووە و نەیهێشتووە هیچ چاکسازییەک لە باری سیاسی و کۆمەلاتی و کولتووری کوردەوە لەو ولاتەدا بکرێ.

دەسەلاتی بەهێزی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورک لە مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە هاتووە؛ چونکە ئەتاتورک بۆ خۆیشی کابرایەکی ئەفسەر بوو بۆیە دەسەلات و هێزەکەی لە بنەڕەتدا لە هێزی سەربازی بوو. وەک ئەوەی ئاشکراشە تەنیا لەشکری تورک بوو لە دوای ڕووخانی دەولەتی عوسمانی توانیی لەلایەک پەلاماری یۆنانەکان تێک بشکێنێ؛ لەلایەکی دیکەوە ئەرمەنییەکان قەلاچۆ بکا؛ لە بەرەی سێیەمیش ڕاپەڕینەکانی کورد دامرکێنێتەوە؛ بۆیە تورکەکان یەک ڕیز پشتی سوپا نەتەوەپەرستەکەیان گرت و وای کرد کە سوپا ڕۆلێکی سەرەکی لە هەلسووڕاندن و سیاسەتسازیی ولاتدا هەبێ. کودەتایە سەربازییەکەی ١٩٦٠، دەستوورێکی نوێی لێ پەیدا بوو. ئەو دەستوورە لە ژێر کاریگەریی سوپاسالارانی تورک نووسراوە و لە ١٩٦١ـەوەڕا ئیشی پێ کرا و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی یەک لە بەرهەمەکانی ئەو دەستوورەی ئەو کات بوو. میللی گوڤەنلیک کورولو لە ١٠ ئەندام پێک هاتووە و بە پێی پلانێکی تایبەت ئاراستەی سیاسەتی ئاسایشی ناوخۆیی و دەرەکی حکوومەتی تورک دەکا. سەرۆک کۆمار سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنەکە دەکا؛ ئەگەر ئەویش نەبێ، ئەوکات سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران سەرۆکایەتی ئەنجوومەنەکە دەکا. سەرۆکی دەستەی سوپاسالاری تورک و هەر چوار سەرکردەی بالی سوپا (هێزی زەمینی و هێزی ئاسمانی و هێزی دەریاوانی و جەندرمە) و وەزیرانی بەرگری و کاروباری دەرەوە و ناوخۆی تێدا ئەندامن.

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی توانیویەتی، لە بواری ئاسایشی نەتەوەییدا، سیاسەتی حکوومەت کۆنترۆل بکا و دەسەلاتی خۆیشی بەسەر حکوومەتە سیڤیلەکاندا بسەپێنێ. لە دوای کودەتایەکەی ١٩٧١یش، میللی گوڤەنلیک کورولو، دەسەلاتی ئەوەشی بۆ مسۆگەر بوو کە ئەنجوومەنی وەزیران دەبێ هەموو

فەرمانەکانی جیبەجێ بکا و نابێ لاملی بکا. لە دوای کودەتایەکەی ١٩٨٠ش، بۆ ماوەیەکی کورت هەر هەموو دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی وڵات و داڕشتنی سیاسەتی دەرەوە و ناوەوەی تەنیا بەدەستی میللی گوڤەنلیک کورولو بوو؛ کە سەرۆکی دەستەی سوپاسالاری تورک، ژەنراڵ کەنعان ئێڤرن، سەرۆکایەتی دەکرد و پاشان لە ١٩٨٢ تا ١٩٨٩ سەرۆکی وڵات بوو. بەناوی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆریزم، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی فرە مافەکانی مرۆڤی پێشێل کرد.

لە ١٩٩٠کان، میللی گوڤەنلیک کورولو، لە هەڵسوکەوتکردن و بەرهەڵستکردنی تەواوی کێشەی کورد لە تورکیا بەرپرسیار بوو. لە سەرەتای ١٩٩٧، میللی گوڤەنلیک کورولو، بەتەواوەتی بایکۆتی چالاکییەکانی حکوومەتە ئیسلامییەکەی حزبی ڕەفای ئیسلامیی نەجمەدین ئەربەکان کرد و پاشتر لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا "کودەتای شارستانی" دژی ڕاپەڕاند و ئەربەکانی زیندانی کرد.

یەک لە خواستە سەرەکییەکانی یەکێتیی ئەورووپا بۆ ئەوەی تورکیا بەئەندام وەربگرێ ئەوەیە کە دەبێ دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کەم بکاتەوە و تەگەرە لە پێش کارەکانی حکوومەتە سیڤیلەکانی تورک دانەنێ.

**میت "میللی ئیستیخبارات تەسەیلاتی"**. واتا ڕێکخراوی نووچەگریی نەتەوەیی. هەرچەندە میت بە فەرمی لە ١٩٦٥، دەستبەکار بووە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر لە١٩٢٠کاندا سڵی لە بواری کۆکردنەوەی زانیاریی بەرانبەر نەکردووە. ڕێکخراوی نووچەگەریی نەتەوەیی تورک (میت) لە هەردوو لای ناوەکی و دەرەکی کار دەکا. بە پێی یاسا، دەبێ میت ڕاپۆرتەکانی خۆی بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بەرز بکاتەوە، کەچی لە بواری پراکتیکیدا، چالاکییەکانی پتر بە لایەنی سوپاوە بەندە و بەمجۆرە لە ڕێگەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیییەوە دەست لە کاروباری حکوومەتە سیڤیلەکانی تورک وەردەدا.

بە پێی یاسا، میت کارمەندی تایبەتی خۆی نییە، بۆ ئەوەی وەک ئیستیخباراتی عێراقی سەردەمی سەدام حوسێنی هاووڵاتییان بگرێ، ئەشکەنجە بدا و بزر بکا و بکوژێ و لە ناو ببا، بەڵکو تەنیا دەسەڵاتی کۆکردنەوەی زانیاری و بەرەنگاربوونەوەی نووچەگەریی دەرەکی هەیە. لە بواری ناوەخۆشدا، میت تەنیا دەسەڵاتی

لێکۆڵینەوەکردنی لەگەڵ کۆمونیست و چەپڕەو و شۆڕشڤانانی کورد و ڕاستڕەوە توندڕۆیەکاندا هەیە.

لە ڕاستیشدا، وا نییە و واش نەبووە. چونکە میت هەمیشە ڕاستڕۆیە توندڕۆیە تورکەکانی وەک ئامێرێک بەکار هێناوە بۆ ئەوەی گورزی خۆی لە گرووپە چەپڕەو و شۆڕشگێڕە کوردەکان بوەشێنێ. بۆ نموونە، میت ڕۆڵێکی ئابڕووبەری لە ڕیسواکارییە نا هەموارەکەی سوسورلوک دا گێڕاوە بۆ ئەوەی بە ئەنجامدانی کردەوەی دژەیاسا پارتی کرێکارانی کوردستان لەناو ببا. لە نۆڤێمبەری ١٩٩٦دا، ڕیسواکارییەکە ئاشکرا بوو.

**میر**. نازناوی ئەو فەرماندارانەی میرنشینە کوردەکانی نێوان سەدەی ١٤و سەدەی ١٩ی مێژووی کوردی بووە. زۆرینەی ئەو میرنشینانە خاوەن دەسەلات و سەربەخۆیی خۆیان بووینە، بەڵام گەلێ جاریش سوڵتانە عوسمانییەکان کە خۆیان بەهێز دەبینی یان پەلاماری ئەو میرنشینانەیان دەدا و خاپووریان دەکرد یان ئەگەر نەیانتوانیبا، بە فێڵ لەناویان دەبردن. وەک ئەوەی کە لەگەڵ میر محەمەدی گەورەی پاشای ڕەواندز کردیان.

**میری کۆر (میری گەورە)**. سەیری "سۆران" بکە.

**مینۆرسکی**. سەیری (ڤلادیمێر مینۆرسکی) بکە.

**مێجەر نۆویل**. سەیری (ئێدوەرد نۆویل) بکە.

# ن

**ناسیۆنالیزم.** کە گەلێک یان گرووپە کەسێکی گەورە دەخوازێ دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی هەبێ، یان بەلایەنی کەمەوە مافی بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی تایبەتمەندییە کولتووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییییەکانی خۆی هەبێ و بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەش چالاکی دەکەن، ئەو پرۆسەیە بە ناسیۆنالیزم، یان ناشنالیزم یان نەتەوەپەروەری یان نەتەوەپەرستی دەناسرێ. لە کن ئەو کەس و چین و لایەنانەی باوەڕیان بە بیری ناشنالیزم هەیە، لووتکەی لۆیالْ (ولاء)ی مرۆڤ بۆ نەتەوەکەی دەبێ و دەوڵەتی نەتەوەییش دەبێتە ئامانجی هەرە گەورە و نموونەیی ڕێکخراوە سیاسییەکان و خەباتیشی لە پێناو وەدیهێنانیدا دەکەن.

هزری ناسیۆنالیزمی، لە بواری ڕامیاری نێونەتەوەییدا، دیاردەیەکی مەیلەو نوێیەو لە کوردستانیش هێشتا ماوە پێ بگا؛ هۆی سەرەکیی نەگەیشتنی هزری نەتەوەپەروەری لە ناو کورد دەگەڕێتەوە بۆ باوی دەسەڵاتی خێڵەکی و دوژمنیش ڕۆڵی ترسناکی لەو بابەتەدا هەبووە. پێشتر خەڵک لۆیالی ئیمپراتۆر و شا و دین و مەزهەب و هەندێ کەڕەت بۆ شار و گوند و هۆز و تیرە و بەرەبابیش بووە. شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩، سەرەتای دیاری سەرهەڵدانی هزری نەتەوەپەروەریی هاوچەرخ بووە. ئیتر لە دوای ئەو شۆڕشە بوو فیکری ناسیۆنالیزمی بەرەو هەموو ئەورووپا هەڵکشا و پاشان هەموو دنیای گرتەوە.

بەپێی هزری ئیسلام، میللەتی ئیسلام "الأمە الإسلامیە" تەوەری ئامانجی سیاسی بووە. بۆیە لە سەرەتادا، هەر هزرێکی ناشنالیزمی بە توندی لە جیهانی ئیسلامی بەرپەرچ دەدراوە و نامۆیی لێ دەکرا. بە بۆچوونی ئیسلام، موسڵمانان بە ژن و بە پیاوەوە، هەموو برا و خوشکی یەکن. نە ڕەگەز، نە ڕەنگ، نە زمان، نە کولتوور، نە نەریت هیچیان لە بەهای ئەم برایەتییە کەم ناکەنەوە. ئەم بنەمایانەبوون تا ماوەیەکی زۆر ڕێگەیان لە بزووتنەوە نەتەوەییییەکانی ناو دنیای ئیسلام گرت و دەوڵەتی عوسمانی، تا سەرەتای سەدەی ٢٠ـەم، پڕۆپاگەندەی بۆ ئەو بنەمایانە دەکرد و

هەوڵی دەدا نەتەوەکانی بەر سێبەری سوڵتان لە ڕاستی جۆری پیادەکردنی ناڕاستی ئەو بنەما پیرۆزانە تێ بگەن و لە پەنای ئەو دروشمە تریفەدارانە بوو گەلەکانی ژێردەستی خۆیانیان، بە گەلی کوردیشەوە، دەچەوساندەوە.

لە سەدەی ١٩م، گەلەکانی بندەستی عوسمانییەکان بەسەر فێڵەکەیان کەوتن و لە پێشدا، کریستیانەکانی ئەوروپا و پاشان لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، عەرەبەکانیش لێیان هاتنە دەست و بەدوای سەربەخۆیی خۆیاندا گەڕان. نەتەوەپەرستە ئەرمەنییەکان لە سەدەی ١٩م ڕیزەکانی خۆیان ڕێک خست. تورکە نەتەوەپەرستەکانیش لەسەر کەلاوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەوڵەتی تورکیای نوێیان دامەزراند. بزووتنەوەی زایۆنیزم، چالاکانە کاری کرد و وڵاتێکی سەربەخۆی بۆ جوولەکەکان لە ١٩٤٨ لە ئیسرائیل دامەزراند. عەرەبەکان، پێش دامەزراندنی ئیسرائیل یەک ئاڵایان هەبوو. بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، عەرەب فریویان خوارد و هەستان وڵاتی خۆیان بەش بەش کرد و پتر لە ٢٠ وڵاتیان لێی دامەزراند و ئاردی خۆیان بەناو دڕکدا پەرت کرد. هەردوو هزری ناشینالیزمی عەرەب و جوولەکە ناهێڵێ کێشەی عەرەب– جوو چارەسەر ببێ.

هزری ناشنالیزمی لە ئیسلامەتیدا نییە. بەڵکو بیرۆکەی "أمە" واتا نەتەوەی ئیسلام هەیە. سیاسەتمەدارانی عەرەب لەکاتێکدا بەخۆیان باوەڕیان بەو بیرۆکە ئیسلامییە نییە؛ فرە کەڕەت دینی ئیسلامیان بۆ بەرژەوەندی ناسیۆنالیزمی خۆیان وەک داردەستێک دژی هزری نەتەوە غەیر عەرەبییەکان بەکار هێناوە بۆ ئەوەی هەر لە بندەستی خۆیانیان بهێڵنەوە. لە عێراق و سووریا دژی کورد و لە میسر دژی قیبتییەکان و لە باکوری ئەفریقا (لیبیا و تونس و جەزایر) دژی بەربەرەکان و لە مەغریب تا ئێستاش دژی گەلی سەحراوی بەکار دێ. هێشتا لەمەش پتر، دەسەڵاتدارانی عەرەب وڵاتەکەی خۆیانیان بۆ بەرژەوەندی تەسکی تایفەگەری یان خێڵەکی، دابەش کردووە و پتر لە ٢٠ دەوڵەتی دژی یەکتریان دامەزراندووە و هیچیان قایل نین، بۆ ئەوی دیکەیان بسەلمێنی و بە براگەورەی بناسێ. ئەم هۆیانەیە هزری نەتەوەیی لەسەر ئەرکی فیکری میللەتی ئیسلام گەشە دەکا. ئەو هەموو لەشکرە گەورە بەو هەموو چەکە زۆر و ترسناکانە و بەرنامەکانی خوێندن لە

قوتابخانەکان و شێوەی قوڕسی بیوڕۆکراسی و چاپەمەنییەکان و گواستنەوە و گەیاندن و دەسەڵاتە ناوەندە بەهێزەکان، هەموو هانی گەشەکردنی نەتەوەپەرستییەکی هاوچەرخ دەدەن. ناسیۆنالیزمی نەتەوەیی پتر لە یەک سەدەیە نوێ دەبێتەوە و دنیای ئیسلام بەرەو ڕۆژئاوا ڕادەماڵێ.

هزری ناسیۆنالیزمی بە درەنگەوە بۆ ناو کورد هات و تا ئێستاش لە زۆر لایەنەوە دەلەنگی و خۆی نەگرتووە. بەڵام لەگەڵ لەرزۆکیی فیکرەکە، ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی لەناو کۆمەڵانی کورددا هەبووە. سەلاحەدین، کورد بوو، بەڵام بەر لەوەی کوردپەروەر بێ، لۆیالی ئیسلام بوو. تورکیا تا ئێستاش ترسی لە فیکری جوداخوازە ئیسلامییەکان هەیە؛ چونکە دەوڵەتەکە عیلمانییە. بەڵام ئەوەی کە لە سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا جێی سەرسووڕمانە، ئەوەیە کە دێتە سەر مافی کورد، دان بە بوونی ئەو گەلە دانانێ و بە تورکی شاخ ناوی دێنێ و دەڵێ هەموو ئیسلامین و لە میللەتی ئیسلام جیاوازی لە نێوان نەتەوەیەک و نەتەوەیەکی دیکەدا نییە و بەم پێیە قایل نییە بە هیچ جۆرێک دان بەبوون و بەمافەکانی کورددا بنێ. پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣ش دانی بەمە داناوە و وڵاتانی ڕۆژئاواش بۆ تورکیایان سەلماند کە تەنیا کەمینە نا-موسڵمانەکانی ناو تورکیا مافی کولتوورییان دەبی و موسڵمانەکان چونکە هەموو یەک میللەتن بۆیە هەر بە تورک دەناسرێن و هیچ مافێکیان نابێ. یۆنانییەکان و ئەرمەنییەکان و جوولەکە لە تورکیا باری تایبەتییان هەیە و کورد چونکە ئیسلامە نەک هەر هیچی نییە، بەڵکو نکووڵی لە بوونیشیدا دەکرێ. لەوەش سەیروسۆبەتتر ئەوەبوو، کاتێک کە یەکەم سەرۆک وەزیری ئیسلامی لە تورکیا، نەجمەدین ئەربەکان پۆستی سەرۆک وەزیرانی وەرگرت، مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کە کێشەی کورد لە وڵاتەکەی چارەسەر دەبێ، ئەگەر یەکێتی لە نێوان (برایە موسڵمانەکان) توندتر ببێ.

کورد بەردەوام لە چەنگی کۆلۆنیالیزمی ناوخۆییدا دەناڵێنێ، چونکە وڵاتیان بەلای کەم بەسەر چار وڵاتی داگیرکەردا دابەش کراوە، کە تورکیا و ئێران و عێراق و سووریایە. هێزی داگیرکەر هەمیشە بەرپەرچی هزری ناسیۆنالیزمی کوردی (کوردایەتی)ی داوەتەوە و نەیهێشتووە بە شێوەیەکی سروشتی گەشە بکا. هەرچەندە دانەری ئەم کتێبە لەو باوەڕەدایە کە ئەگەر ئەم بارودۆخەی ئێستا پتر

بەڕێوە بچێ، ڕەنگە لە کۆتاییدا ئەو دەوڵەتە دەستکردانەی کە کوردیان تێدا هەیە بتوانن کوردەکانیان بتاوێننەوە. منی وەرگێڕیش بە پێچەوانەی مایکڵ گەنتەر، بیر دەکەمەوە و دەڵێم ئەگەر وا بڕوا، زۆر لەگینە ئەو دەوڵەتە دەستکردانەی گەلی کورد دەچەوسێننەوە لە ماوەی چەند دەیەیەکدا لەناو بچن و دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی مەزن دابمەزرێ. گەلی کورد زۆر لە دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتانە شارستانی ترە و ئەم چەرخەش سەردەمی سەرکەوتنی شارستانی و مافەکانی ئینسانە. لەگەڵ ئەمەشدا، زانایان توێژینەوەیان دەربارەی ئەو دەوڵەتە دەستکردانە کردووە کە هێزە داگیرکەرەکان لە ئەفریقیادا دروستیان کردوون و بۆیان سەلماوە کە ئەو دەوڵەتانە توانیتیان هەستی نەتەوەیی ڕەسەنی خەڵکەکە بگۆڕن و جۆرە هەستێکی جیاوازیان لە لا دروست بکەن تا ئەو ڕادەیەی وایان لێیان کردووە کە پێناسەی خۆیان بگۆڕن. هەندێ زانای دیکەش بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو دەوڵەتانە دەتوانن نەتەوە بە خەیاڵ دروست بکەن و سەرلەنوێ دایبهێنن.

جگە لەو مەترسییانە، کوردایەتی هێشتا لە بن فشاری بنەماڵە و تیرە و هۆز و خێڵ و دیالەکتی جیاوازی زمان و چەندین جۆرە پێوەندیی تەسکی تری دژی کوردایەتیدا دەناڵێنێ. کوردایەتی لە شوێنێکدا چەقیوە و نەیتوانیوە وەک هزرە ناسیۆنالیزمییەکانی دیکەی کە سەدەیێک بەر لە ئێستا پەیدابوون گەشە بکا. لە ئەنجامدا، بۆمان دەسەلمێ کە تا ئێستا هیچ سەرکردەیەکی کورد نەیتوانیوە بسەلمێنێ کە لە قاوغی خێڵەکی و لە پێستی سەرکردەیەکی شەڕەنگێزەوە دەرچووە و بووەتە سیاسەتوانێک کە دەوڵەت بتوانێ بەڕێوە ببا.

بە پێی ئەم بۆچوونە، ئەگەر سستەمی ئەو دەوڵەتانەی ئێستاکە لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا هەیە بە جارێک تێک نەچی و نەڕمێ، ناشێ بەم زووانە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دروست ببێ. ئەگەر ئەو بوومەلەرزەیەی شەڕی یەکەمی جیهانی نەبا، مەحاڵ بوو پۆڵۆنیا لە ژێر زنجیری ئەو کۆلۆنیاڵە ناوخۆییە ڕزگاری ببێ کە پروسیا و نەمسا و ڕووسیا هەر لە ١٧٩٥ڕا تا ١٩١٩ تێیان ئالاندبوو. پاشان تا یەکێتیی سۆڤیەت لە ١٩٩١دا نەڕووخا، پۆڵۆنیا نەیتوانی بەڕاستی سەربەخۆیی خۆی بەدەست بێنێتەوە.

هەرچەندە شەڕی کەنداوی ١٩٩١، دەوڵەتێکی دیفاکتۆی لاوازی کوردی لە کوردستانی باشوور لێ پەیدا بوو، بەڵام هێشتا پێویستی بە شەڕێکی دیکەی جیهانی هەیە بۆ ئەوەی کوردستانێکی سەربەخۆی ڕاستەقینە دروست بکا. ڕەنگە ئەو کوردانەی لە دەوڵەتە دیمۆکراسییەکانی تاراوگەدا دەژین بتوانن پلە بەپلە تۆوی هزرێکی کوردایەتی ڕاستەقینە بچێنن و گەشەی پێ بدەن. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەگەر دیمۆکراسییەکی ڕاستەقینە و تەواو لەو وڵاتانەی ئێستا هەن و کوردستانیان داگیر کردووە، بەرپا ببێ، ئەو کات کورد دەتوانن سوود لە مافی کولتووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی خۆیان بێ پێچوپەنا ببێنن. ئەم مافانە لەگەڵ هزری ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ هاوبوونی یەکترین و لێک نابنەوە.

**ناوچەی ئارام.** لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی گەلی کورد لە ١٩٩١، بۆ ماوەیەکی کاتی ناوچەیەکی بچووکی دەوروبەری زاخۆ ئارام کراوە بۆ ئەوەی ئەو کوردە پەناهەندانەی دەربازی نێو خاکی تورکیا بووبوون بتوانن بگەڕێنەوە و لەوێ هێزێکی فرە ڕەگەز بیانپارێزی و نەهێڵێ لەشکرەکانی سەدام حوسێنی دووبارە پەلاماریان بداتەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان و گرۆیەک لە وڵاتە هاوپەیمانەکانی لە شەڕی کەنداو، پشکداریی دامەزراندنی ئەم ناوچە ئارامەیان کرد.

یەکەم جار سەرۆکی ئەوسای تورکیا، تورگۆت ئۆزال، پێشنیازی بیرۆکەی دامەزراندنی ناوچەی ئارامی کرد و پاشان جۆون مێجەری سەرۆک وەزیرانی ئەوسای بەریتانیا، پشتیوانیی لە بیرۆکەکە کرد. لە ٥ی نیسانی ١٩٩١، ئەنجوومەنی ئاسایشی نێونەتەوەیی بڕیاری ٦٨٨ی دەرکرد و بەو بڕیارە سەرکۆنەی "سەرکوتکردنی هاووڵاتییانی عێراقی...لە ناوچە کوردنشینەکانی عێراقێدا کرد." داواشی کرد "عێراق...دەمودەست هەموو جۆرە سەکوتکارییەک ڕابگرێ،" بە پێی ئەو بڕیارە تواندرا بە شێوەیەکی یاسایی ناوچەی ئارام و ئاسمانی دژە فڕین دابمەزرێ و ئەمەش یارمەتیی پاراستنی کوردی لە دەستی سەدام حوسێنی دا. ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردن توانی ناوچەی ئارام بپارێزی و لە ئەنجامدا سەدام حوسێن بڕیارێکی چەواشەکارانەی دا و هەرچی داوودەزگا و ڕێکخراوی میری هەبوو هەمووی لە کوردستان کشاندەوە و بەرەی کوردستانی توانیی هەلەکە بقۆزێتەوە و لە

١٩ی ئایاری ١٩٩٢دا یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد لە کوردستاندا کرا و پەرلەمانی کوردستان هەڵبژێردرا و حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێک هات. ناوچەی ئارام تا کاتی ڕووخانی سەدام حوسێنی لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، هەر بەردەوام بوو.

**ناوچەی ئۆتۆنۆمی.** لە ئاماژەکردن بۆ ئەو قەوارە سیاسییەی کە حکوومەتی عێراق لە ١٩٧٤، لە باکوری عێراق بە مەبەستی ئەوەی جۆرە حوکمێکی زاتی بداتە کوردان، ئەم زاراوەیەی فرە جار بەکار دەهێنا. مەلا مستەفا بارزانی ئەو ئۆتۆنۆمییەی ڕەتکردەوە؛ چونکە بە پاشگەزبوونەوە لە جێبەجێکردنی بەیانی ئاداری ١٩٧٠ زانی و شەڕ دەستی پێ کردەوە و دواتر بۆ بارزانی نسکۆی لێ کەوتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو ڕووداوانەی لەو کاتەوە هاتوونە پێشەوە، هێشتا حکوومەتی عێراقی، بە ڕوواڵەت قەوارەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە باکوری عێراق هەر هێشتەوە.

**ناوچەی دژە فڕین.** لە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینە سەرتاسەرییەکەی گەلی کورد دژی دەزگا سەرکوتکەرەکانی سەدام حوسێنی لە ئاداری ١٩٩١و ئەو کۆڕەوە ترسناکەی گەلی کورد بەرەو سنوورەکانی وڵاتانی دراوسێ، وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فرەنسا، ناوچەی نەفڕین No- Fly Zone یان لە باکوری هێڵی ٣٦ی هاوتەریب لە کوردستانی باشوور دامەزراند بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ پەنابەرە کوردەکان خۆش بکەن تا بەبێ ترس لە پەلاماری سەرکوتکاری سەدام حوسێنی، بۆ شوێنەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. فڕۆکە جەنگییەکانی هاوپەیمانان، ئەوانەی لە کوردستانی باکور (باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا)دا جێگیربوون؛ ناوچەی نەفڕینیان پاراست. پرۆسەکە بە گوێرەی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ژمارە ٦٨٨ی ٥ی نیسانی ١٩٩١، لەسەر ناوچەکە سەپا بوو. ئەم بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایش (سەرکوتکردنی هاووڵاتییە سیڤیلەکانی عێراقی...لە ناوچە کوردنشینەکاندا) ماندەل و ڕیسوا کرد و داواشی کرد؛ "عێراق...دەمودەست کۆتایی بە سەرکوتکردن بێنێ."

ئەو پرۆسەیەی بۆ پاراستنی کورد کرا، بە ئۆپەراسیۆنی جێ خۆشکردنOperation Provide Comfort یش دەناسرا. پاشتر لە پاش ١ی یەنایری ١٩٩٧، ناوەکەی گۆڕا؛ ئەمجارە بە ئۆپەراسیۆنی چاودێریی باکور Operation Northern Watch ناسرا و

فرەنسا خۆی لێ دزییەوە. ناوچەی دژە فڕین کوردی پاراست و هێندەش ئاسایشی بۆ ڕەخساند کە توانیی دەوڵەتێکی دیفاکتۆی کوردی دابمەزرێنێ. ڕووبەری ئەم دەوڵەتە نزیکەی ١٧,٠٠٠ میلی دووجا دەبوو و بەشی زۆری کوردستانی باشووری لە خۆ گرتبوو. بەڵام هێشتا ناوچەی بەعەرەبکراوەکانی وەک کەرکووک و خانەقین و شەنگال و بەدرە و مەندەلی تێدا نەبوو. پاشتر وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا ناوچەیەکی دژە فڕینیشیان لە باشووری عێراق بۆ پاراستنی عەرەبە شیعەکان، دامەزراند، بەڵام ئەو شیعانە نەیانتوانی وەک کورد هەلەکە بقۆزنەوە و حکوومەتێکی دیفاکتۆ بۆ خۆیان ڕێک بخەن و دەسەڵاتی سەدام حوسێنی لە ناوچەکە ڕاو بنێن.

**نەجمەدین ئەربەکان (١٩٢٦–    )**. موریدی تەکیەی نەقشبەندییە و لە ١٩٧٠وەڕا، لە تورکیا، سەرۆکایەتی چەندین پارتی ئیسلامیی کردووە. لە تەممووزی ١٩٩٦، نەجمەدین ئەربەکان هاوپەیمانێتی لەگەڵ تانسۆ چیلەری سەرۆکی پارتی ڕێگەی ڕاست (دۆغرو یۆڵ پارتیسی) کرد و پۆستی سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی سێکیولاری تورکیای وەرگرت.

بەرلەوەی ببێتە سەرۆکی وەزیران، ئەربەکان جاڕی دا کە کێشەی کورد لە تورکیا لەسەر بنەمای یەکێتیی ئیسلامیدا چارەسەر دەکات. ئەم هەڵوێستەی ئەربەکان گەڕانەوەیەک بوو بۆ ڕۆژانی بەسەرچووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. هەرچەندە ئەربەکان دەنگی زۆرینەی کوردەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی وەرگرت، بەڵام، بۆ چارەسەری کێشەکەیان، هیچی پێ نەکرا. لەمیانی سەردانی لیبیا، لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، کاتێک کە سەرۆکی ئەوێ، موعەممەر قەزافی، گوتی دەبێ کوردەکانی تورکیا سەربەخۆ بن، ئەربەکان زۆر هەراسان بوو.

بە هۆی هەڵوێستی سوپا و سێکیولارە تورکەکان ئەربەکان نەیتوانی سیاسەتی تورکیا بگۆڕێ. لە حوزیرانی ١٩٩٧، سوپای تورک ئەربەکانی ناچار کرد کە دەست لە کار بکشێنێتەوە و پاشان لە یەنایری ١٩٩٨، حزبەکەشی "حزبی ڕەفا"ی قاچاغ کرد. بەڵام ئەربەکان بەردەوام لە پەنای پەردەوە کاری خۆی دەکرد و کاریگەریی خۆی هەر هەبوو. لە سەرەتای ٢٠٠٢، یاساغییەکەی لەسەر نەما، بەڵام کار لەکار ترازابوو بۆی؛ چونکە درەوشانەوەی ئەستێرەی ئاق پارتیسی و سەرکردەکانی

ڕەونەقیان بۆ ئەربەکان نەهێشتبوو. جگە لەمەش تەمەنی ئەربەکان ڕێگەی نەدا ئیتر ئەسپی خۆی وەک جاران لینگ بدا و دەسەڵات وەربگرێتەوە.

**نەجمەدین کەریم (١٩٤٩-     ).** دەمڕاستێکی دیار و پەرۆشی کێشەی کوردە لە وڵاتە یەکگرتووەکان دەژی و پێشتر بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کورد لە ئەمەریکای باکور بووە. لە ١٩٩٦، د. کەریم یارمەتیی دامەزراندنی ئەنستیوتی واشنتنی کوردیی لە واشنتن داوە و ئێستاش سەرۆکییەتی.

د. نەجمەدین کەریم لە کاتی لاوێتیدا، نۆژداری تایبەتی مەلا مستەفا بارزانی بووە. پاشتر وەک دکتۆرێکی پسپۆر لە نەشتەرگەریی مێشک لە واشنتن، ناسراوە. بە هۆی ئەو زانیاری و پێوەندییانەی کە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکان هەیەتی، نەجمەدین کەریم ماوەیەکە، لە پەنای پەردەوە، ڕۆڵێکی گرینگ لە سیاسەتی کوردستانی عێراقدا دەگێڕێ. لە ٢٠٠٢، یەکێک لەو ٦٥ کەسایەتییانە بوو کە لە کۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە لەندەن، بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا.

**نەتەوە یەکگرتووەکان.** نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێکخراوێکی نێونەتەوەییە، بە پێی بەندی ١ی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی دامەزرا تا: "ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی بپارێزێ."، چونکە یوئێن ڕێکخراوێکی نێونەتەوەییە و لە دەوڵەتانی سەربەخۆ پێک هاتووە و چونکە کورد دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان نییە، بۆیە بە شێوەیەکی یاسایی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئەندام نییە. لە ڕاستیدا، ئەو دەوڵەتانەی کە کوردستانیان داگیر کردووە (تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا)، بەرژەوەندی زۆریان لەوەدا هەیە کە نەهێڵن کێشەی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا باس بکری و مەبەستی سەرەکیشیان پاراستنی ئەو سنوورە جیۆگرافییەیە کە ئێستا هەیانە و دەستبەرداری ئەو بەشانەی کوردستان نابن کە داگیریان کردووە. هەندێ دەوڵەتی دیکەش هەنە نایانەوێ کێشەی لەم بابەتە بچێتە پێش نەتەوە یەکگرتووەکان، چونکە نایانەوێ دەرخوونە لەسەر کێشە تایبەتییەکانی خۆیان هەڵبدرێتەوە. تا کۆتاییی شەڕی کەنداوی ١٩٩١، نەتەوە یەکگرتووەکان هیچی پێ نەبوو کە بۆ کوردی بکا و هیچیشی بۆ چارەسەری کێشەی

کورد نەکردبوو. ئەوەی کە بابەتێکی زۆر لابەلا و سەیرە، ئەوەیە کە پتر لە نیوەی ئەو وڵاتانەی کە ئێستا بە پێی یاسای نێونەتەوەیی، لە نەتەوە یەگرتووەکاندا ئەندامن، ژمارەی دانیشتوانیان لە ئاماری گەلی کورد کەمترە.

ئەوانەی کە دەیانەوێ کێشەی کورد ڕێگەیەکی بۆ بکرێتەوە تا لە وێوەڕا بگاتە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئاماژە بۆ بەندی ١ی چارتەری نەتەوە یەککگرتووەکان دەکەن، چونکە بەندەکە ئامانجەکانی ئەو ڕێکخراوە نێونەتەوەییە دەستنیشان دەکا کە دەیەوێ: "لەسەر بناغەی ڕیزگرتنی بنەمای مافی یەکسانی و چارەی خۆنووسینی گەلان؛ پێوەندیی دۆستانە لە نێوان نەتەوەکان پەرە پێ بدا" و "هاریکارییەکی نێونەتەوەیی ئاوا پەیدا بکا کە بتوانێ کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و مرۆییە نێونەتەوەییەکان چارەسەر بکا و پشتوانییەکی وا بکا، کە بێ ڕەچاوکردنی هیچ جیاوازییەکی ڕەگەزی یان توخمی یان زمانی یان ئاینی، پتر ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان بگیرێ." بەندی ١٤م لەمەش دوورتر دەڕوا و ئاشکرا دەکا کە: "ئەنجوومەنی گشتی دەشێ هەندێ ڕێنوێنیی بدا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاشتییانە هەر بارودۆخێک ڕاست بکاتەوە کە ڕەنگە بەردەوامبوونی باری گوزەرانباشی و پێوەندیی دۆستانەی نێوان نەتەوەکان بشێوێنێ. لە ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەشی دەبێ ئەنجوومەن گوێ بە شوێنی کێشەکە نەدا."

هەرچەندە زۆر کەم کۆششی ئەوە کراوە کە کێشەی کورد بگاتە نەتەوە یەککگرتووەکان، بەڵام لە ١٩٤٦، حزبی ڕزگاریی کوردی کە لە پێش پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق دامەزرا و پاشان پێوەندیی بە پارتییەوە کرد، بە فەرمی داوای لە دەزگای نێودەوڵەتی کرد پشتی مافی چارەی خۆنووسین و سەربەخۆیی بۆ کورد بگرێ، بەڵام سەرنەکەوت. لە دوای ئەوەش کە ڕژێمی عێراق لە شەڕی ئێران- عێراق (١٩٨٠-١٩٨٨) چەکی کیمیایی دژی کوردی عێراق لە هەڵەبجە بەکار هێنا، نەتەوە یەککگرتووەکان بڕیاری ٦٢٠ لە ٢٦ی ئابی ١٩٨٨ دەرکرد و تێیدا بەکارهێنانی ئەم جۆرە چەکەی ماندەل و ڕیسوا کرد. لە هەمان کاتیشدا سەرۆکی ئێستای کوردستان، مەسعوود بارزانی، داوای لە نەتەوە یەککگرتووەکان کرد وابکەن نەهێڵن عێراق شاڵاوەکانی ئەنفال جێبەجێ بکا و چەکی کیمیایی دژی کورد بەکاربێنێ.

بەڵام وەڵامی نێونەتەوەیی ئەوە بوو کە گوێی خۆیان لە بانگەوازەکە کەڕ کرد، چونکە لەودەمدا کەم کەس هەبوو بیەوێ سەدام حوسێن لە خۆی بڕەنجێنێ.

شەڕی کەنداوی ١٩٩١، ئەم پشتگوێ خستنەی بڕییەوە و نەیهێشت. لە ٥ی نیسانی ١٩٩١، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ٦٨٨ی دەرکرد و لەو بڕیارەدا: "سەرکوتکردنی هاووڵاتییە سیڤیلە عێراقییەکانی....لە ناوچە کورد نشینەکان" ڕیسوا کرد و داواشی کرد کە "عێراق....دەمودەست سەرکوتکارییەکان ڕابگرێ."، ئەمە گرینگترین بەڵگەنامە بوو کە تێیدا بۆ یەکەم جار نەتەوە یەکگرتووەکان دانی بە کورد دانا. لە ساڵانی پاشتریش نەتەوە یەکگرتووەکان یەکەم جار ئەم بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایشی بۆ بە شەرعیکردنی دامەزراندنی ناوچەی ئارام لە باکوری عێراق، بۆ کورد، بەکار هێنا و لە جاری دووەمیش بۆ سەپاندنی ناوچەی نەفڕین سوودی لێ وەرگرت. لە سایەی ئەم پاراستنەوە بوو کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ١٩٩٢ـەوەڕا دامەزرا و گەشەی کرد. نەتەوە یەکگرتووەکان چەند بەرنامەیەکی مرۆییشی لە ناوچەکەدا هێشتەوە.

بڕیاری ژمارە ٩٨٦ی ڕۆژی ١٤ی نیسانی ١٩٩٥، ڕێگەی بە عێراق دا بڕێکی نەوتەکەی بفرۆشی و بە پوولەکەی خۆراک و پێداویستییە مرۆییەکانی دیکە بۆ گەلی عێراق دابین بکا و بەم پێیە هەندێک لەو سزا ئابوورییانەی لەسەر عێراق هەڵگرت کە لە دوای داگیرکردنی کوێت لە ١٩٩٠ بە سەریدا سەپاندبوو. پاش مشتومڕێکی زۆر، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ١١٥٣ی لە ٢٠ی شوباتی ١٩٩٨دا دەرکرد و بەپێی ئەم بڕیارە بڕی ئەو نەوتەی کە عێراق دەیتوانی پێشتر بیفرۆشێ فرە زێدە کرد و ڕێی دا عێراق هەر شەش مانگ بایی ٢,٢٥٦ بلیۆن دۆلار نەوت بفرۆشێ. ١٣ لە سەدی داهاتی ئەم نەوتە بۆ کوردستان تەرخان کرا.

تا ڕووخانی سەدام حوسێنی لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، ئەم بەرنامەیە پارەیەکی زۆری بۆ کوردستان مسۆگەر کرد و دەرگای پێشکەوتن و گەشەکردنی بۆ ئابووری کوردستان واڵا کردەوە و لە ٢٠٠٧ بووبووە نموونەیەکی زیندوو و زۆر لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین چاویان لێ دەکرد و تورکیاش هەوڵی لەناوبردنی دەدا. کێشەی کورد لە دەروازەی ئەو کارەساتانەی تووشی کوردەکانی باشووری کوردستان هات،

توانی خۆی لە هۆڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ببینێتەوە و لەوێ باسی بکرێ. شەڕی ئازادکردنی عێراق پێوەندیی نێوان کوردستان و نەتەوە یەکگرتووەکانی هێشتا بەهێزتر کرد و لە ۲۰۰۷، ئۆفیسێکی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەولێری پایەتەخت کراوە و حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش ئۆفیسێکی پێوەندیی لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان کردووەتەوە و لە ڕێگەی ئەو ئۆفیسەوە کێشەی کورد لەگەڵ یوئێن تێکەولێکە دەکرێ.

**نەستوورییەکان.** سەیری (ئاشوورییەکان) بکە.

**نەقشبەندی.** ڕێبازێکی سۆفیگەریی ئیسلامییە. لە سەرتاسەری کوردستان کاریگەریی هەبووە و هەرچەندە ئێستا شەپۆلی شارستانی خەریکە کوردستان ئاودێر دەکا، بەڵام ئەم ڕێبازە خواناسییە هێمنە هێشتا هەر جێی خۆی لە ناو کەمینە کەسانێکی کورددا پاراستووە. جگە لە تەریقەتی نەقشبەندی، تەریقەتی قادرییش لە کوردستان موریدی خۆی هەیە. جێی ڕێزە کە ئەو دوو ڕێبازە سۆفیزمە بە جووتە توانیویانە سنوورەکانی خێڵەکی ببەزێنن و لە ناو چەندین هۆز و تیرە و بنەماڵەی جیاوازدا ڕەگ دابکوتن.

ئەو دەستوور و نەریتەی کە ئێستا لە ناو دەروێشەکانی ئەو ڕێبازە سۆفییەدا پەیڕەو دەکرێن، تا سەدەی ١٤ لە کوردستاندا نەبوون. هەرچەندە تەریقەتی نەقشبەندی کە لە ناوەڕاستی ئاسیادا دروست بووە، بە ناوی بەهادین نەقشبەندیی بوخاری (١٣١٨– ١٣٨٩) کراوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کەسایەتییە دامەزرێنەری تەریقەتەکە نەبووە. بەڵکو تەنیا شێخێکی تەریقەتەکە بووە کە چاکسازیی زۆری تێدا کردووە. عەبدولخالق غوژدەوەنی کە خەڵکی غوژدەوەنی نێزێکی بوخارا بووە، دەستپێکی ئەم ڕێبازەی داهێناوە و لە ١٢٢٠دا مردووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە هەندێ لە تەکنیککاریی ویرد و ئەورادی ئاینی بودا لە ڕێبازی نەقشبەندیدا هەیە. تەریقەتی نەقشبەندی لە هیندستان و ئەنادۆڵ پەرتەی کرد و پاشان پەرەی سەند. مەولانا خالد (١٧٧٨–١٨٢٦) کە خەڵکی کوردستانی باشوور بووە، لە ١٨٠٨، بۆ خوێندن و ئیجازە وەرگرتن، سەفەری هیندستانی کردووە و سەری لە دەلهی داوە و لەوێ ئەو تەریقەتەی وەرگرتووە.

مـەولانا خـالد لـە ١٨١١هاتووتـەوە و هاتنـەوەی ئەو کـەسـايەتيـيـە بڵاوبوونەوەی تەريقـەتەکـەی لە کوردسـتـان خـێـراتر کردووە. هەندێک دەڵێن بڵاوبوونەوەی ڕێبازی نەقشبەندی، ڕێگەی لە تەشـەنەکردنی تەريقـەتی قادری کردووە. ڕێبازی نەقشبەندی بۆيە ئاوا لە کوردسـتـان پەرەی سـەند و بەری لە تـەريقـەتی قـادری گرتەوە، چونکە نەقشبەندييەکان هـەرکەسێکی شايستەبا مـاوەی خەليفـاتی و پاشان شێـخاتيشيان پێی دەدا و شێخايەتييەکەيان وەک تەريقەتی قادری نەکردە ميـرات، واتا ئەگەر باوک شێخ نەبێ کوڕ نابێـتە شێخ. هەر بۆيەش زاراوەی "شێـخی بەرماڵ" لە کوردستان باوبووە. جگە لەمـە هـەندێک وا تێ دەگـەن کـە ڕێنوێنيـيـە گـيـانيـيـەکـانی ڕێبـازی نەقشبەندی لە هی ڕێبازی قـادری باڵا ترە؛ چونکە قـادرييـەکان پتر بە دوای سـۆز و هـەوەسدا دەگـەڕێن و "حاڵ" دەگرن. لە لايەکی ترەوەش، ڕووخـان و نەمانی ميـرنشينە سەربەخـۆيەکانی کوردسـتـان، جۆرە بۆشـايييەکی دەسـەڵاتی لە ناو خەڵکيدا دروست کرد؛ گەل پێويستی بە سەرکردە و خـاوەن قسە و ڕێنيشاندەر هەيە؛ ميرەکان نەمان، مـەيدان چۆڵ بوو. خـەڵک پەنـای بردە بەر شـێـخـەکـانی قادری و نەقشبەندی بۆ ئەوەی لە لايەکـەوە جـێی ئەوانـە بگرنەوە لـە لايەکی دیکەشــەوە لە ئەنجـامـی پێـوەندييـەکی سـايکۆلۆژييـەوە، وەک هەر ئاين و ڕێبـازێکی سـيـاسی، ئارامـيـيـەکی هـزرييـان بە لايەنگرەکانيان بەخشی.

ئەڵقـەی زيکری نەقـشـبـەندی کە بـە "خـەتمـە"ش دەناسـرێ، زۆر لە هـی قـادرييـان جـودايە. زيکر، زاراوەيەکی عـەرەبييـە و واتای ناوهێنان، يان يادکردنەوە دەبەخـشـێ. زيکری نەقشبـەندييەکان بێدەنگ دەکرێ، دەڵێن ئەمە شێوەی زيکری يەکەم خـەليفەی ئيسلام "أبوبکر" بووە و ڕێگە نادا پەيڕەوکـارانی حـاڵ بگرن و زەرگ و تير و شيـر لە جەستەی خۆيان بدەن. نەقشبەندييەکان حەفتانە يەک يان دوو ئەڵقەی زيکريان دەبێ و لە "خـانەقـا" يان لە "تەکيـە"دا دەکرێ. جـاری واش دەبێ لە ماڵی خودی شێخ زيکر دەکـرێ. بۆ زيکرکـردن شێخ يـان يەک لە خـەليـفـەکـانی لە چەقی ژوور دادەنيـشی و موريد و دەروێشـەکانيش دەوری دەدەن. جاری وا هـەيە، مەلاش ئامادە دەبێ و هـەندێ ئايەتی قـورئان و گـوتەی پێـغـەمـبـەر(دخ) دەخـوێنێـتـەوە و ڕاڤـەيان دەکـا. ناوە ناوە موريدەکان بێدەنگ دەبن و لە بن لێوان نزا دەکەن و لە خـوا دەپاڕێنەوە و ناوەناوەش

شێخ بەدەنگی بەرز ناوی خودا دێنی و سەڵاوات لە پێغەمبەر دەدا. لە ماوەی بێدەنگیدا موریدەکان بیر لە مردن دەکەنەوە و هەموو دنیا بە شتێکی بێ بایەخی لە ناو چوو دێننە بەرچاویان، ڕەخنەگرانی ڕێبازی شێخایەتی دەڵێن ئەمە تەنیا بۆ ئەوەیە تا خەو لە میللەت بخەن و ژیانیان وا بۆ بنوێنن کە ئەوە ناهێنێ مرۆڤ خۆی بۆ ماندوو بکا و ئەوەی خودا نەیکردبێتە نسیب نابی و ئایەتی "وأن لیس للإنسان إلا ما سعی وأن سعیه سوف یری" لە بیری ببەنەوە و نەهێڵن لە پێناو مافەکانیدا کۆشش بکا و بەرانبەر دەسەڵاتدارە خراپەکانی بوەستێ. بۆ ئەوەی بزانێ دەروێشەکان چەند بە قووڵی دەچنە ناو زیکرەوە، دەبێ ئاگاداری ئەو هەناسە قووڵانە بێ کە دەیانکێشن، چەند هەناسەکە بەهێزتر بێ، هێندە دەروێش پتر نوقومی خەیاڵ بووە. پاشان گەورەکەیان، جا چ مەلا بێ یان خەلیفە بێ، جارِدەدا کە کاتی پێوەندیی بە شێخ کردنە و لە ڕێگەی ئەویشەوەڕا دەتوانن پێوەندی بە پێغەمبەرەوە بکەن. ئینجا هەموو بێدەنگ دەبن، پاشان یەکەمجار شادە "الشهادە" دێنن؛ شادە لە بنەڕەتدا وشەی "شەهادە"یە، واتا گەواهی دانە، واتە بە ڕاست ناسینە و دەڵێن "لا إله إلا الله"؛ واتا "لە خوا بترازێ هیچ خودایەکی دیکە نییە". پاشان باسی باپیرەکانی شێخ دەکەن و ئەوەی ناویان بیستبێ هەموویان ناو دێنن و زیکرەکە دەبڕنەوە.

هەردوو زاراوەی "دەروێش"و "سۆفی" لە بنەڕەتدا یەک واتایان هەیە، بەڵام پەیڕەوکارانی ڕێبازی نەقشبەندی بە سۆفی دەناسرێن و لە دڵیان گران دەبێ ئەگەر یەکێک پێیان بڵێ دەروێش.

چونکە نەوەکانی مەولانا خالد دیار نینە و نەقشبەندییەکان ئێستا سەرۆکێکی دیاریان نییە، بۆیە تەریقەتەکەیان خەریکە پەراوێز دەبێ. لە کاتێکدا موریدەکانی تەریقەت بە شێوەیەکی دیار لە ١٩٢٥، بەشداریی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانیان، لە کوردستانی باکوردا، کرد، دەسەڵاتدارانی تورک بە پەلە هەموو تەکیە و حوجرەکانی فەقێیانیان لە کوردستانی باکور داخست و سۆفی و دەروێشیان بە یاخی ناساند و دەروێشاتییان کردە کارێکی دژە یاسا و تەریقەتی نەقشبەندیشیان قەدەغە کرد.

هەرچەندە ژمارەیان کەم بووەوە، بەڵام بنبڕ نەبوون و بە نهێنی کاری ئاسایی خۆیان کرد. تا ١٩٥٠، کە پارتی دیموکراتی عدنان مەندەرەس هاتە سەر حوکم و نەختێک دەروازەی بۆ دیموکراتییەکان والا کرد و ڕێگەی دا چالاکییە ئایینییەکان تا ڕادەیەک پیادە بکرێن.

لە ١٩٩٠ـەکانیش، دەگوترا سەرۆک تورگوت ئوزاڵ هاوسۆزییەکی ڕێبازی نەقشبەندی هەبووە و براکەشی، کۆرکات، موریدێکی ئەو تەریقەتە بووە. ئێستاش دەسەڵاتدارانی تورک نەرمی لەگەڵ ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستانی باکور، دەنوێنن، هەندێک دەڵێن ئەمەشیان سیاسەتە، ئامانجیان بەهێزکردنی تەریقەتی نەقشبەندی نییە، بەڵکو دەیانەوێ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە تورکیا بێ هێز بکەن.

**نەهری.** بەرەبابی نەهری، سەیدن و دەڵێن بەڕەچەڵەک نەوەی پێغەمبەرن. سەیدەکانی نەهری، بنەماڵەیەکی بەهێزی شێخەکانی ناوچەی هەکاری کوردستانی باکوربوون و لە نزیک سنوورەکانی عێراق و ئێران نیشتەجێبوون. بۆ خۆشیان دەڵێن لە نەوەکانی شێخ عەبدولقادر "غەوس"ی گەیلانینە؛ بەمجۆرە سەرجەلەی شێخەکانی تەریقەتی قادرینە. هەندێک بەو بەرەبابەیان دەگوت گەیلانیزادە. نەهرییەکان هەر لە سەر ڕێبازی قادری مانەوە تا لە ١٨١١، مەولانا خالد ڕێبازەکەی پێیان گۆڕی و هەمووی بۆ سەر ڕێبازی نەقشبەندی هێنان.

لە ١٨٤٠ـەکان، سەید تەهای نەهریی یەکەم ڕێزێکی تایبەتی لە ناو ئیمارەتی بۆتان پەیدا کرد و تەریقەتی بڵاو کردەوە. لە ١٨٤٧، میرە هێزدارەکەی بۆتان، میر بەدرخان بەگ، لە بەرانبەری عوسمانییەکاندا بەزی، سەید تەها ناچار بوو لە دەستی تورکەکان ڕا بکا و لە نەهری خۆی گرتەوە؛ نەهری پایەتەختی دوایین میری شەمدینان بوو. تورک ناوی شەمدینانیان تەتریک کردووە و (شەمدینلی)ی پێ دەڵێن. نەهری شادێی ناوچەی شەمدینان بوو. بۆیە ئەو سەیدانە بە یەکجارەکی لەو گوندە نیشتەجێبوون. لەو دەمی شەمدینان هێشتا میرنشینێکی چکۆلە بوو. بۆ ماوەیەک شێخەکان بە دوو شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ میردا کرد، تا لە کۆتاییدا کورسییەکەیان لەبن دەرکێشا و لە شوێنی ئەو دانیشتن و لەو ناوە وەک دەسەڵاتی

تاک مانەوە. یەکەم سەید تەهای نەهری، هەر لەو سەروبەندەدا بوو کە تاجدینی بۆ ناو تەریقەتی نەقشبەندی هێنا و پاشان ڕەوانی ناوچەی بارزانی کرد و لەوێ تاجدین، بنەماڵەی شێخی بارزانی دامەزراند. تاجدین هەندێ جار بە عەبدولڕەحمان ناوی دێ.

شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە دوای باوکی هەردوو دەسەڵاتی دینی و دنیایی وەرگرت و بەم چەشنە هەر خۆی بەهێزترین سەرکردەی کوردی سەدەی ١٩م بوو. لە ١٨٨٠ شۆڕشە ناودارەکەی خۆی بەرپا کرد، بەڵام لە کۆتاییدا شۆڕشەکەی سەرکوت کرا. زۆر کەس ئەو شۆڕشەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بە شۆڕشێکی نەتەوەپەرستیی کوردایەتی دەزانن. شێخ عوبەیدوڵڵا دوو کوڕی هەبوو؛ محەمەد سدیق و عەبدولقادر، هەردووکیان سەرکردەی کوردی خاوەن دەسەڵات و کاریگەربوون. محەمەد سدیق لە سەرەتای سەدەی ٢٠ـەم لە نەهری دەژیا و بە خودان دەسەڵاتترین شێخی ناوەڕاستی کوردستان دەناسرا.

محەمەد سدیق لە ١٩١١دا مرد و لە دوای خۆی برا بچووکی وەک کەسایەتییەکی گرینگ لە ئاراستەکردنی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی ناوی دەرکرد. عەبدولقادر بە شێوەیەکی کارامە لە هەر هەموو چالاکییەکانی کوردایەتی لە ئەستەمبوڵ بەشداری کرد و ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی عوسمانییەکان و سەرۆکی ئەنجوومەنی دەوڵەتیش بوو. هەرچەندە ڕەنگە عەبدولقادر لە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥، بەشداریی نەکردبوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی تورک دەستگیریان کرد و پاشان لە سێدارەیان دا.

لە ١٩٢٠ـەکانیش، سەید تەهای نەهریی دووەم کە کوڕی محەمەد سدیق و نەوەی شێخ عوبەیدوڵڵا نەهری بوو ڕۆڵێکی گرینگی لە سیاسەتدا گێڕا. پێوەندیی بە شۆڕشی سمایل ئاغای سمکۆ لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا کرد و لە ١٩٢٢دا دەستی پێ کرد دژی ویستی تورکەکان بۆ چوونە ناو خاکی باشووری کوردستان لەگەڵ بەریتانییەکان کاری کرد. بەریتانییەکان لە کۆتاییدا بە بەڕێوەبەریی ناحیەی ڕەواندز دایان مەزراند، ئەویش لەبەرئەوە بوو کە هۆزەکانی کورد ڕێزێکی تایبەتییان لێی دەنا. لە ١٩٣٢، بە بانگهێشتی ڕەزاشای ئێران، سەردانێکی ئەو وڵاتەی کرد و لەوێ

ژارخواردوو کرا و کوژرا. سەید تەها نەهریی دووەم، دوو کوڕی هەبوو؛ عەبدوڵلا ئەفندی و محەمەد سدیق "شێخ پوشۆ"، خەڵک ڕێزیان لێ دەگرتن، بەڵام هیچ کامێکیان نەبووە شێخ.

**نەوت - نەفت (ئۆیل).** کوردستان بڕێک لە گەورەترین گەنجینەی نەوتی لە جیهان تێدایە. کەرکووک کە بۆ ماوەیەکی درێژ هۆی ناکۆکی و مشتومڕی نێوان کورد و حکوومەتی بەغداد بووە، باشترین چاڵەکانی بەرهەمی نەوتییان تێدایە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە دوژمنانی کورد، سەرکردەکانی کورد بەوە تۆمەتبار دەکەن کە لە پێناوی ئەو نەوتەیە ئاوا لەسەر وەرگرتنەوەی کەرکووک و هێنانەوەی بۆ سەر هەرێمی کوردستان، مکوڕن. پێشەوا مەلا مستەفا بارزانی هەوڵی دا وڵاتە یەکگرتووەکان لەم بابەتەوە پشتیوانی لێ بکا.

بۆڕییەکی ستراتیژی لە کەرکووکەوەڕا، نەوت بۆ بەندەری جیهانی تورکی دەبا. ئەو بۆڕییە بە کوردستانی باکور و بەناو کورداندا تێدەپەڕێ، بەڵام بگرە زیانی بۆیان هەیە نەک قازانج. بۆڕییەکە بۆ ماوەیەکی کورت بە نێو هەرێمی کوردستانی باشووریشدا تێدەپەڕێ. ئەو ١٣ لە سەدەی کە لە داهاتی نەوت، بە پێی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی ناسراو بە نەوت بە خۆراک لە دوای ١٩٩٦، بۆ کوردستان دەهات، هاودەم لەگەڵ داهاتەکانی گومرگی سەر سنوورەکانی هەرێمی کوردستان، بنەمای بووژانەوەیەکی گەورەیان لە ناو ئەم هەرێمەدا دروست کرد.

ئەو بڕە کەمە ئۆیلەی تورکیا دەری دەکا لە باکوری کوردستانە، لە نزیکی شاری باتمان دەردەچێ. دوای دۆزینەوەی، بڕێکی زۆری نەوت لە ناوچەی رومەیلە، ئێستا چاڵەکانی نەوتی کەرکووک بایەخی وەک جارانیان بۆ عێراق نەماوە.

لە دوای ئازادیی عێراق لە ٢٠٠٣؛ حکوومەتی عێراق و حکوومەتی هەرێمی کوردستان خەریکن یاسایەکی نەوت دادەڕێژن. بەڵام دەسەڵاتدارە عەرەبەکانی بەغداد، ئەگەر فشاری دەرەکییان لەسەر نەبێ، پێ ناچێ بە ئاسانی نە هیچ شتێک بۆ کورد بسەلمێنن و نە هیچ ڕیزێکیش لە داخوازییەکانی بگرن.

**نەورۆز.** سەری ساڵی تازەی کوردییە و لە ٢١ی ئاداری هەر ساڵ و لەگەڵ هاتنی

بەهار کورد بە ئاگرکردنەوە، ئاهەنگی نەورۆز بە خۆشی دەست پێ دەکەن. نەورۆز گرینگترین جەژنی نەتەوەییی کوردە؛ چونکە نەورۆز هێمای ئازادیی گەلی کوردە و ئێستاش کوردپەروەرەکان نەورۆز بە گرینگترین جەژنی کورد دەناسن. پارتی کرێکارانی کوردستان، لەمیانی شۆڕشە درێژخایەنەکەیدا، فرە جار هێرشەکانی خۆی بۆسەر لەشکری تورکان، لەگەڵ هاتنی نەورۆز دەست پێ دەکردەوە. دەوڵەتی تورک لە ۱۹۹۵و لە هەنگاوێکی چاوەڕوان نەکراوی ئەنتیکەدا، جاڕی دا کە بە ڕاستی نەورۆز (نەڤرۆز) جەژنی تورکان بووە نەک هی کوردان و یادی ئەو ڕۆژە دەکاتەوە کە بۆ یەکەم جار تورکەکان مەفتەنی خۆیانیان لە ئاسیا "ئەرگەنەکۆن" بەجێ هێشت و پەلاماری وڵاتەکانی تریان دا.

کورد بۆنەی نەورۆز فرە بەرز ڕادەگرن و هەندێ جار بۆ ماوەی یەک حەفتە ئاهەنگی پێوە دەگێڕن. خزمان و برادەران بە تێکڕای خانەوادە و دۆست و برادەرەوە دەچنە دەرەوە و لەو بەهارەدا سەیران دەکەن و چێشت و خۆراکی جۆراوجۆر لەگەڵ خۆیان دەبەن. شایی و هەڵپەڕکێ دەکەن، دەهۆڵ و زوڕنا دەژەنن، کۆنسێرت و بەزم دەگێڕن.

هەندێ لە گەنجەکانی کورد بە نیازی ئەوەی مرازەکانیان بێتە دی، بەسەر ئاگری نەورۆزدا باز دەدەن. هەندێ لە مێژووناس و توێژەرەوە لێزانەکان دەڵێن کە ڕەنگە ئاگرکردنەوەی نەورۆز پێوەندییەکی بە دینی زەردەشتییەوە هەبێ. بەڵام هەندێ لە شارەزایانی مێژوو، بابەتی ئاگرکردنەوەکە بە ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر و داهاکەوە دەبەستنەوە. بە گوێرەی ئەو ئەفسانەیە، داهاک (زوحاک) ڕۆژانە مێشکی دوو گەنجی دەکردە خۆراکی ئەو دوو حەزیایەی کە لەسەر هەردوو شانی شین بووبوون. کاوە کوشتی و بە کوشتنی داهاکیش، زۆر لە لاوانی کورد لە دەرهێنانی مێشکیان ڕزگاریان بوو، بۆیە ئاهەنگ دەگێڕن.

هەندێ لە مێژوونووسان بەگژی ئەم ئەفسانەیدا دەچن و دەڵێن کاوە فارس بووە و داهاک کورد بووە و پاشایەکی زۆر دادپەروەر بووە و کاوە کوشتوویەتی بۆ ئەوەی حوکمی وڵات بۆ فارسەکان بگێڕێتەوە. بەڵگەشیان لەسەر ئەم قسەیە ئەوەیە کە پاش کوشتنی داهاک، کاوە دەسەڵاتی وڵاتەکەی بە ئەردەشێر سپارد، کە یەک لە نەوەکانی

کـۆروشی گـەورەی فـارس بوو. بەمـجـۆرە فـەرمـانداریی لە کـورد سـەندەوە و بە فارسەکانی داوە. (ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆرتر هەیە.)

بە هۆی پارچەبوونی کـوردسـتـان، کـورد کـەوتووەتە بەردەسـتی چەند ڕژێمـێکی جـیاوازەوە و هەر یەک لەوانە جۆرە کـالیندەرێکی جودا لەوانی دیکە بەکـار دێنی و ئەوە سەری لە کورد شێواندووە؛ چونکە کورد ناچارە هەندێ جار تەقویمی ئیسلامی و جارێکی تر کالیندەری گریگۆری و یان ڕۆزنـامەی ئێرانی (ڕۆژهەڵاتی) بەکار بێنێ. لە کاتێکدا کە ڕۆژمێری کوردی کالیندەرێکی رۆژییە و ساڵ دەکاتە ٣٦٥ ڕۆژ و هەر چوار ساڵ جارێکیش ساڵبازێکی هەیە کە ٣٦٦ ڕۆژە. نەورۆز سەرە ساڵی کوردییە. سـاڵی ئێرانییش هاوشێوەی سـاڵی کوردییە تەنیا ناوی مانگەکانی لە هی کوردی جودایە. ڕۆژنامـەی ئێرانی لەگەڵ ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە ٦١٢ پ.ز. دەست پێ دەکا، کـەچی ڕۆژمـێری لە ٣٨٠ی زاینەوە دەست پێ دەکـا. ئەوەش لەگەڵ کـاتی ڕووخـانی دەوڵەتی کەیکاوسـی کوردی دەست پێدەکا، ئەوەی کە نەزاندراوە لە کوێوەڕا هاتووە حەوت ساڵە کە خراوەتە سەری؛ بەم پێیە ساڵی کوردی لە ٢٠٠٧، کە ئەم کتێبەم تێیدا وەرگێڕدرا دەبێتە ١٦٢٠ی کوردی.

**نەوشیروان مستەفا ئەمین (١٩٤٣-    )**. چەندەها ساڵ گەورە یاریدەدەری جەلال تاڵەبانیی سەرکردەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووە. «ی. ن. ک» لە ١٩٧٥ لە یەکگرتنی کـۆمـەڵە مـارکـسـیـیـەکـەی نەوشـیـروان و بزووتنەوەی سـۆشـیـالیـسـتی کوردسـتـانی عەلی عـەسکەری پێک هـاتووە. لە ٢٠٠٧، نـەوشـیروان سـەرکـردایەتیی باڵی ڕیفۆرمـخـوازانی ناو یەکێتی کرد و لە هەڵبژاردنەکان دەنگی نەهێنا و پاشان دەستی لە کاری حزبی کشـاندەوە و خـەریکی بەڕێوەبردنی دەزگایەکی ڕاگـەیاندن بوو. لە کـــۆتـاییی ئـایاری ٢٠٠٧، وتـارێکی بڵاو کـــردەوە کـــە ڕەخنـەی لە پەرلەمـانتـارەکانی پەرلەمـانی کـوردسـتـان گرت و ڕەخنـەکـەشی کـاردانەوەی زۆری میللی و دەزگای یاسادانانی لێ کەوتەوە.

دوو ڕەخنەی گەورە ئاراستەی نەوشیروان مستەفا دەکرێ؛ یەکەمیان، جیاوازی لە نێوان هاووڵاتییانی کورد دەکا و سلێمانی وەپێش هەولێر و دهۆک و کەرکووک دەخا؛ دووەمـیش؛ ئەو قـسـە بوو کـە لە سـاڵانی شـەڕی ناوخـۆی نێـوان پارتی دیموکـراتی

کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ۱۹۹٤-۱۹۹۸، کردی. وەبوو هێزەکانی «ی. ن. ک» تەلاری پەرلەمانی کوردستانیان گرت، کە پێشتر خەڵک بە شوێنێکی پیرۆز و ماڵی هەموو کوردی دەناسی. جا ڕۆژنامەنووسان ڕەخنەیان لەو کردەوە سەربازییەی یەکێتی گرت و ڕووی ڕەخنەیان لە نەوشیروان کرد. نەوشیروانیش وەڵامێکی گرانی دانەوە و گوتی: "هەولێر کوێی پیرۆزە تا شەڕی لێ نەکەین؟" ئەم قسەیە وەک خەنجەرێک بوو نەوشیروان مێژووی خۆی پێ سەربڕی و هەر ئەوەبوو وای کرد نەوشیروان مستەفا ئەمین، لەو هەڵبژاردنانەی ۲۰۰۷، لە هەولێر هیچ دەنگ نەهێنێ.

**نوورجولوک.** بزووتنەوەی پەیڕەوکارانی ڕووناهی لە ئەنجامی گوتارە ئاینییەکانی سەعیدی نوورسی (۱۸۷۳-۱۹٦۰) لە تورکیا سەری هەڵدا. سەعیدی نوورسی مەلایەکی کورد بوو لە باکوری کوردستان لە دایک بووە. سەرجەم نووسینەکانی سەعیدی نوورسی بە ناوی (ڕسالەی نور کوللیاتی) واتە (پەیامی ڕووناهی) ناسراوە. زۆربەی ئەو پەیامانە لەسەر ئینتەرنێت لە ماڵپەڕی www. nesil. com. tr هەیە. بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی لە نووسینەکانی بە شێوەیەکی پسپۆڕانە قورئان شی دەکاتەوە و لەگەڵ زانستە تازەکان بەراوردیان دەکا و بە ئیسلامییەکی چاکساز ناوی دەرکردووە. بۆیە دەگوترێ کە نورجولوک پەردە لەسەر زانستەکان هەڵدەداتەوە بەو نیازەی وا بکا کە بە شێوەیەکی باشتر لە قورئان تێ بگەین. سەعید نوورسی زۆربەی شیکردنەوەکانی بە پێی خەونەکانی خۆی ڕاڤە کردووە و بە زمانێکی قووڵی تورکیی عوسمانیی سەدەی ۱۹م نووسیتییەوە بۆیە ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەچاکی لە نووسینەکانی دەگەن کەمە.

پەیامی ڕووناهی، دەیەوێ کۆمەڵ بگۆڕێ. بۆ ئەم گۆڕانەش، پشت بە هزری ئاینی دەبەستی و ڕێگەیەکی ئاسان بەو کەسانە نیشان دەدا بۆ ئەوەی بە دڵنیاییەوە لە کۆمەڵگەیەکی دینییەوە بەرەو کۆمەڵگەیەکی نەتەوەیی عیلمانی بچن. ئەو هزر و کردەوە ئیسلامییانەی کە لە ناو هاوولاتییاندا باوە بە شێوەیەک تازە دەکاتەوە کە ستراتیژییەکی پراکتیکی وایان بۆ دەستنیشان دەکا تا بتوانن بە هۆیەوە بیری تازە و هزری هاوچەرخ پەسند بکەن. سەعید نوورسی هەوڵی داوە گرژی لە نێوان ویستی

مرۆڤ و سەرچاوەکاندا نەهێڵێ. بۆ ئەم مەبەستەش هەستا پەنای وەبەر زاتی خودا برد و هزری ئیسلامەتیی بووژاندەوە. نوورسی مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕێبازەی ئەو هەڵی بژاردووە، سەرچاوەی گەلێ ململانی و شەڕ و کوشتار چک دەکا.

بۆ ئەوەی دەرئەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکان لەگەڵ هزری ئیسلام بە یەک بگەیەنێ، نوورجولوک باسی ئازادی دەکا و دەیباتەوە سەر ئیسلام و دەڵێ ئازادی بەشێکی باوەڕە؛ واتا بەشێکە لە ئیمانی مرۆڤی موسڵمان. بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی، هەژاری و نەزانی و دوژمنداری بە گرفتی کۆمەڵگەی موسڵمانان زانیوە. نوورسی پەنای بۆ هزری ئیسلامی برد، بۆ ئەوەی بتوانێ لەوێ زاراوە بۆ بە دەستووریکردن و سەربەستی و هەڵبژاردن بدۆزێتەوە. مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە ئیسلام و دیموکراسی دژی یەکتری نینە، بەڵکوو لە ڕاستیدا دیموکراسی و ئازادی دوو مەرجی پێویستن بۆ ئەوەی دادپەروەری لە ناو کۆمەڵدا جێگیر ببێ. نوورسی لەمەش پتر ڕۆیشت و داوای لە کوردی کوردستانی باکور کرد تا ناکۆکییە خێڵەکی و دوژمنداریەکانیان ببڕنەوە بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی یەک بگرن. سەعیدی نوورسی لە یەکێک لە نووسینە زووەکانی، هۆی کزبوونی ئیسلامی لە ناو کۆمەڵدا دەستنیشان کرد و نووسیی:- بە هۆی نەمانی ڕاستی لە ژیانی کۆمەڵگەی سیاسی (سۆشیۆپۆلیتکس) و زۆربوونی دوژمنداری و بەرپابوونی دیکتاتۆری و خۆبەزلزانینەوەیە کە ئیسلام خەریکە کز دەبێ. نوورسی لە دوا قۆناغدا بەرانبەر تەریقەتی نەقشبەندی ڕاوەستا و گوتی ئەم ڕێبازە چیتر سوودی بۆ ئەم سەردەمە نەماوە.

پەیامی ڕووناهی لە تورکیا بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاو بووەوە و لە ناو هەردوو نەژادی کورد و تورک ڕەگی داکوتا و لە هەموو بزووتنەوەیەکی دیکەی ئاینی، لە سەرتاسەری وڵات، کاریگەرتر بوو. هەر تاکەکەس و چینێک بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆی پەیڕەوی ئەو ڕێبازە دەکات. چونکە ئەم ڕێبازە ڕوحییە چەندین فاکتەری نامۆی تێدا هەیە بۆیە خەڵک بۆ خۆی ڕادەکێشێ. بۆ نموونە؛ زانا ئیسلامییەکان بۆ ئەوە بە دوایدا هەودالن چونکە زانستی هاوچەرخ پەسند دەکا؛ کوردە وڵاتپارێزەکانیش بۆ ئەوە وەری دەگرن، چونکە سەعید نوورسی کوردە و کولتووری خۆیانی هەبووە و

پێشتریش پشتیوانی له بزووتنەوەی کوردایەتی کردووه. خۆ سێکولارەکانیش ڕێز لەو بزووتنەوەیه دەگرن، چونکه بەرهەڵستی حوکمی لەشکری تورکی کردووه کە چەند جارێک پەلاماری دەسەڵاتی داوه و پاوانی کردووه.

دەسەڵاتدارانی تورک پیلانیان بۆ ئەو بزووتنەوەش داناوه و تاوانی هەوڵی پشتەوشارکردنەوەی عیلمانییەتیان له تورکیا داوەته پاڵی و ئەمەش ئەوه دەگەیەنێ ئەو دەسەڵاتە ناوەندییه تورکپەرستەی له تورکیا فەرمان دەگێڕێ، وەک چۆن قایل نییه گەلی کورد قبووڵ بکا بە هەمان شێوەش هەڕەشه له گەشەکردنی کۆمەڵگەیەکی سیڤیلی تورکیش دەکات.

**نێچیرڤان ئیدریس بارزانی (١٩٦٦-      )**. نەوەی پێشەوای کورد، مەلا مستەفا بارزانی و کوڕی سەرکردەی لێهاتووی کورد، ئیدریس بارزانییه و برازای سەرۆکی کوردستان، مەسعوود بارزانییه. نێچیرڤان ئیدریس بارزانی زوو توانی پێ بگا، تا ئەو ڕادەیەی بە پێی بۆچوونی هەندێک پێ دەچێ ئومێدی ئایندەی ڕووناکی کورد بێ. نێچیرڤان بارزانی چەندین پۆستی سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی وەرگرتووه. لەوانه سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی «پ. د. ک» (پاراستن) بووه و جێگری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی وەرگرتووه و ئێستاش، له هەولێر، سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی یەکگرتووی کوردستانه. نێچیرڤان بارزانی له ٢٠٠٧، پەیمانی تازه کردەوه کە دەبێ تیرۆر له کوردستان بنبڕ بکا. ئەو حکوومەتەی کە ئەو سەرۆکایەتی دەکا زۆر هانی کەرتی تایبەتی دەدا و خەریکه چینی ناڤەند له کوردستان پەیدا دەکا؛ چونکه لەو باوەڕەدایه کە کەرتی تایبەت بە چاکترین شێوه ئابووریی وڵات بەڕێوه دەبا و دەتوانێ گەشه بە هەموو لایەنەکانی ژیان بکا.

## هـ

**هادەپ "هاڵکن دیموکراسی پارتیسی"**. پارتی دیموکراتی گەل لە ١٩٩٤، لە شێوەی پارتێکی یاسایی، لە شوێن پارتە قاچاغکراوەکانی هاڵکن ئەمەک پارتیسی و دیموکراتیک پارتیسی، لە تورکیا، دامەزرا. هەرچەندە هادەپ ژمارەیەکی زۆری دەنگەکانی وەرگرت، بەڵام هێشتا لەو ڕێژەی ١٠ لە سەدی نزیک نەکەوتەوە کە پێویستە هەر پارتێک هەیبێ، بۆ ئەوەی کورسیی پەرلەمانی بەدەست بێنێ. ئەمەش لە لایەکەوە لە ئەنجامی ئەو لاسارییە بوو کە میری لەگەڵ کوردانی کرد و لە لای دووەمی بەهۆی ئەو داخوازییە بوو کە ئیسلامییەکان کردیان و هۆی سێیەمیش ئەوەبوو کە کوردەکانی ڕۆژئاوای تورکیا نەیانتوانی دەنگ بۆ پارتە کوردییەکە بدەن.

لە هەڵبژاردنە نیشتمانییەکەی ١٩٩٥، هادەپ ڕێژەی ٤,١٧ لە سەدی دەنگەکانی بەدەست هێنا و لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٩شدا، تەنیا ٤,٧٥ لە سەدی دەنگی پێ درا. لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٩، هادەپ توانی پتر لە ٣٠ سەرۆک شارەوانیی شارەکانی باشووری ڕۆژهەڵات هەڵبژێرێ، بە شاری دیاربەکریشەوە. لە دواترین هەڵبژاردنە نیشتمانییەکانی کە لە ٢٠٠٢دا کرا، هادەپ هاوپەیمانی لەگەڵ دوو پارتی بچووکی چەپڕەو کرد، بۆ ئەوەی بەر لە حکوومەت بگرێ و نەهێڵێ قەدەغەی بکا و ڕێگەی بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکانی لێ دابخا. ئەم هاوپەیمانییە ناوی بووە دیموکراتیک هاڵکن پارتیسی (داهەپ) و توانی ٦,٢٢ لە سەدی دەنگەکان بەدەست بێنێ.

زۆر لە تورکەکان هادەپ بە ڕووەکەی تری پارتی کرێکارانی کوردستان دەزانن. بۆیە هادەپ هەراسان کرا و سەرکردەکانی ناوە ناوە بەند دەکران. موراد بوزلاک، کە یەکێک لە سەرانی ئەو پارتە سیاسییەیە، بە هۆی چالاکییە سیاسییەکانییەوە، ماوەی سێ ساڵی لە زیندان بەسەر برد. لە ئاداری ٢٠٠٣، دادگای دەستووری تورکیا بۆ دواجار ئەم پارتەشی قەدەغە کرد.

**هاشمییەکان**. بنەماڵەیەکی پادشایەتیی عەرەبییە؛ لە شەڕی دووەمی جیهانیدا پشتیوانی بەریتانیای مەزنیان کرد و ئەوانیش پاداشتیان دانەوە و تەختی شاهانەی

چەند وڵاتێکی عەرەبی کە تازە لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی دامەزران، پێیان بەخشین. فەیسەڵی یەکەم بووە مەلیکی عێراق و لەم ڕێگەیەدا کوردی بەبەردەست کەوت. لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨، زەعیم عەبدولکەریم قاسم کودەتایەکی خوێناوی لە دژی بنەماڵەی هاشمی ئەنجام دا و لەسەر تەختی لادان.

**هەباسی مامەند ئاغا (عەباسی مامەند ئاغا).** سەرۆکی خێڵی ئاکۆیە و زەویوزارەکانی لە نێوان ڕانیە و ڕەواندزە. هەرچەندە هەباس ئاغا سەرۆک عەشیرەت بوو و خەمی گەورەی پاراستنی سامان و دەسەڵاتی خۆی بوو، بەڵام لە ١٩٦١ بڕیاری دا دژی عەبدولکەریم قاسمی، پێوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە بکا، کە پێشەوا مەلا مستەفا بارزانی سەرکردەی بوو. هەرچەندە هێزەکانی هەباسی مامەند ئاغای کاریگەرییەکی دیاریان نەبوو، بەڵام لە سەرەتادا، ئەو پشتیوانییە و لەوکاتییدا، تەکانێکی مەعنەویی گەورەی بە شۆڕشی ئەیلوول و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دا. لە ناوەڕاستی ١٩٦٠ـەکاندا، مستەفا بارزانی، بڕیاری دا هەباسی مامەند ئاغای بە سەرۆکی ئەنجوومەنێکی ڕاوێژکاری دابنێ، تا کاروباری کورد بەڕێوە ببا. لە ١٩٩١یش هەباسی مامەندا ئاغای بەناو ساڵ کەوتبوو، جا یەکێک لە یاریدەدەرەکانی هانی دانیشتوانی ڕانیەی دا بۆ ئەوەی دژی دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسیان ڕاپەڕن و لە ئەنجامی ئەو ڕاپەڕینەش بوو کە ناوچەی دژە فڕین دامەزرا و حکوومەتی دیفاکتۆی کوردستان پێک هات و تا ساڵی ٢٠٠٧، وەک دەزگایەکی فەرمی دەستووری هەرێمی کوردستان بەڕێوە دەبا.

**هەپ "هالکن ئەمەک پارتیسی".** لە پایزی ١٩٨٩، لە تورکیا، ژمارەیەک لە ئەندامانی پارتی ئەردال ئینۆنۆ، "سۆشیال دیموکراتیک هالکجی پارتیسی" واتە پارتی گەلی سۆشیال دیموکرات، کە بە ڕەچەڵەک کوردبوون لە پارتەکە قاودران، چونکە ئامادەی کۆنفرانسی "ناسنامەی نەتەوەییی کورد و مافەکانی مرۆڤ" لە پاریس بووبوون. ئەم ئەندامە دەرکراوانەی پارتەکەی ئینۆنۆ بوونە بەردی بناغەی دامەزراندنی هەپ، واتە پارتی کرێکارانی گەل، کە لە ١٩٩٠ دامەزرا و ئەمە یەکەم پارتی کوردیی یاسایی بوو کە لەم سەردەمەدا چەند نوێنەرێکی گەیشتنە پەرلەمانی تورکی.

چونکە نەتوانرا کۆنگرەی دامەزراندنی هەپ لە کاتی پێویستدا بکرێ، بۆ ئەوەی بتوانێ لە ١٩٩١، لە هەڵبژاردنی نیشتمانیدا بەشداری بکا، ناچار ٢٢ ئەندامی هەپ دووبارە پێوەندییان بە پارتی گەلی سۆشیال دیموکرات کردەوە و بۆ پەرلەمانی تازە هەڵبژێردران. لەیلا زانا و خەتیب دیجلە، کە دوو ئەندامی هەپبوون، تورکیایان شڵەژاند کاتێک کە نکووڵییان لە سوێندخواردنی نەریتیی فەرمی بۆ پەرلەمان کرد. لە بری ئەو سوێندە لەیلا زانا دەسرۆکی ڕەنگە کوردییەکانی لە سەرنابوو، جاڕی دا و گوتی: "من ئەو سوێندە بۆ پاراستنی برایەتی تورکی و کوردی دەخۆم."

زۆربەی تورکەکان هەپ بە ڕووخساری دیاری پارتی کرێکارانی کوردستان دەزانن. هەپ لە ١٩٩٣دا قاچاغ کرا، بەڵام "دیموکراتیک پارتیسی" (دەپ) لە شوێنی ئەو دامەزرا و ئەمەشیان لە ١٩٩٤دا یاساغ بوو؛ قەدەغەکردنەکەشی ڕێی لە دامەزراندنی "هاڵکن دیموکراتیک پارتیسی" نەگرت، ئەم پارتە تا ٢٠٠٣ هەر چالاک بوو. محەمەد سنجار، ئەندامی پێشووی هەپ و ئەندامی پەرلەمان لە لیستی دەپ، لە سێپتێمبەری ١٩٩٣دا کوژرا، ڕەنگە بە دەستی ئەفسەرانی ئاسایشی دەوڵەت کوژرابێ. لەیلا زانا و حەوت لە ئەندامانی جێگری دەپ کە لە جیی هەپ دامەزرا بوو، لە ئاداری ١٩٩٤ بوو کە پەرژینی پەرلەمانییان لێ لادراو زیندانی کران و کێشەی لەیلا زانا تا سەرەتای ٢٠٠٣، وەک کێشەیەکی ناوداری نێونەتەوەیی ماوە.

**هەرکی**. ئەو خێڵە سەرەکییە کوردییەیە کە بە درێژاییی مێژوو ڕەوەند بووینە و بە خۆ و بە مەڕ و ماڵاتیانەوە هەردوو دیوی سنووری نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسییان کردووە و ناوبانگیان بە پەلاماردان و تاڵانکردن دەرکردووە. بە پێی بەڵگەنامە کۆنە نەستوورییەکان، هەرکی ڕۆژێک لە ڕۆژان فەلە بووینە و تا ئێستاش بە مەبەستی پاراستنیان سەری یەکێک لە پیاوچاکەکانی سانت جۆرجیسی کریستیانەکانی ڕۆژهەلاتیان لە سندووقێکدا هەڵگرتووە.

لە مێژووەکی نزیکتریشدا، هەرکی بە جاش دەژمێردران، چونکە بەرهەڵستی شۆڕشی مەلا مستەفا بارزانییان دەکرد. لە ١٩٩٤، بەشێکی هەرکییەکان بوونە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە باکوری عێراق، چونکە ئەو چینە لەسەر کێشەی زەویوزار، لایەنگری

خۆیانیان گۆڕی و لە سەنگەری پارتی دیموکراتی کوردستان دەرچوون و پێوەندییان بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد. لە ئاداری ٢٠٠٣، پێش ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان پەلاماری عێراق بدا، جەوهەر هەرکی کە هەمیشە جاش بووە، هات و پێوەندی بە حکوومەتی هەرێمی کوردستانەوە کرد.

**هەڤەرکان.** کۆنفیدراسیۆنێکی گەورە بوو کە لە پتر لە ٢٠ هۆز پێک هاتبوو، ئەو خێڵانە بە فەرمی سەر بە میرنشینی بۆتانبوون تا ١٨٤٧، کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی میرنشینەکەی داگیر کرد. ئینجا ناکۆکی لە پێناو سەرۆکایەتی دەستی پێ کرد.

کە سەرکردەی ئەو میرنشینە لە ١٩١٩دا کوژرا، ئیتر میرنشینەکەش لەباریەک ترازا. پاشان حاجۆ وەک سەرکردەیەکی نوێ هەستا. لە ئاداری ١٩٢٦ بوو، حاجۆ ناوەندی پۆلیس و خاڵەکانی سنووری تورکیای گرت. بەڵام سوپای تورکیا ناچاریان کرد بەرەو سووریا بکشێتەوە. لەوێ حاجۆ بووە یەکێک لە سەرە ناودارەکانی خویبوون. خویبوون زۆربەی پلانەکانی شۆڕشی ئاراراتی ١٩٢٧-١٩٣٠ دانابوو. لەم سەردەمەدا، سەرکردایەتی هەڤەرکان ڕێک نەخراوە و لە بەرەبابێکەوە بۆ بنەماڵەیەکی دیکە دەچێ.

**هەقە.** دەستەیەکی داهێنەری نەقشبەندیی کوردستانی عێراقێن، شێخ عەبدولکەریمی سەرگەڵوو لە سەرەتای سەدەی ٢٠ـەم ئەم ڕێبازەی داهێنا. بە پێی باوەڕی ئەوان هەموو کەسێک بە یەکسانی هاوپشکی هەموو شتێک بوو کە لە نێوانیاندا هەبوو، ئەم هاوبەشییە یەکسانییە تەنانەت ژنەکانیشیانی دەگرتەوە. ژن و پیاو بەیەکەوە بیندراون لە ناو گۆماوی مزگەوتی گوندی وێکڕا مەلەوانییان کردووە. لەمەش دەرچێ، سەگیشیان لەگەڵ خۆیان بردووەتە نێو حەوزەکەوە! لە ١٩٤٤، بەریتانییەکان مامە ڕەزای سەرۆکی نوێی ئەم چینەیان گرت و ڕەوانی بانشگەی باشووری عێراقیان کرد. بەڵام پاشان ڕێگەی درا بێتەوە سلێمانی و لەوێ ماڵزیندانی کرا. تا ساڵی ١٩٧٥یش ئەم چینە هەر مابوو، لەو دەمی سەرۆکە حەفتا ساڵییەکەی ئەم دەستەیە کە ناوی حەمە سوور بوو، مافی ئەوەی بە خۆی دا، کە شەوی یەکەم لەگەڵ کچانی لادێ ڕابوێرێ، ئینجا ژنەکە بۆ ماڵی شووەکەی بچێ.

ئاشکرایه کـه هەقـه زۆر له ڕێبـازی نـەقـشـبـەندییـەوه دووره، هەر لەبەرئەوەش بوو، فەتوای ئەوه دەرچوو که هەقه به تەواوەتی له نەقشبەندی جودایه.

**هەکاری.** میرنشینێکی گرینگی کورده. له مەڵبەندێکی شاخاوی بووه و بۆ پتر له ٥٠٠ سـاڵ، واته تا کاتی له ناوچوونی دوامیری میرنشینەکه له ناوەڕاستی سـەدەی ١٩، ئەم میـرنشینه دەسـەڵاتی هەبووه. له زۆربەی ئەو سـاڵانەدا، هەکاری مـەیدانی سنووری نێوان ئیمپراتۆرەکانی عوسمانی و ئێرانی بووه. له دوای ١٥٣٤، هەکاری به فەرمی سەر به ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووه.

له ڕۆژانی باڵادەستیدا، هەکاری هەرێمـی هەکاری و هـەرێمی ڤانی حوکم کردووه و جـاری ئاواش بووه کـه دەسـتی به باکـوری ئێـسـتـای عـێـراقـیش گـەیشـتـووه. فەرماندارەکانی هەکاری خۆیان وا هەڵخستووه که له بنەماڵەی خەلیفەکانی عەباسی بووینـه؛ بەڵام ئەگـەر زەین بدەینه ئەوەی کـه پارەی به ناوی خـۆیەوه داڕشـتـووه و له خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا ناوی میرەکانی هاتووه و نزای بۆ کراوه، بۆمان دەردەکەوێ که هەکاری دەوڵەتێکی سـەربەخۆ بووه. میـرەکانی له شـاری وان و جولەمێرگ (که ئێستا پێی یێژن هەکاری) دانیشتوونه.

هەکـاری مـێـژووییـــــەکی فـره دۆخی هـەبووه. تا شـەڕی یەکـەمی جـیـهـانی، کـەمـینـەیەکی زۆری نسـتـووری و ئـاشـووریی لێ ژیاوه. نیـوەی ئەو کـریسـتـیـانانه ڕەنجبەر بووینه و بندەستیی کوردانیان کردووه، بەڵام نیوەکەی دیکەیان ڕێکوپێک بووینه و بنەماڵه و هۆزیان هەبووه و شـەڕکەر بووینه. ئێستا دانیشتوانی هەکاری له هـەمـوو هەرێمـەکانی تورکیـا پەرتوبڵاوترن و لـه بواری ئابووریشدا هەرێمـێکی زۆر نەداره.

**هەڵەبجه.** شـارێکی کوردی عێراقی ستراتیژییه و ژمارەی دانیشتوانی ٧٠,٠٠٠ کـەسـه و له سنووری ئێـرانەوه نزیکه. له ئاداری ١٩٨٨، کـاتێک کـه شـەڕه هەشت سـاڵییەکەی نێوان ئێران و عێراق خـەریک بوو دەوەسـتـا، هێزه ئێرانی و هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستـان توانییان هەڵەبجه داگیر بکەن. له ١٦ی ئاداری ١٩٨٨، عێراق تۆڵەی کردەوه و گـەورەترین هێرشی چەکی کیمیایی له دوای شـەڕی یەکەمی جیـهانییەوه کرده سـەر هەڵەبجه. نزیکەی ٥,٠٠٠ کوردێک کوژران. ناوی

هەڵەبجە بووە هێمایەک بۆ قیزەوەنیی چەکی کیمیایی و ملهوڕیی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، چونکە نکووڵی لە یارمەتیدانی گەلی کورد کرد بۆ ئەوەی ئازارەکانی ببڕێنێتەوە. پاشتر، کە شەڕەکە کۆتایی هات، سەدام حوسێن شاڵاوە بەدناوەکەی ئەنفالی دەست پێ کرد. پێش ئەو کارەساتە، کورد هەڵەبجەیان بە کتێبخانەکانی دەناسی. لەم دوایانەدا، هەڵەبجە بە مەڵبەندێکی ئیسلامییە توندڕەوەکان دەناسرا.

**هەمزە عەبدوڵڵا (١٩١٥- ٢٠٠٠).** لەمیانی کۆنگرەی یەکەمی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦، کرا، هەمزە عەبدوڵڵا بە یەکەم سکرتێری گشتیی پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵبژێردرا. بەمجۆرە، لە دوای مەلا مستەفا بارزانی، دووەم کەسی بە دەسەڵات بوو بۆیە بە هەڵبژاردن بووە سەرۆکی «پ. د. ک» لەمیانی ئەو کارەی کە زۆری نەخایاند و چەند ئەملا و ئەولای تێداکرد و وا دەرکەوت کە زۆر لە حزبی شیوعیی عێراقی نزیک بێ، کە لە ناوەڕاستی ١٩٥٠کاندا، پارتێکی سیاسیی زۆر بە هێز بوو. لە ناو پارتەکەشدا، بەرهەڵستکاری ئیبراهیم ئەحمەدی دەکرد و لە ١٩٥٩ بارزانی بۆ دواجار خانەنشینی کرد. هەمزە عەبدوڵڵا تا کۆتاییی سەدەی ٢٠ـەمین ژیا، بەڵام هیچ ڕۆڵێکی سیاسی نەگێڕا.

**هەمەوەند.** تیرەیەکی بچووکی کوردە ئێستا لە ناوچەی چەمچەماڵ و بازیانی ڕۆژئاوای سلێمانیدا دەژین. تا ١٨٥٠، کە میرنشینی بابان لەناو چوو ئەم خێڵە پشتیوانی میرەکانی بابانیان کرد. چونکە هەمەوەند هەمیشە دژی عوسمانی و فارسەکان بووە، بۆیە هەردوو لایەن بە جەردەیی و ڕێگری ناویان بردووە.

لە ١٨٨٩دا، عوسمانییەکان هەمەوەندیان لە شوێنەکانی خۆیان ڕاگوێزا و نیوەیان ڕەوانی ئەدەنەکردن و نیوەکەی دیکەشیان بۆ تەرابولسی لیبیا نارد. دوای حەوت ساڵ ئەو نیوەیەی کە بۆ لیبیا نێردران، بە شەڕکردن هاتنەوە و خۆیان گەیاندەوە بازیان، ئینجا ناچار ڕێگەی هەموو هۆزەکە درا بۆ ئەوەی دووبارە یەک بگرێتەوە. لە ١٩٢٠ـەکاندا، هەمەوەند بە دڵسۆزییەوە پشتیوانیی شێخ مەحموود بەرزنجییان کرد.

**هەورامی.** سەیری "گۆرانی" بکە.

**هەولێر (ئەربیل، إربل).** گەورەترین شار و پایەتەختی دەوڵەتی دیفاکتۆی

کوردستانی باکوری عێراقە. لە ٣٣١ی پێش زاین، ئەسکەندەری گەورە، داریووشی مەلیکی فارسی لە شەڕێک لە دووری ٢٠ کیلۆمێتری باکوری ڕۆژئاوای هەولێر، بەزاند. لەوکاتدا ئەسکەندەری گەورە هەولێر بە شارێکی دێرین ناو دەبا.

ئەگەر لە چوارچێوەی وڵاتی عێراقدا، سەیری هەولێر بکەین، دەبینین ئەربیل شاری ڕۆشنبیران و زانایان و نووسەران بووە و لە هەموو شارێکی ئەو وڵاتە زۆرتر زانای لێ نیشتەجێ بووینە. ئیبن مستەوفی خاوەنی "مێژووی هەولێر» گەڤاهییەکی باشی ئەو ڕاستییە دەدا.

خەڵکی هەولێر هەر لە زووەوەڕا بە خانەخوێی دڵگەورە ناسراون و ڕێزی زۆر لە میوان دەگرن و نامۆیی لە غەریبان ناکەن.

هەولێر قەڵاتێکی دێرینی لە ناوەڕاستدا هەیە. تا ناوەڕاستی سەدەی ٢٠ـەمیش، هەولێر شارێکی هێندە گەورە نەبوو. لەسەر قەڵات سێ گەڕەک هەبوون؛ تۆپخانە و تەکیە و سەرا. لە دامێنی قەڵاتیش دوو گەڕەکی کۆن هەبوون؛ تەعجیل، گەڕەکی جوولەکان بوو. گەڕەکی عەرەبانیش لە نێوان تەعجیل، قەڵات بوو. ئەو گەڕەکە زۆری عەرەبی گامێشەوان بوون. قەیماخ و ماستی گامێشیان دەفرۆشت. قەیماخەکەیان زۆر بەتام و بەناوبانگ بووە.

مەلا فەندی (مەلا گچکە) زانایەکی ناوداری سەدەی ٢٠ـەمی ئەو شارە بووە. کاتێ کە ڕەشید عالی گەیلانی کودەتای دژی فەیسەڵی دووەمی مەلیکی عێراق کرد، مەلیک بەغدادی بەجێ هێشت و پەنای وەبەر مەلا فەندی برد و ئەویش داڵدەی فەیسەڵی دا و تا کاتی کودەتایەکە هەرەسی هێنا، مەلیکی لە کن خۆی شاردەوە.

لە شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (١٩٩٤ تا ١٩٩٨) هەولێر کرۆکی ململانێی نێوانی هەردوو لا بوو. لە ١٩٩٦ـەوەڕا «پ. د. ک» شارەکە بەڕێوە دەبا و بارەگای حکوومەتی هەرێمی کوردستانە. هەولێر دوو زانکۆی لێ یە؛ زانکۆی سەلاحەدین یەکەم زانکۆ بووە لە هەولێر دامەزرا و لە ٢٠٠٦یش زانکۆی پزیشکیی هەولێر، دامەزرا. هەولێر بە فەرمی ناوی "ئەربیل"ـە، ئەربیلیش ناوێکی کوردییە.

**هوشـیـار زێبـاری.** مـاوەیەکی درێژ ئەندامـی پۆلیـتـبـیـرۆی پارتی دیموکـراتی کوردسـتـان و گەورە ژێدەری کـاروباری دەرەوەی پارتەکە بووە. زێباری خزمـایەتی لەگەڵ سەرۆکی کوردستان و سەرۆکی «پ. د. ک» مەسعوود بارزانیدا هەیە. هوشیار زێباری ئینگلیزییەکی ڕەوان دەزانێ و کورد لە ناو خۆیان بە عەقلێکی دیپلۆماسیی کارامەی دەزانن.

لە دوای ڕووخانـی ڕژێمی سەدام حوسێن و لە ئەنجامی هەڵبژاردنە گشتییەکانی لە ٢٠٠٥، لە عـێـراقـدا کـران و پەرلەمـانـی عـێـراقی لێ پێک هات و ئەنجـوومـەنی وەزیرانی عـێـراقـیـشی لێ کـەوتەوە، پەرلەمـانتـارانی عێـراقی مـتـمـانەی خـۆیان بە هوشـیـار زێباری داو بـەو پێـیـە قـایلبـوون کە پۆسـتـی وەزیری دەرەوەی عێـراقی پێ بسـپێرن. هوشـیار زێباری لە پۆسـتەکەیدا شـارەزاییەکی زۆر و کـارامـەییەکی بێ ئەندازەی نیشـان داوە و توانـیویەتی ترازووی پێـوەندییەکانی عێراق لـەگەڵ هەمـوو وڵاتانی دەوروبەر و دووریش ژیرانە پارسەنگ بدا!

**هۆز.** سەیری (خێڵ) بکە.

**هیوا**. پارتێکی سیاسی نەتەوەیی بـوو. لە ١٩٤١، بەزۆری لەو ڕۆشنبـیـرانەی هۆزە کـوردییـەکان پێک هـات کـە بیـر و بۆچوونی جیـاوازیان هەبوو؛ هەندێک چەپ و هیـتر ڕاستبوون. بەمجۆرە هیوا هێمای گۆڕانی کۆمەڵایەتیی هەنگاو بەهەنگاوی پێوە دیار بوو، گۆڕانکارییەکە لە شێوە هەمیشەییەکەی ناسنامە خێڵەکییە شـاخاوییـەکەیدا هـاتە دی. ڕەفـیق حیلمی سـەرکردەی پارتەکە بـوو. خـاڵی لاوازی هیـوا ئەوە بـوو کە نە بنکەی جووتیـاریی هەبوو، نە توانیشی پشتـیوانیی شۆڕشـە مـەزنەکانی بارزانی لە سـەرەتا و نـاوەڕاسـتـی ١٩٤٠لـەکـان بکات. هەرچەنـدە هیـوا لـە ئاداری ١٩٤٥دا، یادداشـتنامـەیەکی پێشکێشی بـاڵیۆزی وڵاتە یەککگرتووەکان، لۆی هندرسن، کرد و ١٢مین خـاڵی ودرۆ ویلـسنی بەبیـر هێناوە کـە تایبـەت بوو بە مـافی چارەی خۆنووسینی کورد و لێی خـواست کە وڵاتە یەککگرتووەکان پشتـیوانیی ئۆتۆنۆمیی کـوردی بـکات، بەڵام پارتەکـە خـۆی لە کـۆتاییی هەمـان سـاڵدا لـە ناوچوو. لە ١٩٤٦، ئەندامانی هیـوا هـاوبەشییان لە دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد.

**هیومـەن ڕایتس ووچ (چاودێری مافەکانی مرۆڤ)**. پێشـان ناوەکەی هـڵسنکی ووچ

بوو. له ١٩٧٨ له شێوەی ڕێکخراوێکی ناحکوومەتی بەو مەبەستە دروست بوو کە لێکۆڵینەوەی ڕێکوپێک لەو پێشێلکردنانەی مافەکانی مرۆڤ بکا کە چ حکوومەتەکان یان چ گرووپە یاخییەکان لە هەموو جیهاندا ئەنجامی دەدەن. ئەم ڕێکخراوە بەرگری لە ئازادیی هزر و دەربڕین و پرۆسەی پێویست بۆ پاراستنی بەڵگەنامەکان و یەکسانیی یاسا دەکا و کوشتن و بزرکردن و ئەشکەنجەدان و زیندانی کردنی ڕەمەکی و بانشکردن و هەموو پێشێلکارییەکی ئەو مافانەی مرۆڤیش ماندەل و ڕیسوا دەکا کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا ناسراون.

بەم جۆرە، هیومەن ڕایتس ووچ ماوەیەکی دووردرێژە، ڕۆڵێکی گەلێک گرینگ لە بواری ناساندنی ئەو پێشێلکارییانەی مافەکانی مرۆڤدا دەگێڕێ کە دەرهەق بەمافەکانی کورد بەگشتی و کوردی تورکیا و عێراق بە تایبەتی، دەکرێن. هیومەن ڕایتس ووچ، هەوڵێکی تایبەتی دا بۆ ئەوەی ئەو هەموو تۆنە دۆکیومێنتە گیراوانەی ئەنفال وەربگێڕێ کە بە ڕاشکاوی ئەو جینۆسایدەی سەدام حوسێن نیشان دەدا کە لە دژی کورد کردی، بۆ ئەوەی بسەلمێنێ کە تاوانەکە بە گوێرەی بەندەکانی پەیماننامەی ڕێگەگرتن و سزادانی تاوانەکانی جینۆسایدی نەتەوە یەکگرتووەکانی ١٩٤٨، بە تاوانی جینۆساید دادەنرێن. پەیماننامەکە جینۆسایدی وا پێناسە کردووە کە؛ "نیازکردنە بەو مەبەستەی نەتەوەیەک یان ئیتنێک، یان ڕەگەزێک، یان گرووپێکی ئاینی نەهێڵێ، جا چ هەموو گەلەکە لە ناو ببردرێ یان هەر بەشێکی قەلاچۆ بکرێ." سەرچاوەیەکی تر کە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤی کوردی تۆمار کردووە، ئامنێستی ئینتەرناشنال و ئەو ڕاپۆرتەیە کە سالانە وەزارەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان دەربارەی مافەکانی مرۆڤ دەری دەکا.

**هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد.** کچی ئیبراهیم ئەحمەدی سیاسەتوان و نووسەر و هاوسەری جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەرۆکی کۆماری عێراقی فیدراڵە. هێرۆ، ڕۆڵێکی سیاسیی گرینگی لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا گێڕاوە و ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووە و لە شاخ وێنەی زۆری دۆکیومێنتی پەلامارەکانی پێشمەرگە بۆ سەر ڕەبییەکانی سوپای عێراقی، بە ڤیدیۆ گرتووە و گەلێکیش وێنەی نە هامەتییەکانیشی بە کامێرای خۆی تۆمار کردووە.

هێرۆ یەکێک لەو ژنانەی کورد بووە کە هەمیشە بەرگریی لە مافەکانی ژنان کردووە و ڕەنگە کاری لە خودی جەلال تاڵەبانی هاوسەریشی کردبێ بۆ ئەوەی ئەویش تا ڕادەیەکی باش بەرگری لە مافەکانی ژنان بکا. هێرۆ و جەلال تاڵەبانی، دوو کوڕیان هەیە، پاڤڵ مامۆستای پەروەردەی وەرزشییە و قوبادیش میکانیکی ئۆتۆمۆبیلی خوێندووە و لە ۲۰۰۷، لە واشنتن دیسی نوێنەری حکوومەتی هەرێمی کوردستان بووە.

**هێزی بەدر.** هێزێکی سەربازی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراقە؛ لە ٥,٠٠٠ تا ١٠,٠٠٠ کەسە. ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق گرووپێکی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بوو لە ١٩٨٢ لە ئێران پێک هات. هێزی بەدریش لە ١٩٨٣ دامەزرا. لە ١٩٩٥، هێزی بەدر لە نزیک سلێمانی باکوری عێراق بڵاوەیان پێ کرا. ئەمەش لە ئەنجامی ڕێککەوتنێکی نێوان ئێران و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پیادە کرا بۆ ئەوەی پارسەنگی ئەو لەیەکترگەیشتنە بکا کە لە نێوان تورکیا و پارتی دیموکراتی کوردستان هەبوو. ئەم کارە بەشێک بوو لەو شەڕە ناوەخۆییەی کە لە ١٩٩٤ تا ١٩٩٨ لە نێوان «پ. د. ک» و «ی. ن. ک» دا هەبوو.

کە لە شوباتی ۲۰۰۳، ئەگەری لێدانی عێراق لە لایەنی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە نزیک بووەوە، سوپای بەدر دیسان لە باکوری عێراق سەنگەرگیرکرانەوە. هەندێک ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق و سوپای بەدر بە دەسکردی ئێران دەزانن، بەڵام هیتر هەنە کە بە گرووپێکی شەرعیی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی دەناسن.

**هێزی ڕزگاریی کوردستان.** پارتی کرێکارانی کوردستان «پ. ک. ک» ئەو گرووپەی وەک پێشەنگێکی بەرەی ئەرتەشی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان لە ١٩٨٤دا، دامەزراند. ئەمە بەرەیەکی نەتەوەیی بوو، ئەرکی سەربازیشی هەبوو، پاشان سوپای ئازادیخوازی گەلی کوردستانی پێک هێنا؛ ئەمەیان لەشکرێکی پارتیزانی شارەزایە.

«پ. ک. ک» لە ١٥ی تەباخی ١٩٨٤ پێکهێنانی ئەرتەشی ڕزگاریی کوردستانی ڕاگەیاند و بۆ ئەم ڕاگەیاندنەشی دوو هێرشی هاوکاتی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، کردە سەر هەردوو گوندی "ئەرو" و "شەمدینلی" کە ٣٣٠ کیلۆمەتری زەویی پڕ لە شاخ و داخیان لە نێواندایە. تورکیا و «پ. ک. ک» ئەو ڕۆژە بە دەستپێکی

شۆڕشی چەکداری «پ. ک. ک» دەزانن.

دوران (عەباس) کالکان یەکەم سەرکردەی ئەرتەشی ڕزگاریی کوردستان بوو. پاشتر لەگەڵ عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرکردەی «پ. ک. ک» لە سەر پەیڕەوکردنی توندی و تیژی دژی گوندەکان، نێوانیان تێک چوو؛ چونکە کالکان لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو توندوتیژییە ڕێگەی لە هاتنی پتری لادێییەکان گرتووە و ناهێڵێ پێوەندی بە شۆڕشەوە بکەن. بەڵام لە کۆتاییدا ئۆجەلان و کالکان ئاشتبوونەوە. لە پاش دامەزراندنی ئەرتەشی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە ١٩٨٥، هێزی ڕزگاریی کوردستان لە ١٩٨٦، هەڵوەشاوە و پاشان هەر لە ١٩٨٦ سوپای ڕزگاریی کوردستان پێک هات. «پ. ک. ک» لەو کاتدا ڕای گەیاند کە پێوەندییە گشتییەکان و پشتیوانی لە ئاستی پێویستدا نەبوون. بۆیە ڕەنگە وا بخوێندرێتەوە کە دامەزراندن و لەناوبردنی هێزی ڕزگاریی کوردستان هەوڵێکی سەرەتایی بوو «پ. ک. ک» دای بۆ ئەوەی ڕێگەیەکی سەرکەوتووانە بۆ ستراتیژییەتێکی خەباتی درێژخایەن پیادە بکات.

**هێنری کیسنجەر (١٩٢٣–    )**. ڕاوێژکاری سیاسیی سەرۆکی ئەمەریکی، ڕیچەرد نێکسن بوو؛ دواتر لە ١٩٧٥دا، وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو کە پشتی لە مەلا مستەفا بارزانی و لە کورد کرد. ئەو پشتیوانییەی ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکان دەیان کرد، بۆ کوردی عێراق فرە گرینگ بوو، جا بۆیە هەرکە نەما سەدام حوسێن و حکوومەتی عێراق توانییان خێرا شۆڕشەکە دووچاری نسکۆ بکەن. بۆیە کورد وا هەست دەکەن کە کیسینجەر و وڵاتە یەکگرتووەکان بێ هۆ، خیانەتیان لەگەڵیاندا کرد. تا ئەمڕۆش کوردی عێراق و بە تایبەتیش مەسعوود بارزانی، هەست بە تاڵیی ئەو خیانەتە دەکا.

کیسینجەر کاتی خۆی پاکانەی بۆ خیانەتەکەی کرد و مشتومڕی ئەوەی کرد کە لە سەرەتادا ئەو پشتیوانییەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران لە کوردیان کرد، ڕێگەی بۆ خۆشکردن تا بتوانن هەندێ فرقەی سەربازی عێراق لەناو ببەن کە ئەگەر بمابان، لەمیانی شەڕی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا، هەڕەشەیان لە ئیسرائیل دەکرد. کە پشتگرتنی کوردان ئیتر سوودی نەما، کیسینجەر بە شێوەیەکی ئەنتیکە پاکانەی بۆ وەستانی پشتیوانییەکە کرد و جاڕی دا کە: "کردەوەیەکی نهێنی نابێ

لەگەڵ ڕاپەڕاندنی ئەرکدا تێکەڵوپێکەڵ بکرێن." چەند ساڵ پاشتر کیسینجەر بۆی ڕازاندەوە بۆچی نەدەکرا واشنتن چیتر پشتیوانیی کوردەکان لەناو ئەو "شاخانەی کە جێی ژیانی تێدا نییە" بدا و درێژەی پێ دا و نووسیی: "شا بڕیارەکەی دا." لەگەڵ ئەوەشدا کیسینجەر دانی بەوەدا نا کە: "ئەوەی لەگەڵ گەلی کورد کرا، کە بە درێژاییی مێژوو کراون بە قوربانی، مایەی دڵخۆشی نییە." سەیری "ڕاپۆرتی کۆمیتەی پایک" بکە.

**هێی، و.ڕ. (١٨٩٣-١٩٦٢).** ئەفسەری سیاسیی بەریتانی بوو، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لە هەولێر کاری کرد. کتێبەکەی بە ناوی (دوو ساڵ لە کوردستان ١٩٢١) توێژینەوەیەکی سوودبەخشە کە دەربارەی هۆزە کوردییەکان و نەریتەکانی ئەو سەردەم دەکۆڵێتەوە.

## و

**وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.** لەو چەرخەی ئێستادا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گرینگترین هێزی دەرەکییە کە خۆی لە کێشەی کورد ئاڵاندووە. ئەمەش هەر لەبەرئەوە نییە کە وڵاتە یەکگرتووەکان دەسەڵاتی سیاسیی هەرە گەورەی نێونەتەوەیی هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە چونکە تورکیا هاوپەیمانێکی گرینگی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی و هاوپەیمانی لە دژی عێراق بووە.

دەستێوەردانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کاروباری کوردستان، بۆ سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانی دەچێتەوە؛ کاتێک کە سەرۆک ودرۆ ویڵسن چواردە خاڵەکەی ڕاگەیاند و خاڵی ۱۲مینیان پەیمانی "ئۆتۆنۆمی" بە "ئەو نەتەوانە دەدا کە لەو کاتدا لە ژێر دەستی تورکە عوسمانییەکاندابوون." سەرکەوتنی کەمالییەکان لە وەرگرتنی دەسەڵات لە تورکیا و بڕیاری بەریتانیا بۆ ئەوەی ناوچە پڕ نەوتەکانی کوردستانی باشوور لە بندەستی خۆیدا بهێڵێتەوە، نەک هەر هەموو ئومێدێکی سەربەخۆیی، بەڵکو ئومێدی ئۆتۆنۆمیشی لە کورد کوشت. یەکەم قۆناغی بایەخدانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە کورد بەسەر چوو.

دوای پتر لە نیو سەدە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ جاری دووەم خۆی لە کێشەی کورد هەڵقوتاندەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان پشتی تورکیای گرت دژی کورد، چونکە لە پەیمانی ناتۆ، تورکیا هاوپەیمانێکی گرینگی بوو. بەمجۆرە ئەو کوردانەی کە پشتیوانی پارتی کرێکارانی کوردستانیان کرد، نەک هەر بوونە "کوردی خراپ"، بەڵکو بە پێی بۆچوونی فەرمی وڵاتە یکەگرتووەکان، بە تیرۆریست ناسران. لە شوباتی ۱۹۹۹، وڵاتە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی گرینگی گێڕا و یارمەتیی تورکیای دا تا عەبوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی «پ. ک. ک»ی دەستگیر کرد.

کەچی لە عێراق، وڵاتە یەکگرتووەکان، لە ۱۹۷۰کاندا، هانی شۆڕشی مەلا مستەفا بارزانی دا و بەمجۆرە کوردەکانی عێراق لە بەرچاوی وڵاتە یەکگرتووەکاندا، بوونە "کوردی باش". وڵاتە یەکگرتووکان لەبەر چەند هۆیەک ئەم ڕێگەیەیان گرتە بەر: بۆ

پاراستنی بەرژەوەندی ئێران، کە لەو کات هاوپەیمانی بوو و عێراقیش دوژمندارێتی دەکرد؛ بۆ پارسەنگی شەڕی سارد، چونکە هەینێ عێراق لایەنگری یەکێتیی سۆڤیەتی بوو؛ بۆ ئەوە بوو گوشار لەسەر ئیسرائیل کەم بکاتەوە و نەهێڵێ عێراق لە ئایندە بتوانێ هاریکاریی ولاتانی عەرەبی بکا و پەلاماری دەوڵەتی جوولەکە بدا؛ دوا هۆیەکەش ئەوە بوو کە ئەگەر کورد دەستیان بە سەر چاڵەکانی نەوتی نێو خاکی خۆیان داگرت، ئەوا هەناردەی نەوت لە ڕۆژهەلاتی ناڤین بۆ ولاتە یەکگرتووەکان مسۆگەر دەبێ.

جا بەپێی ئەم پلانە، سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکان، ریچەرد نیکسن، هاوڕا لەگەڵ ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، هینری کێسنجەر هانی کوردیان دا بۆ ئەوەی شۆڕشەکەیان دژی بەغداد نەوەستێنن. بەڵام پاشتر لەگەڵ ئێرانی هاوپەیمانیان، کوردیان خستە ژێر پێی خۆیان و حەمە ڕەزا شا بڕیاری دا ڕێککەوتنێک لەگەڵ سەدام حوسێنی مۆر بکات و هەر یارمەتییەکیش ڕابگرێ کە بۆ کورد دەهات. بۆ پاکانەکردن بۆ ئەم کردەوە قێزەوەنانەیان، هینری کێسنجەر پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئەوان بۆیە یارمەتی عێراقیان دا تا قایلی بکەن لە شەڕی ڕۆژهەلاتی ناڤین، لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٣، دژی ئیسرائیل، بەشداری نەکات. جێی گاڵتەجاڕییە کە خۆی جارێکی تریش پاکانەی بۆ ئەو کارەی هێناوە و نووسی: "نابێ کردەوەیەکی نهێنی لەگەڵ ڕاپەڕاندنی ئەرک تێکەڵوپێکەڵ بکرێن." چوار ساڵ پاشتر مەلا مستەفا بارزانی بەو کەسەرەوە، لە بانشگەدا، سەری نایەوەو خەمی گەورەی لە دوای خۆی هێشتەوە و هەر ئەوەش بووە وای لە سەرۆک مەسعوود بارزانی کردووە کە هەرگیز پڕ بەدڵ متمانە بە ولاتە یەکگرتووەکان نەکا. چەند ساڵ پاشتر هینری کێسنجەر هۆیەکەی ڕوون کردەوە و گوتی ئەگەر لە ١٩٧٥، کوردمان پارستبا، پێویست بوو بەرەیەکی نوێ لەو شاخە سەختانەی نزیک سنووری یەکێتیی سۆڤیەتی بکەینەوە. لەمەش بترازێ، شا خۆی بڕیارەکەی دابوو، ولاتە یەکگرتووەکانیش هیچ هۆیەکی ڕیالیستی بە دەستەوە نەبوو شای پێ پەشیمان بکاتەوە.

جاری سێیەم؛ سیاسەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان لە دەستپێکی شەڕی کەنداوی ١٩٩١، بە لای کورددا هاتەوە و ئەوبوو کە ولاتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی

بتوانێ سەدام حوسێن دەقاوغ بگرێ، دەبوو پشتیوانی کورد بکا. لە کۆتاییی شەڕی کەنداو، ولاتە یەکگرتووەکان لە کوردی عێراقی خواست لە دژی بەغداد ڕاپەڕن؛ بەلام کە دەرکەوت ڕاپەڕینەکە خەریک بوو هەرەسی دەهێنا، ولاتە یەکگرتووەکان بە هاواری کوردەوە نەهات؛ چونکە لەوە ترسا ڕەنگە ئەو کارەی وا بکا ولاتە یەکگرتووەکان بۆ ماوەیەکی درێژ ناچار بێ عێراق داگیر بکا و ئەم کارەش لە لایەکەوە لە ناوەوەی ولاتە یەکگرتووەکان پشتیوانی نەبوو؛ لە لایەک ئارامیی عێراقی دەشێواند و ڕەنگ بوو ئیتر ئاگرەکە هەموو ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناڤین بگرێتەوە. جگە لەمانە هەمووشیان، ڕەنگ بوو سەرکەوتنی کورد لە عێراق کوردەکانی بندەستی تورکیای هاوپەیمانی ولاتە یەکگرتووەکان لە پەیمانی ناتۆ ڕاست بکاتەوە.

بەلام کۆڕەوی کورد، ولاتە یەکگرتووەکانی ناچار کرد لەو بۆچوونانەی خۆی پاشگەز بێتەوە و دەست بە ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفۆرت بکا و ناوچەی نەفرینیش بۆ پاراستنی کورد لە باشووری کوردستان دابمەزرێنێ. پاشان کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا و سیاسەتی پەنجا بە پەنجا نشوستی هێنا و لە ١٩٩٤ تا ١٩٩٨ کورد دەستیان بە شەڕی خۆبەخۆیی کرد، واشنتن توانی ئاگربەستێکیان پێ مۆر بکا و ئاگربەستەکەش دەوامی بوو. لەو کاتەوەڕا تا دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام حوسێنیش ولاتە یەکگرتووەکان بەردەوام ڕۆلی خۆی لە پشتیوانیکردنی کورد بینیوە و لە کاتی دانانی دەستوور و ڕێکخستنەوەی بەڕێوەبەرایەتیی دوای سەدامیش ڕۆلێکی پۆزەتیڤی بۆ کورد لە باشووری کوردستان گێڕاوە.

**ولاتی فارس.** ناوی کۆنی ولاتی ئێرانی ئێستایە. ڕەزا شای پەهلەوی لە ١٩٣٥، ناوەکەی گۆڕی و ناوی ئێرانی لێ نا. ئێران واتای (خاکی ئاریان) دەبەخشێ. ولاتی فارس، ناوی هەرێمێکی باشووری ولاتە و لە ٥٥٠ی پ.ز. ئەخمینییەکان لەوێ ئیمپراتۆریەتی فارسی کۆروشی گەورەیان دامەزراند. فارسی زمانی فەرمیی ولاتی ئێرانە، بەلام زۆرینەی دانیشتوانی ئەو ولاتە بە ئازەری و کوردی و عەرەبی قسە دەکەن. لە لایەنی مێژووییەوە کورد و فارس پێوەندیی نزیکیان لەگەل یەکتریدا هەبووە و لە لایەنی ئیتنییەوەش کورد بە ڕەسەن لەگەل فارسەکاندا خزمن، بەلام هیچ پێوەندیی بایۆلۆژییان لەگەل تورک و عەرەباندا نییە.

له ١٥١٤، سەلیم یاڤوز (سەلیمە مۆن)ی ئیمپراتۆری عوسمانی، شا ئیسماعیلی سەفەویی لە شەڕی چالدێران، لە باکوری ڕۆژئاوای دەریای وان، لە کوردستانی باکور بەزاند. پاشتر کوردستان بووە سنووری نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت و تووشی نەهامەتییەکی زۆر بوو. جگە لەمە هەردوو ئیمپراتۆریەتەکە، سەرتاپای خێڵە کوردەکانیان لە شوێنەکانی خۆیان ڕاگوێزا. نەوەی ئەو هۆزە کوردە ڕاگوێزراوانە تا ئێستاش لە باشووری ئەنکارای پایەتەختی تورکیا و لە ئێرانیش لە دووریی ١,٠٠٠ کیلۆمەتر لە ناوچەی خۆراسان و هێشتا لە ڕۆژهەڵاتی دوورتر لە ناوچە شاخاوییەکانی هیندوکوژ لە ئەفغانستان دەژین. پەیمانی زەهاوی ١٦٣٩، بنەمای ئەو سنوورەی نێوان هەردوو دەوڵەتی دانا کە تا ئێستاش لە نێوان تورکیا و ئێران لە لایەک و لە نێوان عێراق و ئێران لە لایەکەی ترەوە هەر ماوە.

**ودرۆ ویلسن**. سەیری (چواردە خاڵەکان) بکە.

**ولیەم ئیگڵتن (١٩٢٦-    )**. کارمەندێکی پسپۆری کوردناسی بێ هاوتای وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکایە. زۆر لە کوردان بۆ ئەوە ڕێزی لێ دەنێن چونکە لە ١٩٦٣، کتێبێکی بەهاداری بە ناوی (کۆماری کوردی ١٩٤٦) دەربارەی کوماری کوردستان لە مەهاباد بە ئینگلیزی نووسیوەتەوە. جگە لەمە توێژینەوەیەکیشی دەربارەی قاڵی (مافوور)ی کوردەواری کردووە.

له ١٩٥١ دەستی بەکار کردووە و بووەتە کارمەندێکی کاروباری بیانیی وڵاتە یەککگرتووەکان و لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەستی بە کارەکەی خۆی کردووە. لە ١٩٥٩-١٩٦١، لە تەورێزی ئێران، کۆمیساری وڵاتە یەککگرتووەکان بووە و پاشان پۆستی سەرۆکی بەشی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەککگرتووەکانی لە بەغداد لە ١٩٨٠-١٩٨٤، وەرگرتووە. لە ١٩٨٤، لە سووریا باڵیۆزی وڵاتە یەککگرتووەکان بووە.

**وێژە Literature**. هەرچەندە وێژەی کوردی بەر لە ئیسلام تۆمارێکی نییە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەو ئەدەبە بە هۆی بەردەوامیی ململانێ لە کوردستان لە ناو چووە و ڕەنگە هێشتا دەشێ ناوی چەند بەرهەمێکی گرینگ و چەند نووسەرێکی باڵا بێنین. وەک دەزانین، لە قۆناغی یەکەمدا، ژمارەیەکی زۆر نووسەری کورد بەرهەمەکانیان بە عەرەبی یان بە فارسی یان بە تورکی نووسیوەتەوە و ئێستاش زۆر

له نووسه‌رانی کورد به زمانه ڕۆژئاواییه‌کان ده‌نووسنه‌وه. به‌کارهێنانی ئه‌م زمانانه بنه‌ماکانی ڕه‌وشی ئه‌ده‌بی کوردیی لێڵ کردووه. جگه له‌مه زۆر له سه‌رده‌مه زووه‌کانی نووسینی کوردی ئاشکرا نه‌بووه و فره به‌کارهێنانی خامناو nom de plume ـه‌کانیش کێشه‌که‌ی هێشتا ئاڵۆزتر کردووه.

له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی ١٠یه‌مدا باباتاهیری هه‌مه‌دانی به کوردی شیعری نووسیوه و له سه‌ده‌ی ١٣مین، مێژوونووس و سه‌ربرده‌کار biographerی کوردی ئیبن ئه‌سیر، به عه‌ره‌بی به‌رهه‌مه‌کانی خۆی نووسیونه‌ته‌وه. شاعیری ناوداری کورد مه‌لای جزیری له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی ١٥دا چریکاندوویه‌تی و جاڕی داوه که خۆی گوڵی جه‌نناتی عه‌دنی بۆتان و چرای ڕێ پێشانده‌ری سوارچاکانی کوردستان بووه. له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی ١٦شدا، ئیدریس به‌تلیسی کتێبی "هه‌شت به‌هه‌شت"ی به فارسی نووسیوه‌ته‌وه. "هه‌شت به‌هه‌شت"، مێژووی سوڵتانه عوسمانییه‌کان تۆمار ده‌کا. شه‌ره‌فخانی به‌تلیسیش «شه‌ره‌فنامه»ی به فارسی نووسیوه‌ته‌وه. شه‌ره‌فنامه مێژووی بنه‌ماڵه کورده‌کانی تا کۆتایی سه‌ده‌ی ١٦، تۆمار ده‌کا. له سه‌ده‌ی چوارده‌مینیش مێژوونووس و جیۆگرافیاناس ئه‌بولفیدا له سه‌ده‌ی ١٦مینیش، شاعیری گه‌وره فزوولی (١٥٥٦) به تورکی شیعری داڕشتووه و عه‌لی حه‌ریری؛ مه‌لا ئه‌حمه‌دی باله‌کی؛ میر محه‌مه‌د موکسی؛ که خامناوی فه‌قێی ته‌یرانه، هۆزانیان گوتووه.

له سه‌رده‌می حوکمی میرانی ئه‌رده‌لانیش، چه‌ند هۆزانڤان هۆنراوه‌ی نایابیان به شێوه‌زاری گۆرانی داڕشتووه. له‌مانه له سه‌ده‌ی ١٥دا؛ مه‌لا په‌رێشان؛ له سه‌ده‌ی ١٩م، مه‌لا عه‌بدولڕه‌حیمی مه‌وله‌وی؛ مه‌لا ئه‌حمه‌د ته‌خته‌یی مه‌لا مسته‌فا بێسارانی و خانای قوبادی و مه‌حزوونیش ده‌گرێته‌وه.

له سه‌ده‌ی ١٧میش، ئه‌حمه‌دی خانی بۆ یه‌که‌م جار بابه‌تی سه‌ربه‌خۆیی کوردی له ناو لاوکی مه‌م و زیندا وروژاندووه و له سه‌ده‌ی ١٨میش شه‌ریف خانی جوله‌مێرگی، که له نه‌وه‌ی میره‌کانی هه‌کاری بووه، له‌گه‌ڵ موراد خانی بایه‌زیدی، چریکه‌ی کوردیان هۆنیوه‌ته‌وه.

هه‌ردوو سه‌ده‌ی ١٩ و ٢٠ جموجۆڵێکی زۆریان پێوه دیار بووه؛ چه‌نده‌ها نووسه‌ر ئه‌سپی خۆیان له مه‌یدانی وێژه‌ی کوردیدا لینگ داوه که ناکرێ هه‌موویان له‌م

فەرهەنگەدا باس بکەین. بەلام لە هەر هەمووان ناودارترو کاریگەرتریان، حاجی قادری کۆیی و ڕۆژنامەوانی فرە گەورەی کورد، حاجی تەوفیق پیرەمێرد و زانای بێ هاوتای کوردی کوردستانی ڕۆژئاوا محەمەد فەرید کورد عەلی و شاعیری کوردپەروەر شێخ مووس "جگەرخوێن"و فایەق بێکەس و عبدوڵلا محەمەد زیوەر و لە میسریش ئەحمەد شەوقی (میری شاعیران)و مەحموود تەیموور و محەمەد تەیموور و عەباس مەحموود عەقاد و سوهەیر قەلەماوی و گەلێکی تریش هەبوون.

گرووپێک کوردی بانشگە، لە ١٨٩٨، ڕۆژنامەی "کوردستان"یان لە قاهیرەی پایەتەختی میسر بلاو کردەوە و ڕێچکۆڵەی گەشەکردنی ئەدەبی کوردیی نوێ و هزری هاوچەرخی کوردایەتی لەوێوەڕا هەڵی کرد.

سەرداری قۆشمەچییانی کورد، شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥– ١٩٠٩) تا ئێستاش توانج و جنێوەکانی لە چەندین لاوە بایەخی پێ دەدری و لە کۆڕ و کۆبوونەوەی برادەراندا دەخوێندرێنەوە و هەوادارانی خۆی هەر هەیە.

لە سەدەی ٢٠ـەمیش، عەبدوڵلا گۆران بازێکی بە شیعری کوردی هەڵدا و پێش ئازادبوونی گەلەکەی هۆزانی کوردیی لە کێش و قافیەی شیعری عەرەبی ئازاد کرد.

تەوفیق وەهبی بۆ یەکەم جار ئەلفوبێی لاتینیی لە نووسینی کوردیدا بەکارهێنا. ئێستا کوردی بە سێ جۆرە ئەلفوبێی جودا دەنووسرێتەوە؛ لە ئێران و عێراق و سووریا بە ئەلفوبێی عەرەبی و لە تورکیادا بە ئەلفوبێی لاتینی و لە ولاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشووش، بە ئەلفوبێی سیریلی دەنووسرێتەوە.

هەرچەندە ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، هەمیشە کۆسپ و تەگەرە لە بەردەم پێشەوەچوونی وێژەی کوردی دروست دەکەن، بەلام هێشتا وێژەوانانی کورد لەو ململانێیەدا سەرکەوتوو بووینە و توانیتیان ئەدەبێکی ڕەسەنی کوردی وەبەرهەم بێنن و گەشەشی پێ بکەن.

لە ڕۆژانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد؛ شاعیرانی وەک هەژار و هێمن پەیدابوون. لە نووسەرانیش حەسەنی قزلجی ناسرا.

ئیبراهیم ئەحمەد لە ١٩٧٢ "ژانی گەل" و لە ١٩٩٢ش "دڕک و گوڵ"ی بلاو کردەوە.

ئەم دوو چیرۆکە کێشەی مافەکانی ئافرەت و پەروەردە و کێشەکانی خێزان و گەندەڵیی کۆمەڵایەتی تێکەوڵێکە دەکەن.

لە تورکیا مووسا عەنتەر و محەمەد ئەمین بۆزئەرسەلان چەند گۆڤاریێکیان بەهەردوو زمانی تورکی و کوردی بڵاوکردەوە.

ئێستاش لە تاراوگەدا، ئەدەبێکی باڵای کوردی پەیدایە. سوێد ساڵانە بوودجەیەکی چاک بۆ گەشەپێکردنی ئەم وێژەیە تەرخان دەکا. دانەری کوردی محەمەد باکسی یەکەم بیانی بوو لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی یەکێتیی نووسەراندا، پلەی ئەندامێتی وەرگرت و لە دوای ئەویش محەمەد ئۆزوون بوو.

لە ١٩٨٣، پەیمانگەی کوردی لە پاریس دامەزرا، ئەرکی ئەم ئامۆژگاریە پاراستن و نوێکردنەوەی زمانی کوردییە.

"جۆیس بلەو" پرۆفیسۆری زمان و ئەدەب و شارستانی کوردییە لە پەیمانگەی نیشتمانیی زمان و شارستانییەکانی ڕۆژهەلات لە پاریس دەرس دەڵێتەوە. پرۆفیسۆر جۆیس بلەو زانیاریی زۆری لەمەڕ وێژەی کوردی داوە بە ڕۆژئاوا.

لە ولاتە یەکگرتووەکانیش، مایکڵ چایت چیرۆکی مەم و زینی وەرگێڕاوە و وانەی زمانی کوردیش لە پەیمانگەی کوردی واشنتن دەڵێتەوە.

ڤێرا سەعیدپوور پشتیوانی لەو گەشەکردنەی زمانی کوردی کرد و کتێبخانە کوردییە تایبەتییەکەی خۆی لە بروکلین، لە نیویۆرک خستە بەردەستی خوێنەرانی. میهرداد ئیزدی و ئەمیری حەسەنپووریش لەگەڵ چینە کەسێکی تر لەو مەیدانەدا دەستپێشخەرییان کردووە.

## ی

**یاسای نائاسایی "ئۆهال"**. لەوەتی کۆماری تورکیا لە ١٩٢٣دا دروست بووە، هەرێمە کوردییەکانی باشووری ڕۆژهەلات، هەمیشە بە چەندین سیستەمی جیاواز حوکم کراون. سەردەمێک بەیاسای مارشاڵ (حوکمی عورفی) فەرمان دراون، یان لە ژێر گەمارۆدابوون و لە ١٩٨٧یشەوەڕا باری نائاسایی هاوکات لەگەڵ شارەداری بالادەست بەڕێوە دەچێ. لەمەش پتر، هەرێمەکە تا ١٩٥٠، لە بندەستی پشکنەری گشتیی ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەلاتدا بوو.

یاسای ئیمێرجنسی کە ئێستا ئیشی پێ دەکرێ، لە هاوینی ١٩٨٧ لە لایەنی سەرۆک تورگوت ئۆزاڵەوە سەپا، ئەویش پاش ئەوەی کە یاسای مارشاڵ لە چوار دوا هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیادا، هەڵگیرا. یاسای مارشاڵ لە کاتی بەرپابوونی کوشتوکوشتارە مەزهەبگەرییەکەی درەنگی دیسێمبەری ١٩٧٨ی، قارەمان مەرەشی باشووری ڕۆژهەلات، سەپا. کەچی یاسای باری نائاسایی (ئیمێرجنسی) لە دوای بەرپابوونی شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستان بەکار خرا. خەیری قۆزاقجی ئۆغلو بە یەکەم سەرۆکی بالادەستی فرە دەسەلاتدار دامەزرا. بارەگایەکەی لە دیاربەکر بوو. لە سەرەتادا ٨ ویلایەت و پاشان بوونە ١١ ئەوانەی لە بندەسەلاتی ئەو کابرایە داندران. چونکە لەو ویلایەتانەدا پتر مەترسیی هێرشی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ئارادا بوو. قۆزاقجی ئۆغلو پێشتر پۆستی پارێزگاری دیاربەکری وەرگرتبوو. پێشتریش کارمەندێکی میللی ئیستخبارات تەسهیلاتی (میت)، بوو.

دەسەلاتە هەرە گرینگەکانی قۆزاقجی ئۆغلو، سەرکردایەتیکردنی هێزە تایبەتی و هێزەکانی ئاسایشی گشتی بوو؛ مەرسوومێکی تایبەتیشی بۆ دەرچووبوو، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی (میت)یش لە بەردەستی خۆیدا بێ؛ دەسەلاتی گواستنەوەی کارمەندانی گشتی و مووچە بەرزکردنەوەیانی هەبوو؛ دەسەلاتی چۆڵکردن و تێکەڵکردنی گوند و پاوانەکانی هەبوو؛ مافی سەرپەرشتیکردنی بەڕێوەچوونی هەر دادگایەکی مەدەنی

هەبوو ئەگەر دژی هێزەکانی ئاسایش بەڕێوە بچووبا؛ دەسەڵاتیشی بەسەر پارێزگارەکانی ناوچەکاندا دەشکا. یاسای ئیمێرجنسی، لە ناوەکەی بترازێ، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ یاسای مارشاڵ نەبوو. ساڵ لە دوای ساڵ، لەسەر ژمارەیەک لە هەرێمەکاندا هەڵدەگیرا، تا لە دیسێمبەری ۲۰۰۲، بە یەکجارەکی هەڵگیرا و نەما.

بەر لە ڕێکخستنی سیستەمی پاسەوانانی گوندی لە هاوینی ۱۹۸٥، یاسای ئیمێرجنسی هەر کاری پێ دەکرا. لەمێژبوو ڕێکخراوەکانی مافەکانی مرۆڤ، ئەو یاسایەیان ڕیسوا دەکرد و بەنموونەیەکی فەرمیی دەوڵەتییان لە قەڵەم دەدا، دەیانگوت بۆ سەرکوتکردنی هاوولاتییان پەیڕەو دەکرێ. لە پەنای پاسەوانانی گوند و یاسای باری نائاسایی تاکتیکی (زەویی سووتاو scorched- earth) یان پیادە کرد. ئەو تاکتیکە ۳,۰۰۰ گوندی خاپوور کرد و نزیکەی ۱,۰۰۰ کەسیشی، لەوانەی هەستیان پێ دەکرا کە دوژمنی دەوڵەتبوون، لە دەرەوەی دەسەڵاتی یاسادا، کوشت. هەرچەندە ئەنکارا بە توندی دژی مسۆگەرکردنی هەر جۆرە ئۆتۆنۆمییەک بوو بۆ هەرێمەکە، بەڵام یاسای ئیمێرجنسی و هەموو ئەو یاسا جیاوازانەی کە لە دوای ئەو یاسایە پەیڕەو کران، بە ڕاشکاوی دان بەو تاکتیکەدا دەنێن کە ئەستەمە بلوێ سیستەمی دەوڵەتێکی ناوەندیی توند تا هەتایە، بپارێزرێ.

لە دەستپێکی ۲۰۰۲، گۆخان ئایدینار پارێزگاری هەردوو هەرێمی دیاربەکر و شرناخی تورکی بوو کە بەپێی "ئۆهاڵ" و یاسای ئیمێرجنسی حوکم دەکران. لە دیسێمبەری ۲۰۰۲، لە ئەنجامی بەزینی پ. ک. ک. و لە چوارچێوەی ئەو چاکسازییەی تورکیا دەستی پێ کرد بۆ ئەوەی بتوانێ بچێتە ناو یەکێتیی ئەورووپاوە، بە فەرمی کۆتاییی بە یاسای نائاسایی هێنا.

**یاسای دژە تیرۆر (تورکیا).** یاسای دژە تیرۆر لە ۱۹۹۱دا کەوتە کار؛ هەموو ئەو ئەکادیمی و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسانەی کە بە ئاشتییانەش دەنگیان هەڵدەبڕن و پشتیوانی لە مافەکانی کورد یان هەر کێشەیەکی تر لە تورکیا دەکەن؛ بە پێی بەندی ۸ ی یاسای دژە تیرۆر بە تێوەگلان لە کاری تیرۆریستی تاوانبار و زیندان دەکرێن. هەرچەندە ئەم بەندی هەشتەمە چەند جارێک هەموار کراوە، بەڵام هێشتا ئەو کەسانەی کە پشتیوانیی مافەکانی کورد و دیموکراسی دەکەن، بێ پسانەوە

مافەکانی مرۆڤیان لێ پێشێل دەکرێ.

**یاقۆبییەکان.** سەیری (ئاشوورییەکان) بکە.

**یەڵماز گونای (١٩٣٧– ١٩٨٤).** فیلمسازێک بوو لە ئاستی جیهانیدا ناسراو بوو. کارەکانی لە ١٩٨٠کاندا، لە تورکیا یاساغبوون؛ چونکە بەشێکیانی کێشەی کوردیان تاووتوێ دەکرد. یەڵماز گونای کوردێکی خەڵکی تورکیا بوو، لە ١٩٧٤ بە تاوانی کوشتنی دادوەرێک گومانبار کرا و ناچار بوو وڵاتەکەی بەجێبێڵێ. لە بانشگە لە پاریس، مەرگئامێز بوو.

**یەزدانییەکان.** (ڕێبازی فریشتان) بە کوردی یەزدانییان پێ دەگوترێ. لە چەندین ئاینی نا ئیسلامیی نەتەوەیی کۆنی کوردی پێک هاتووە. لەوانە عەلەوی و هەقە و ئێزیدیش دەگرێتەوە. ئەم ئاینانە بە زەقی چەندین بڕگەی یەکترگری شامانی و زەردەشتی و ئاینی جوولەکە و دیان و ئیسلامەتی لە خۆ دەگرن.

داهێنان فرە جار لە شێوەی هێلکەیەکی ڕەنگکراو ڕاڤە دەکرێ و گۆیا ڕوحی هەموو گەردوون ڕۆژێک لەڕۆژان لە ناو ئەو هێلکەیەدا ژیاوە. ئەوانەی لەسەر ئەم دینەن، باوەڕیان وایە کە حەوت مەخلوقی پرشنگداری فریشتەیی، ئاسمانی گەردوون لە حەوت هێزی تاریکی وێرانکەر دەپارێزن. ئەو چینە باوەڕیان بە کۆچکردنی ڕۆح هەیە و دەڵێن لە ئەنجامی دووبارەبوونەوەی خواوەندایەتی، ڕۆح لە گەورەوە بۆ بچووک دێ و جەستەی دەگرێتەوە. باوەڕیشیان وایە کە چاکە و خراپە هەر یەکە و گرینگیی تایبەتی خۆی بۆ داهێنان و نەپسانەوەی جیهانی مەتیریاڵ هەیە.

هەرچەندە ژمارەی پەیڕەوکارانی ئەم ئاینە لە کەمبوونەوەدایە، بەڵام هەندێک لەو باوەڕەدانە ٣٠ لە سەدی کورد هێشتا هەر بنەماکانی ئەم ئایینە پەیڕەو دەکەن. بێگومان ئەم ڕێژەیە گەلێک قەبە کراوە، چونکە زۆربەی کورد ئێستا پەیڕەوی ڕێبازی ئیسلامی سوننی دەکەن. ئەندامانی ئەم ڕێبازە ئێستا پەیڕەوی ڕێنوێنییە ڕادیکاڵییەکانی شیعە دەکەن و هەوڵ دەدەن خەڵکی لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا یەکسان بژین. ئەو هەوڵانەی ئەم گرووپە دەیدەن بۆ ئەوەی خۆیان فێری

شیعایەتی بکەن بۆ ئەوەی ناسنامەی شیعە وەربگرن و "تەقییە" پەیڕەو بکەن وای کردووە کە چاودێران فریو بدەن. سەیری (غوللات) بکە.

**یەشار کەمال (١٩٢٣-    )**. کوردە و لە گەورەترین ڕۆماننووسەکانی تورکیایە. ناودارترین ڕۆمانی بەناوی «حەمەدۆک»ـە. ئەم ڕۆمانە باسی کابرایەکی ڕێگر دەکا کە، لە شێوەی ڕۆبن هود، لە شاخەکانی تووروس ڕێگری دەکا. یەشار کەمال پتر لە ٣٥ کتێبی دیکەی نووسیوە و کتێبەکانی بۆ پتر لە ٣٠ زمان وەرگێڕدراون و چەندین پاداشتی بەهاداری وەرگرتووە.

لە ١٩٩٥، یەشار کەمال بەپێچەوانەی سیاسەتی دەسەڵاتدارانی تورک جووڵاوە و ڕەخنەی توندی لەو سیاسەتە گرت کە تورکیا بەرانبەر بە گەلەکەی پەیڕەوی دەکرد. بۆیە بەپێی بەندی ٨ یاسای دژە تیرۆر دادگایی کرا. چونکە یەشار کەمال لە سەرتاسەری دنیا ناسراوە، تورکەکان بەناچاری حوکمەکەیان هەڵپەسارد. بەڵام یەشار کەمال ناچار بوو وڵاتەکەی جێ بێلی و ئێستا لە سوێد پەناهەندەیە.

**یەکێتیی ئەورووپا (EU)**. ڕێکخراوێکی ناحکوومەتیی ئەورووپییە، کاریگەری لەسەر کێشەی کورد هەیە، کاریگەرییەکەشی لە تورکیا تایبەتە. ئەم کاریگەرییەش لەوەوە فرە بووە، چونکە تورکیا لەمێژە مرازی چوونە ناو یەکێتییەکەی هەیە؛ ئەو ئامانجە ئەتاتورک خۆی دای نا و ویستی تورکیا بگاتە ئاستی شارستانیی هاوچەرخ. ئەم ئاستە شارستانییە هاوچەرخە، لەم سەردەمەدا، ئەوە دەگەیەنێ کە لە یەکێتیی ئەورووپادا پلەی ئەندامێتی وەربگرێ. بۆ ئەوەی تورکیا مەرجەکانی بوونە ئەندامی ئەو ڕێکخراوەی هەبێ، لەسەری پێویستە کێشەی کورد بە شێوەیەکی دیموکراتی چارەسەر بکا.

لەم ساڵانەی دواییدا دادگای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ، زۆر بڕیاری دژی تورکیا (کە لایەنێکی دادگایەکەیە) دەرکردووە بۆ ئەوەی قەرەبووی هەموو ئەو کوردانە بکاتەوە کە کارمەندەکانی تورک تاوانیان دژیان کردووە، جا ئێستا هاووڵاتی تورکیا بن (یان پێش کوشتنیان هاووڵاتی تورکیا بوون بن). هەروەها تورکیا لە نۆڤێمبەری ١٩٩٩، دوای ئەوەی دادگای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ چەند ڕێنوێنییەکی کاتیی دەرکرد و داوای لە تورکیا کرد بڕیاری لە سێدارەدانی ئۆجەلان

هەڵواسێ، تا دادگایەکە بتوانێ بەداخوازی تێهەڵچوونەوەکەی ئۆجەلاندا بچێتەوە؛ تورکیا سزای لە سێدارەدانی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی هەڵواسی. ستراتیژی پارتی کرێکارانی کوردستان لە دوای گرتنی ئۆجەلان، بەزۆری پشت بە کاندیدکردنی تورکیا بۆ یەکێتیی ئەورووپا دەبەستێ تا کێشەی کورد لە تورکیا لەو ڕێگەیەوە چارەسەر بکرێ.

**یەکێتیی سۆڤیەت**. تەزارە ڕووسییەکان بەرژەوەندییان لە کوردستاندا هەبوو، بۆیە ناوە ناوە کاریگەرییان لە کوردستان کردووە. لە سالانی شەڕی سارد، زۆر لە ڕۆژئاوا گومانی ئەوەیان هەبوو کە کورد ڕێیان بۆ سۆڤییەتەکان خۆش دەکرد تا لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا جێی خۆیان بکەنەوە. بەڵام ئەگەر سەیرێکی سیاسەتی ئەو سەردەم بکەین دەزانین کە سۆڤیەتییەکان دەیانزانی پشتیوانی ئەو حکوومەتە هەرێمییانە بکەن کە کوردستانیان داگیر کردبوو بۆ ئەوان سوودی پتری هەبووە لەوەی کە پشتیوانیی لە کورد بکەن. بێگومان لە زلهێزەکانی دنیا بەریتانیا لە هەمووان پتر کاری لە مێژووی چارەنووسی کورد کردووە. لەم سەدەی ٢١ـەشدا، وڵاتە یەکگرتووەکان ڕۆڵی سەرەکی لەم بابەتەدا دەگێڕێ.

لە سەرەتای دامەزرانیدا، یەکێتیی سۆڤیەت پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ تورکیای کەمالیدا مۆر کرد. پەیمانەکە سوودێکی زۆری بۆ هەردوو دەوڵەتە تازەکە هەبوو، پاشانیش یارمەتیی زۆری تورکیای دا، تا بەهەموو توانای خۆیەوە هاووڵاتییە کوردەکانی سەرکوت بکا. ناوە ناوەش یەکێتیی سۆڤیەت یارمەتیی زۆری عێراق و سووریای داوە بۆ ئەوەی بەهەموو توانای خۆیان هاووڵاتییە کوردەکانیان سەرکوت بکەن و ئازاریان پێ بگەیەنن.

لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێتیی سۆڤیەت تاکە هێزی دەرەکی بوو کە لە ١٩٤٦، پشتیوانیی کۆماری کوردستانی کرد و لە ١٩٤٧ـەوەڕا تا ١٩٥٨ میوانداریی مەلا مستەفا بارزانی کرد. لە ڕاستی لە دوای چوونی مەلا مستەفا بارزانی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت، نەیارانی کورد ناتۆرەی "مەلای سوور"یان لێ نا، کەچی خەباتی مەلا مستەفا بارزانی دەریخست کە ئەم ناتۆرەیە هێندە لە ڕاستییەوە دوور بوو کە تەنیا شایشتەی گاڵتەپێکردن بوو. لە ١٩٢٠ـەکانیش یەکێتیی سۆڤیەت کوردستانی

سووری له لاچین دامەزراند، بەڵام له کۆتاییی ۱۹۲۰ توێندرایەوە.

له ۱۹۳۰یەکـان و ۱۹٤۰ـەکـاندا، جـۆزیف سـتـالین ژمـارەیەکی زۆری کـوردی ل
ماڵەکانیان ڕاگوێزان و ڕەوانی بانشگەی ناوەڕاستی ئاسیای کردن. هەندێک دەڵێر
ئێستا ۱ ملیۆن کورد له کۆمارەکانی پێشووی یەکێتیی سۆڤیەتدا دەژین و لەگەڵ
کـۆمـەڵگەی ئەو وڵاتانەدا تێکەڵ بووینە و تواونەتەوە. لەگـەڵ ئـەوەشـدا کـە زۆربەی
شـارەزایان ژمـارەکـە لەمـە کـەمـتـر دەخـەمـڵـێنن، بەڵام بەمـسـۆگـەری ژمـارەیان ل
۲۰۰,۰۰۰ کەس کەمتر نییە ئەو کوردانەی لەو وڵاتەنەدا دەژین.

شێـوەی ڕێکخـسـتـنی حـزبی شـیـوعی، کاری لـه پارتی کرێکارانی کوردسـتـان
یەکێـتیی نیـشـتـمـانیی کـوردسـتـان و تەنانـەت له پارتی دیموکـراتی کوردسـتـانیش
کردووە و دەبێنین ئەمـەشیان وەک پارتی کۆمـۆنیست، زاراوەی پۆلیتبیرۆ و کۆمیتەی
ناوەندی بەکار دێنێ. هەرچەندە پ. ک. ک. و ی. ن. ک. له سـەرەتادا خۆیان وەک دو
پارتـی مـارکـسـی ناسـاند، بەڵام له دروشـم و زاراوەکـانیـان بتـرازێ، هـیچ جـۆر
پێوەندییەکی ڕاستەقینەیان بەڕێبازەکەوە نەبووە. سەیری (ڕووسیا) بکە.

**یەکێتیی نیشتمانی کوردستان (ی. ن. ک.)** له دوای پیلانەکەی له ۱۹۷٥ له جەزایر
دژی کورد کرا و شۆڕشی ئەیلوولی تووشی نسکۆ کرد، پارتی دیموکراتی کوردستان
کە مـەلا مستـەفـا بارزانی سـەرۆکـایەتیی دەکرد، بـەش بەش بوو. له ۱ی حـوزەیرانی
۱۹۷٥، جـەلال تاڵەبانی له دیمەشـقی شـام دامـەزراندنـی یەکـێـتـیی نیـشـتـمـانیی
کـوردسـتـانی ڕاگـەیاند کـە لەو دەم له دوو گـرووپی سـەرەکی پێکهاتـبـوو؛ کـۆمـەڵە
ڕێکخـراوێکی مارکسی بوو، نەوشیروان مستـەفا ئەمین سـەرۆکایەتیی دەکرد و هیچ
پێوەندییـەکی بەڕێکخراوی کۆمـەڵەی ئێرانەوە نەبوو. گـرووپەکەی دیکەش بزووتنەوەی
سۆشیالیستی کوردستان بوو کە عەلی عەسکەری سەرۆکایەتیی دەکرد.

تاڵەبـانی خـۆی یـەک لەو کـەسـانە بوو کـە دەمـێک لەگـەڵ بارزانیـدا بوو و دەمـێکی
تریش لێی جودا دەبووە. جـەلال تاڵەبانی هـاوڕێ لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەدی خەزووری
له ۱۹٦٤، سـەرکردایەتیی مەکتـەبی سیاسیی پارتیـیان کرد و دژی مـەلا مسـتـەفای
بارزانی وەسـتـان. بۆیە ئەگـەر تەمـاشـایەکی وردی یەکێـتیی نیشـتمـانی کوردسـتـان
بکەین دەبینین جـیـاوازییەکی ئەوتۆی لەگـەڵ ئەو پۆلیـتـبـیـورۆییە نییـە کـە له دژی

سەرکردایەتیی بارزانی یاخیبوون. ی. ن. ک. بانگەیشتەی ئەوە بۆ خۆی دەکا کە ڕێکخراوێکی پێشکەوتنخوازی سۆشیالیستە و پڕۆپاگەندە دژی بەرنامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکاو بەپارتێکی خێڵەکیی کۆنەپەرست ناوی دەبا. لە ۱۹۷۷، تاڵەبانی گەڕاوە کوردستانی باشوور و لە ڕۆژئاوای سەردەشت لە نزیکی سنووری ئێران، بنکەی سەرکردایەتیی خۆی دامەزراند. لەو کاتەوە پ. د. ک. و ی. ن. ک. دوو پارتی سیاسیی زۆر گرینگ لە گۆڕەپانی خەباتی کوردایەتی لە کوردستانی باشوور پێک دێن و لە دوای ۱۹۹۲شەوە، هەر سەرکەوتنێک یان نسکۆیەک دووچاری ئەوان ببێ، ڕاستەوخۆ کار لە چارەنووسی گەلی کورد و حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش دەکا.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە کۆنگرەی ئاسایی خۆی لە ۱۹۹۲، ناسنامەی خۆی وەک بزووتنەوەیەکی سۆشیال دیموکرات سەپاند. تا ۲۰۰۷یش تاڵەبانی سکرتێریی گشتیی ی. ن. ک. بوو کە کەس نەیتوانیوە مل دەبەر ملی بنێ و بەفەرمی پۆستی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی هەیە. ی. ن. ک. مەکتەبێکی سیاسی و کۆمیتەی سەرکردایەتیی هەیە کە لە ۳۲ ئەندام پێکهاتووە. جگە لەمە لە هەر شارێکی گەورەشدا مەڵبەندێکی هەیە. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ۱۹۹٤ تا ۱۹۹۸ شەڕێکی ناوخۆی دژواری لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا کرد. تا ۲۰۰٦، حکوومەتی سلێمانیی بەڕێوە دەبرد، پاشان لەگەڵ پ. د. ک. حکوومەتێکی هاوبەشیان پێک هێناوە.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، چەند دەستەیەکی ڕاگەیاندنی تایبەتی خۆی هەیە، لەوانە؛ کورد سات کە وێستگەیەکی تەلەڤزیۆنی پەخشی سەتەلایتە و لە هەموو دنیادا دەبیندرێ، بەڵام لە ئەمریکا وەک کوردستان تیڤیی پارتی دیموکراتی کوردستان باش وەرناگیرێ. جگە لەمە چەند وێستگەیەکی تەلەڤزیۆنیی بچووکی لە شارەکانیشدا هەیە. ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان بەکوردی و بەعەرەبی بەرنامەکانی ڕۆژانەی خۆی پەخش دەکا و لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەورووپاش وەردەگیرێ. بڵاوکراوەکانی تری ئەمانەن؛ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، بەکوردی چاپ دەبێ و ڕۆژنامەی "ئەلئیتیحاد" بەزمانی عەرەبی لە بەغدا چاپ دەبی و

ڕۆژنامەی "چاودێر"یش ڕۆژانە بەکوردی و بەعەرەبی چاپ و بڵاو دەبێتەوە و چاودێریی میدیاکانی جیهان دەکا و ئەو بابەتانەی کە پێوەندییان بەکورد و بەعێراقەوە هەیە چاپ و بڵاویان دەکاتەوە. ی. ن. ک. ماڵپەڕێکی ئینتەرنێتیشی هەیە کە ئەمە ئەدرێسەکەیەتی: www. puk. org. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئێستا مەکتەبی پێوەندیی لە واشنتن و لەندەن و پاریس و بەرلین و مۆسکۆ و ڕۆما و ستۆکهۆڵم و برۆکسڵ (بارەگای یەکێتیی ئەوروپا) و تاران و ئەنقەرە و دیمەشق و قاهیرەشدا هەیە.

بەپێی پرۆگرامی ناوخۆی، ی. ن. ک. هەوڵ دەدا مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراسیی یەکگرتووی فیدراڵیدا مسۆگەر بکا. دەشیەوێ کێشەی کورد بەشێوەیەک چارەسەر ببێ کە لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و داننان بەناسنامەی نەتەوەیی و کولتووریدا بگونجێ. هەروەها لە پرۆگرامی ناوخۆییدا هاتووە کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەیەوێ کۆمەڵگەیەکی مەدەنی و دەستوورێکی دیموکراسی دابمەزرێنێ. پشتیوانیی هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەوخۆ و ئازادیی قسەکردن و میدیا دەکا و هەموو مافەکانی تری مرۆڤ وەک مافی یەکسانیی ڕەگەزیش دەپارێزێ. بەرنامەی ی. ن. ک. بەشێوەیەکی تایبەت جاڕ دەدا کە "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە پێناوی پیادەکردنی جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ خەبات دەکا". باسی ئەوەش دەکا کە دەیەوێ بازاڕی ئازاد و سیاسەتی حکوومەت یەک بکا بۆ ئەوەی باری ئابووری و گوزەرانی خەڵکی چاک ببێ.

تا ٢٠٠٣، لەو ناوچانەی کە حکوومەتی سلێمانی بەڕێوەی دەبرد، پتر لە ٣٠ ڕۆژنامە و حەفتەنامە و گۆڤار و هەشت وێستگەی پەخشی تەلەڤزیۆنی و ژمارەیەکی زۆری ڕادیۆی سەر بەچەندین پارت و گرووپی سیاسی کار دەکەن و بەرنامەکانیان پەخش دەکەن ی. ن. ک. جۆرە هاوپەیمانیەتییەکیشی لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و پارتی سۆشیال دیموکراتی کوردستان و پارتی پارێزگارانی کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامی و چەندین کەسایەتیی سەربەخۆدا هەیە.

**یوسف زیا بەگ (؟–١٩٢٥)** گەورە سەرکردەیەکی ئازادی بوو. ئازادی پارتێکی

کوردیی قاچاغ بووە لە ١٩٢٣دا دامەزراوە و لە ١٩٢٥، پاڵپشتیی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیرانی کردووە. یوسف زیا بەگ لە نەوەی میرەکانی بتلیس بووە و دەسەڵاتێکی پڕی لەو ناوچەیەدا هەبووە و لە یەکەمین هەڵبژاردنە گشتییەکانی لە دوای دامەزراندنی تورکیادا کراوە، یوسف زیا بەگ بەئەندام پەرلەمانی تورکی هەڵبژاردراوە.

لەمیانی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران، یوسف زیا بەگ، ویستوویەتی پێوەندی بەبەرهەڵستکارانی تورکیای کەمالییەوە بکا، بەڵام لە کۆششەکەی سەرنەکەوتووە. پاشان هاوڕێ لەگەڵ سەرکردەیەکی دیکەی ئازادی، بەناوی خالید بەگی سەرۆکی هۆزی جبران، وێکڕا بەند کراون و پاشانیش لە ژووری بەندیخانەکەیان هەردووک لە سێدارە دراون.